


وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

- کتێب :گەردەلوولی سیاسەت
- نووسەر: فۆاد سدیق
- زنجیرەی کتێب: (٢٢٥)
- چاپ: یەکەم (٢٠٠٦)
- پیت چنین و نەخشەسازی ناوەرۆک: جلیل محمد
- نەخشەسازی بەرگ: مریوان سلیم
- سەرپەرشتی چاپ: سعد شکاک
- لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٨١)ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ
- چاپ : بەڕێوەبەرایەتیی چاپخانەی رۆشنبیری/ هەولێر
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- نرخ: ٤٠٠ دینار

ئەم کتێبەی لەبەر دەستتدایە، هەر بەراستی گەردەلوولە و، پێشمەرگە لەناویدا بەچنگەڕنێ خەباتی کردووە بەهۆی ئەم کتێبەوە، دەتوانی تا رادەیەک سەردەمە تاڵ و شیرینەکانی قۆناغی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستانی دەستنیشان بکەیت، دەزانم ئەگەرچی هەندێک لەو رووداوانە ئازارێکی شیرین و مقاوەمەت و گیانفیدایی ئەم کوردە دەردەبڕن، بەڵام بەداخێکی برژاوەوە زۆر رووداوی تاڵیش هەن، کە ئەمڕۆ پێویستە هەموویان وەکو خۆیان بخوێنینەوە.

راستە زۆر کۆنە برین دەخاتەوە بەرچاوی خوێنەران، بەڵام کاتی ئەوەش هاتووە بەدڵێکی گەرم و بە مێشکێکی ساردەوە، هەموو ئەو رووداو و بەسەرهاتانە بخوێنینەوەو پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرین.

ناکرێ ئەزموونی خەباتی میللەتەکەمان نەزانین و بەبێ شارەزایی بوونیشمان لەو قۆناغە گرنگەی بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیمان، ناتوانین لە مقاوەمەت و هاوکات دووبەرەکی ئەم قۆناغە بەتایبەتی و دووبەرەکی کورد بە گشتی شارەزابین، بێگومان بەبێ ئەو شارەزایی بوونەشمان و دەرس وەرگرتنمان ناتوانین بەزانایی بەرنامەی میللیانەو کوردانە بۆ ئەمڕۆ و سبەی بخەینەکار، دە کەواتە خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەدەست خۆت مەدە، هەر هیچ نەبێ، تا شارەزای زۆر کێشمە کێشمی ئەم گەلە ستەمدەیدەی خۆت بیت و جارێکی دیکە ئەزموونی تاڵ نەچێژین.

## کەریم ئەحمەد:

## خەڵەلی گەورە ئەوەبوو (حشع) ڕێکخراوی کوردستانی نەکردە (حشک) کە ئێمە لە کۆنەوە داوامان دەکرد



کەس نییە لە کوردستانی باشووردا کەریم ئەحمەد نەناسێت، بەڵام ناسینەکە زۆر سادەو ساکارانەیە، کەریم ئەحمەد هەر ئەوە نییە ماوەیەکی زۆر لە سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراق و دواتر لە حزبی شیوعی کوردستان-ی عێراق بووە، بەڵکو کەریم ئەحمەد سەرەڕای ئەوەی تێکۆشەرو شۆڕشگێڕێکی راستگۆی خەباتی سەخت بووە، هاوکات یەکێک بووە لەو سەرکردانەی کە هەمیشە هەق و رەق بووە، ئەوەی لەسەر دڵی بووە لەسەر زاریشی بووە، کەسێکی لەروو بووەو هەمیشە ئەوەی ویستوویەتی بیڵێ، وتوویەتی، زۆر گوێی بەوە نەداوە ئەنجامەکەی چی دەبێت.

دوای مێژووی زیاتر لە (٦٠) ساڵ تێکۆشانی سەخت و بێ پسانەوەی کەریم ئەحمەد، دەتوانین بڵێین یەکێک بووە کە خەباتی بۆ میللەت کردووەو رۆژێک لە رۆژان ئەو خەباتەی بۆ بچووکترین بەرژەوەندی تایبەتی خۆی ئیستیغلال نەکردووە، هەر بۆیە ئێستاش دوای ئەو هەموو رەنج و جەربەزەییەی پێیدا تێپەڕبووە، کەریم ئەحمەد جگە لە سامانی خەباتە پاکەکەی، هیچ شتێکی دیکەی نییە، نەماڵ نەسامان نەهیچ شتێک، تەنها مێژوویەکی پڕ لە سەروەری. وەک خۆی زۆرجاری دیکەیش باسی کردووە، نموونەی وەکو کەریم ئەحمەد لەناو سەرکردایەتی (حشع)دا زۆر دەگمەن بووە، بەڵکو تاکە سەرکردەیەک بووە، کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە داکۆکی کردن لە مافی نەتەوایەتی کورد بخاتە ناو بەرنامەی سیاسی (حشع)ەوە، بەڵام

هەمیشە هەوڵەکانی لە بەرامبەر کۆسمۆپۆلیتە کوردەکان و بەرامبەر عەقڵیەتی باڵادەستی عەرەبی لەناو (حشعدا) نەیانتوانیوە جێگەی خۆیان بگرن، بەڵام کەریم ئەحمەد کۆڵی نەداوەو ئێستاش وەک خۆی دەڵێت هەر کــــۆڵ نادات، هەر لەبەر ئەوەش بـووە، بەردەوام لەناو (حشعدا) سەرکۆنەکراوە، رەخنەی توندی لێ گیراوە، تەنانەت هەندێ لە سەرکردە عەرەبە شیوعیەکان خراپ سەیریان کردووە!! بۆیە دەتوانین بڵێین ئەگەر کەریم ئەحمەد لەناو (حشعدا) نەبوایە رەنگە پرسی رەنگرێژکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دواتر مافی بڕیاردانی چارەنوسی گەلی کوردستان لە بەرنامەی حشع زۆر دوابکەوتایە.

بەپێویستمان زانی، کەریم ئەحمەد لە هەندێ بواردا بدوێنین، بۆیە کە سەردانیمانکرد، کەریم ئەحمەد لە بارەگای (م.س) حشک دا بوو، لەوێ لە ژوورێکی زۆر زۆر سادە دانیشتبوو، کورسی و مێزەکەی هەر زۆر سادەتر، بەهیچ شێوەیەک لە هی کەسێک نەدەچوو کە زیاتر لە نیو سەدە لە سەرکردایەتی حشع و حشک دا بوو بێت، ژوورەکەی بەم چلەی هاوینە نەک هەر سپلێتێکی لێ نەبوو، بگرە فێنک کەرەوەیەکی زۆر خراپی لێ بوو کە ئاوی تێدا نەمابوو، داوای چایەو ئاوی کرد بۆمان، بەڵام دوای یەک کاتژمێر ئینجا چامان بۆ هات!! بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کە دڵی کەریم ئەحمەد دەکەیتەوە، بەئایندەی کوردستان زۆر گەشبینە، دڵێکی زۆر گەورەی هەیەو ئێستاش خۆی بەسەربازێکی ونی رێگای کارو خەباتی نەتەوایەتی و کوردایەتی و

**هەژاران دەزانێت، فەرموو با هەموومان پێکەوە بزانین کەریم ئەحمەد چۆن دەدوێ.**

**بەر لەوەی بێیتە ناوحزبی شیوعی، لەسەردەمی گەنجێتیتدا، ئینتمات بۆ هیچ حزبێکی دیکە نەبوو؟**

- من ئینتمام بۆ هیچ حزبێکی دیکە نەبوو، لە سەرەتاوە تەنها هەستم بە داکۆکیکردن لە عێراق دەکرد. من قوتابی بووم، لەناو قوتابیاندا سێ گروپ هەبوو، یەکەمیان گروپی نەتەوەیی عەرەب بوو، دووەمیان گروپی نەتەوەیی کوردی بوو، سێیەمیان گروپی عێراق بوو عێراقچییەتیی... گروپی یەکەم سەر بە فاشیەکان بوو، سەر بە هیتلەریزم بوو، گروپی نەتەوەیی کوردی سەر بە ئینگلیز بوو، دوو شتی دژ بەیەک بوو، گروپی عێراقی سەربەخۆ، بەرگری لە کێشەی عێراق بە کوردو عەرەبەوە دەکرد، ڕێکخستنی نەبوو، بەڵام گروپی نەتەوەیی عەرەب و گروپی نەتەوەیی کوردی، ڕێکخستنی سیاسیان هەبوو.. لە سەرەتاوە هەستم دەکرد لەناو گروپەکەی ئێمە پشتگیری لە کێشەی کورد دەکرا.

**ئەو پشتگیرییە بەپێی پێویست بوو، یان هەر شتێکی رووکەش بوو؟**

- نا، گفتوگۆمان دەکرد، بۆ نموونە ئەوانەی تەواو عێراقچی بوون، دەیانگوت هەموو عێراقییەکان یەکسانن و هیچ جیاوازیان نییە، من وەڵامم دەدانەوە، دەمگوت؛ راست ناکەن، یەکسان نین، ئەوە عەرەب

دەوڵەتی هەیەو هەموو شتێ بەکاردێنێ، کورد هیچی نییە، ئەوە کوا یەکسانین؟! هەندێک لەوان پشتگیرییان دەکردم، بەڵام هەندێک نە،، دەموبست بزانم ئەوانەی پشتگیریم دەکەن، کێنەو بۆچی پشتگیریم دەکەن، لەوان زیاتر نزیکتردەبوومەوە لەوانی دیکە، نەشم دەزانی ڕێکخستن هەیە، یان نا، بەڵام کە شتم لە بابەت شۆڕشی بارزان و لە بابەت کوردستان تەرح دەکرد، ئەوان پشتگیرییان دەکردم، بەڵام هەندێکی دیکە دەیانگوت ئەوە تەفریقەیە.

**واتە ئەو گروپە لە سەرەتاوە رووحێکی شۆڤێنیان تێدا هەبووە؟**

- نا، شۆڤێنی نەبوون، عێراقی بوون.

**بۆچی هەوڵت نەدا، گروپە کوردییەکە بەراستە ڕێدا بیەی و لە دەستی دەرەوەی دووربخەیەوە؟**

- بە دەست من، نەبوو، چونکە ڕێکخستنیان هەبوو.

**نەتدەتوانی لەناو ڕێکخستنەکە رۆڵێک ببینی؟**

- نا، بڕوام پێیان نەبوو، دژی هیتلەری بووم، دژی ئینگلیزیش بووم، عەرەبەکان دەیانگوت ئینگلیز دەربکەن، ئەڵمانیا بێن، من پێم دەمگوت ئێوە سەگێک بە سەگێکی دیکە دەگۆڕنەوە.

**دەتزانی بەرپرسی گرووپە کوردییەکە کێیە؟**

- دەمزانی، ئەوانە زۆر ئیعتیدائیشان لەسەر دەکردم.

**ئەوانە کێ بوون؟**

- بۆ نموونە قوتابییەکانی لەگەڵ خۆمان، هاوڕێ قادر بەکر بوو،

ئەحمەد غەفور بوو، ئەوانە لە گروپی نەتەوەیی کوردی سەر بە ئینگلیز بوون، کە تابعی حزبی هیوا بوون. راستە حزبی هیوا رۆڵێکی نەتەوەیی گێڕا، هەموویان نیشتمان پەروەرو نەتەوە پەروەربوون، بەرگرییان لە نەتەوەی خۆیان دەکرد، من هەموو جارێ پێشمدەگوتن کاکە کێ کوردستانی بە عێراقەوە لکاند؟ ئێ غێر ئینگلیز بەسەریدا سەپاندین، ئێوە چۆن دەبنە لایەنگری ئینگلیز؟ گفتوگۆی زۆرمان دەکرد، بەڵام دیاربوو ئینگلیز بەڵێنی دابوو پاش شەڕی جیهانی دووەم، حکومەت بۆ کوردستان دادەمەزرێنێ، ئەوە بوو گەنجەکانی ناردبوو بۆ سوپای بەریتانی، یەک لەوانە هاورێ دڵزار بوو، شاعیری گەورە هاورێ گۆران لە ئێستگەی ئەوان ئیشی دەکرد، ئێ ئەوانە هەموو نیشتمانپەروەربوون، لەبەر ئەوە من نەچوومە ناو هیچ حزبێک، بەڵام گروپە عێراقیەکە، ئەو گروپەی بەرگری لە کێشەی کورد دەکرد کە زانیم شیوعین زۆر لێیان نزیک بوومەوە.

**ئینتمات لە بۆ حزبی شیوعی، لەبەر زاڵبوونی هەستی چینایەتیت بوو، یان هەستی نەتەوەیی؟**

- هەردووکیان، بەڵام چینایەتیەکەم زیاتر بوو، چونکە لە خێزانێکی جووتیاربووم، ئێمە لەبەر ئاغا هیچ کاتێک دوو سێ ساڵمان لە گوندێک رانەدەبوارد، باوکیشم ئەوکاتە خەلیفە بوو، سوغرەیان پێ نەدەکرد، ئەویش دەچووە هەر جێیەک لەگەڵ ئاغا رێکدەکەوت کە سوغرە نەکات، ئیتر هەر ماوەیەک لە گوندێک

بووین، له باقرتەو کەسنەزان بووین، دوایی چووینە کاریتان، ئینجا گردەڕەشە، دوایی هاتینە گرد مەلا، ئینجا هاتینە مورتکە، بەو شێوە ئێمە لە شوێنێک سەقامگیر نەبووین، چونکە ئاغا زوڵمی زۆری لێدەکردین.

**پێتوانییە هەموو ئەوانەی لەناو حزبی شیوعی کۆبوونەوە، لە سەرەتاوە لەبەر چەوساندنەوە چینایەتییەکە بووە، لەبەر ئەوەش گلەیی لەو حزبە دەکرێ کە بایەخی بە هەستی نەتەوەیی و چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەییەکان کەمبووە، زیاتر کێشە چینایەتییەکانی لەلا گرنگ بووەو لە پشت راپەڕینی کرێکاران بووە، نموونەش زۆرن راپەڕینەکانی گاورباخی لە کەرکوک و هێڵی ئاسن و... دەیانی دیکە، ئایا هەست ناکەی ئەو حزبە دەوری نەبووە لە مانگرتنێک، یان خۆپیشاندانێک لەسەر کێشەی نەتەوەیی؟**

- بەراستی ئەو کات حزب زۆر بایەخی بە مەسەلەی چینایەتی و تێکۆشانی چینایەتی دەدا، لە هەمانکات مەسەلەی سەربەخۆیی نیشتمانی عێراقی و بەرگریکردن لەو سەربەخۆییە هەموو شتێک بوو، کە تێیدا مافی چارەنووسی کورد جێبەجێ بکرێ.

**بەڵام نەدەکرا ئەوە بە ئاشکرا باس بکەن کە مافی چارەی خۆ نووسین بوو؟!**

- باسمان دەکرد، بۆ نموونە بەیاننامەی حزبی شیوعی دەربارەی شۆڕشی بارزان لە ساڵی ١٩٤٣ دەرچوو کە تەئکیدی لەسەر

داخوازییەکانی ئەو شۆڕشە کردەوە، شۆڕشەکە بەشێوەی نەتەوەیی نەبوو، داخوازییەکانی بۆ ناوچەیەکی دیاریکراوبوو، بەڵام داوای ئیدارەیەکی لامەرکەزی کوردستانی دەکرد، حزب پشتگیری ئەو مەسەلەیەی دەکرد، من خۆم ئەو بەیانەم بڵاوکردەوە، گەیشتە پەرلەمانی عێراقیش لەو کاتدا.

**ڕەنگە لە ماوەی ١٠- ١٥ ساڵ شتێکی واکرابێ، بەڵام ئەگەر گرنگی بەلایەنی نەتەوەیی بدرێ، دەبێ لە پرۆگرامی سیاسیت دا هەبێ...**

- بایەخی سەرەکی لەوەدابوو، ئەگەر دیموکراتیەت لە عێراق نەچەسپێ و عێراق نەبێتە وڵاتێکی سەربەخۆ، کێشەی کورد چارەسەر ناکرێ. نەدیموکراتیەت هەبوو، نەسەربەخۆیش هەبوو، بۆیە حشع بایەخی بەسەربەخۆیی نیشتمانی عێراق دەدا، هەروەها بایەخی بە مەسەلەی دیموکراسیەتیش دەدا کە مەسەلەیەکە بەستراوەتەوە بە پرسی چارەسەرکردنی کێشەی کورد.

**دوای زیاتر لە ٦٠ ساڵ لە خەبات و تێکۆشانت لەناو حزبی شیوعیدا چۆن ئەو چەمکانە دەخوێنیتەوە، ئومەمیەت، پرۆلیتاریا... کە خەڵکانێک لەپێناویدا ماندووبوون و کێشەیان بۆ دروستبوو،هەست ناکەی پاش ئەو هەموو خەباتە، ئەو دروشمانە مایەپووچ مانەوە؟**

- مایەپووچ نییە، بەڵام جێگیر نەبووە، چونکە چارەسەرکردنی

مەسەلەی نیشتمانی مەسەلەیەکی سەرەکییە لە مارکسیزم و لینینیزم دا، پێش و پاش شەڕی جیهانی یەکەمیش، هەموو جیهان لە نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارەکان دابەشکرا، کە نەتەوەکانیان دەچەوساندەوە، لەبەرئەوە پرسی سەربەخۆیی نیشتمانی بووە قەزیەیەکی ئەساسی لە مارکسیەت.

**حزبی شیوعی عێراقی لەسەردەمی زوودا کە تۆ تێیدا گەنج بووی، حزبێکی شۆڕشگێڕبوو، حزبێک بوو تەحەدای حکومەت و دەستەڵاتی دەکرد، هەر بیویستبا بە هەزاران خەڵکی دەهێنایە سەر شەقام، هەست ناکەی حزبی شیوعی کوردستان کە درێژبووەوەی ئەوە، ناتوانێ ئەو رۆڵە ببینێ، بۆ ئەمەش رای جیاواز هەیە، هەیە دەڵێ حزبەکە زۆر بچووک بۆ تەوەو هیچ قودرەتی نەماوە، وەکو مەسەلە کوردییەکە دەڵێ پڵنگ بوو، دوایی بوو بە پشیلە، یا دەستی بە کلاوی خۆی گرتووە بانەیبا، یاخود دەڵێن ئێستا رۆشنبیرو نوسەری لەگەڵ نەماون، لە کاتێکدا جاران ئەو توێژەی زۆربوون، ئایا هەست ناکەی ئەوە خەلەلێکی گەورەیە لەناو حزب دروستبووە؟**

- خۆت دەزانی مەسەلەی پەرەسەندنی بارودۆخی سیاسی، چینایەتی، کۆمەلایەتی لە دنیا، بە وەتیرەیەکی ناوی سەربەخۆ (تەساعودی موستەقل) ناروا، حەلەزۆنییە، شکستی هەیە، سەرکەوتنیشی هەیە.

**بەلام حەلەزۆنەکە دەبێت رووەو سەرەوە بێت، نەک بۆ خوارەوە؟**

- دەبێ بچێتە سەرەوە، بەلام حەلەزۆینە، ئیتر ئەو پەرەسەندنە

بەسەر هەموو جیهاندا هاتووە، کاتی خۆی لە کوردستان پارتی و شیوعی هەبوو، یەکێتی هەر نەبوو، ئەوسا پارتی هێشتا نەهاتبووە دەسەڵات، حزبی شیوعی لە پارتی بەهێزتربوو.

**- رەنگە ئەمە لە رووی رێکخستن وابووبێ، نەک لە رووی جەماوەرییەوە؟**

- با، لە رووی جەماوەریشیەوە، لە ساڵی ١٩٤٨ ئەندامێکی عەرەب بۆ ئەنجومەنی نوێنەران پالێورا، لەگەڵ مەحمود فەقێ هەمەوەندی، لە بیرمە ٤٣ دەنگدەری سانەوی دەنگیان لەبۆ ئەوانەدا، دوو دەنگدەر دەنگیان لە بۆ پارتیدا، ئەوە لە سلێمانی وابوو کە مەرکەزێکی نەتەوەییە، بمانەوێ و نەمانەوێ لە بنچینەدا وایە، هەولێر وانییە، ناوی نەتەوایەتی (عەونی) هێنایە هەولێرو دەستی بە دامەزراندنی قەزیەیەکی نیشتمانی نەتەوەیی کرد، لەبەرئەوە دەڵێم حزبی شیوعی ئەو دەورەی هەبووە.

**من مەبەستم ئێستایە؟**

- ئێستا جیاوازە، ئێستا پارتی و یەکێتی دەستەڵاتدارن، ئەوانە بەرگری لە کێشەی نەتەوەیی دەکەن.

**کەواتە خەڵەلەکە لێرەدایە حزبی شیوعی ئەو دیفاعەی نەکرد؟**

- نا، بەلاّم خەلەلی گەورە ئەوە بوو حزبی شیوعی عێراق رێکخراوی کوردستانی نەکردە حزبی شیوعی کوردستان، کە ئێمە لە کۆنەوە داوای ئەوەمان دەکرد، چونکە کورد مافی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی هەیە، کورد دەوڵەت و کیانی بۆ دادەمەزرێ، لەبەرئەوە دەبێ لە

ئێستاوە ئەو حزبە دامەزرێ، بەڵام ئێمە زۆر لێی دواکەوتین. لەلایەکی دیکەوە خۆ حزبی شیوعی بەشداری شۆڕشی کوردی کرد، ئەوکات هەر پارتی و شیوعی هەبوون، یەکێتی نەبوو، ئەوان لە ١٩٦٤ لە پارتی جیابوونەوە، بەڵام چووە لایەکی دیکە، کە دژی شۆڕشی ئەیلول بوو ئێمە بەشداری شۆڕشمانکرد، بەڵام ڕۆڵی سەرەکی پارتی و بارزانی گێڕایان.

**ئێوەش لە شاخ بوونەو دژی ڕژێمی بەعس بوونە، بۆچی نەتانتوانی دەوری سەرکردایەتی ببینن؟**

– ئاخر، دەوری پارتی و بارزانی هەیە، ئێمە لەو چوارچێوەیەدا هاوپەیمانیشیمان کردووە، چۆن ئێمە ئەو هاوپەیمانێتیە بەزێنین، چونکە شۆڕشی کورد لە ئەیلول، بوو بە شۆڕشی ڕاستەقینەی نەتەوەیی کورد لەبەر ئەوەی پشتی بە ڕێکخراو بەست، بارزانی لە کۆنەوە هەوڵیدەدا بزانێ، ئایا عەشیرەتگەری، یان ئایینی، یان ڕێکخراوی سیاسی کورد کۆدەکاتەوە، کە ئەفسەرە ئازادیخوازەکان پەیوەندییان بەوکرد، کە حزبی هیوا لە مەسەلەی نەتەوەیی دەوری گێڕا، بۆی دەرکەوت کە ڕێکخراوێکی سیاسی کوردی کۆدەکاتەوە، نەک عەشایەری، چونکە وەختێک پشتی بە ئاغاو عەشیرەتەکان دەبەست، بەڵام کە شۆڕشەکەی دەستپێکرد، ئەوان خیانەتیان لێکردو بەجێیان هێشت، بۆیە باوەڕی پێ نەمان، هاتە سەر ڕێکخراوی سیاسی، ئەوسا حزبی هیوا هەبوو، دوایی ئەو حزبە خۆی هەڵوەشاندەوەو پارتی دروستبوو، پارتی بووە بەشێک لە تێکۆشانی بارزانی بۆ کۆکردنەوەی

میللەتی کورد، ئیتر شۆڕشی نەتەوەیی سەرتاسەری کورد لەوساوە دەستی پێکرد، لە پێشدا هەموو شۆڕشەکان ناوچەیی بوون، لەولا عەشیرەتێک هەڵدەستا، لەولاتر ئاغایەک هەڵدەستا، هیچیان گشتگیر نەبوون.

**وەک خۆت ئاماژەت پێدا سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراق زۆربەیان کوردبوون؛ بە سکرتێری حزبیشەوە، ئایا ئەو کوردانەش لە عەرەبەکان کۆسمۆپۆلیتی تر نەبوون؟ یان هەوڵیان نەدەدا حزبی شیوعی لەگەڵ پێشهاتەکان بگونجێنن و وابکەن دوانەکەوێ؟**

- خۆت دەزانی حزبی شیوعی حزبێکی نەتەوەیی نییە، حزبێکە چینایەتییەکەی لەگەڵ نەتەوەیی تێکەڵ بووە، نەتەوەیی بەشێکە لە چینایەتی ئەوە بۆچوونیەتی، حزبێکی عێراقیە، نەحزبێکی کوردییە، نە حزبێکی عەرەبییە، حزبی هەموو لایەکە، بەو شێوە حزب تەعامول لەگەڵ دنیا دەکات، واقیعێک هەیە، دەبوایە حزب ئەو واقیعە دەرک پێ بکا.

**منیش مەبەستم ئەو واقیعەیە...**

- بەڵام برا کوردەکان بەردەوام هەوڵی چەسپاندنی مافی بڕیاردانی چارەنووسی کوردی لە هەموو بەرنامەکانی حزبی شیوعی دەدا.

**بەڵام زۆرجار دەگوترێ هەندێک «هەموویان نا» لە برادەرە کوردەکان لە عەرەبەکان کۆسمۆپۆلیت تر بوون بەرامبەر کێشەی کوردستان؟**

- ئەوە بەشێکە، بەشێکی بڕیاردەر نییە.

**بەلام رۆلیان هەبووەو دەنگیان هەبووە. ؟**

- بێ گومان، کە حزبی شیوعی کوردستان دامەزرا، لەناویاندا بەرهەلستکار زۆر بوو.

**پێش ئەوەی حزبی شیوعی کوردستان دابمەزرێ، تۆ سکرتێری هەرێمی کوردستان ـ حزبی شیوعی عێراق بوویت، ماوەیەک جۆرێک لەخۆ دوورخستنەوەو بێدەنگی و ناڕازیبوونێکت هەبوو، دەکرێ ئێستا هۆی ئەو هەلوێستە روون بکەیەوە؟**

- من ئەو مەسەلەیە بە ململانێیەکی ناوخۆی حیزب دەژمێرم، بۆ نموونە لە سالّی ١٩٦٢ کە کۆمیتەی ناوەندی بۆ دیراسەکردنی بارودۆخی کوردستان کۆبووە، لەو کۆبوونەوەیە مەکتەبی سیاسی پرۆژەی ئوتۆنۆمی خستەڕوو، من نەچوومە ئەو کۆبوونەوەیە، لەبەر ئەوەی لە هەر کۆبوونەوەیەک یەکێک ئیستسنا دەکرا، لەبەر وەرگرتنی ڕێوشوێنی ئەمنی، ئەو جارە من ئیستسنا کرام، من ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلم نووسی، داوای فیدرالیەت و یەکێتی ئارەزوومەندانەم کرد، بەلّام هی منیان قبولّ نەکرد.

**پێش ئەوەی ڕاپۆرتەکەت پێشکەش بکەی، ڕای هەندێک لە ئەندامانی لیژنەی مەرکەزیت بە دەست نەهێنا بوو، بۆ چەسپاندنی پرۆژەکەت؟**

- با، من لەگەلّ سەلام عادل (ئەبو ئیمان) باسم کردو پشتگیری کردم، ئەو لە مۆسکۆ بوو، نامەیەکی نووسی دەلّێ من پشتگیری دروستبوونی کۆمارێکی ئیتحادی دەکەم.

**ئەی جەمال حەیدەری لەگەڵ چ دا بوو؟**

- ئەو لەگەڵ ئۆتۆنۆمی بوو، خۆی پرۆژەکەی پێشکەش کردبوو.. ئێمە دەمانویست دوانەکەوین لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئەوەبوو داوای دیموکراتیەت بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کرا، پارتی ئەوکات نەیدەزانی چ تەرح بکا، کە راپۆرتی ئێمە دەرچوو پشتگیری ئەو مەوزوعەی کردو بۆ خۆی قۆستییەوە.

لە ساڵی ١٩٦٢-١٩٩١ لەو ماوە دوورو درێژەدا نەتانتوانی قەناعەت بە حزبی شیوعی بێنن کە ئەو پرۆژەیەی تۆ بچەسپێت؟

- زۆرمان هەوڵدا، بەڵام مام جەلال ئەوسا لەگەڵ ئێمە نەبوو، ئێمەو پارتی و لایەنەکانی دیکە لایەک بووین، ئەو بە تەنیا لایەک بوو...... ئەو (مام جەلال) داوای دەکرد بەرەیەک لە کوردستان بکرێتەوە کە هیچ ئامادەکارییەکی بۆ نەکردبوو، داوای دەکرد ئۆتۆنۆمیەکی راستەقینە لە کوردستان دروست ببێ، منیش ئەوکات وتارێکم نووسی کە چ بەرەیەکی کوردستانی و چ ئۆتۆنۆمیەکمان دەوێ، ئا لەوێوە دەستمان پێکرد بۆ ئەوەی یەکێتی بۆ ئاشتەوایی رابکێشین.

**پرسیارەکەی من ئەوەبوو، ئەو کاتەی خۆت دوورخستەوە، هەستمان کرد سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراقیش جۆرێک لە رق و کینەی بەرامبەرت دەنواند، تۆ لەگەڵ ئەو فکرەیە دابووی کە حزبی شیوعی کوردستان دروست بکرێ، دەتویست ئەوە لە ناو حزبی شیوعی عێراقیش بچەسپێنی، بەڵام بۆت نەکرا، ئایا ئەم هەوڵانە**

**واینەکرد سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراق بۆچوونێکی دیکە بەرامبەرت وەربگرێ؟**

- ئەوە ململانێیەکی ناوخۆییە لە حزبدا، ململانێی فیکری و سیاسی هەیە، بیروڕای جیاواز هەیە، من دەمێک بوو هەستم بەو مەسەلەیە کردو لەگەڵ هاوڕێ (سەلام عادل)یش باسم کرد گوتوومە پێویستە حزبی شیوعی کوردستان دابمەزرێنین، هاوڕێ فەهد دژی ئەو مەسەلەیە نەبوو، ئەو لە سەرەتاوە لقی دانا، ڕێکخراوی دانەنا، بەڵام بۆی تەئکید دەکردینەوە کە ئەو لقە دەبێ بەپێی پەرەسەندنی واقعی سیاسی پەرەبسێنێ، چونکە میللەتی کورد ڕۆژێک دێ ببێتە دەوڵەت، هەندێک هەزمی ئەو پرسەیان نەدەکرد، دەیانگوت لە وڵاتێکدا دەبێ یەک حزب هەبێ، منیش دەمگوت شەرت نییە، بۆ نموونە ئێستاکە ئیسرائیل هەموو فەلەستینی داگیرکردووە بۆچی فەلەستینیەکان نابنە ئەندامی حزبی شیوعی ئیسرائیل؟ بۆچی حزبی شیوعی فەلەستینیەکان هەیە، بۆچی بۆ ئەوان ڕەوابێ بۆ کورد ڕەوانەبێ!؟ دوایی ئەوان لە حزبی شیوعی ئەردەن جودا بوونەوە، چونکە بۆ قەوارەی سیاسی خۆیان هەوڵیان دەدا، لە کاتێکدا حزبی شیوعی ئەردەن دژی قەوارەی سیاسی فەلەستینی نەبوو، بەڵام بایەخی زیاتر بە ئوردن دەدا، ئەوەندە بایەخی بە قەزیەی فەلەستین نەدەدا، منیش گوتم حزبی شیوعی عێراق بایەخ بە کێشەی هەموو عێراق دەدا، بایەخی تایبەت بە کێشەی کورد نادات، بەڵام حزبی شیوعی کوردستان بایەخی تایبەت بە کێشەی کورد دەدا، هاوڕێیانمان ئەو

کێشەیان بە شێوەیەکی راست هەزم نەدەکرد، لەبەر ئەوە من کەوتمە ململانێیەکی توند، یەکەمیان جەماعەتی کار دەستیان پێکرد کە داوای حزبی شیوعی کوردستانیان دەکرد، من ویستم ئەو بەرەیە لەبن پێیان دەربێنم، بیخەینە ژێر پێی خۆمان، چونکە هی خۆمانە، هی ئەوان نییە، دەمزانی ئەوان حزبی شیوعی دانامەزرێنن، چونکە موشەقەق حزب دانامەزرێنێ، دەبێتە حزبێکی دیکە.

**بەڵام بهاتبانەوە ناو ئێوە چیان پێ دەکرا؟**

- بەڵێ. ئێمە توانیمان ئەوە بچەسپێنین کە دەبێ حزبێکی شیوعی کوردستان دابمەزرێ، بەڵام من داوای پەیوەندی فیدراڵیم کرد لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق، ئەوە ناکۆکییە سەرەکییەکە بوو، چونکە هەندێک لە عەرەبەکانی ناو سەرکردایەتی حزبی شیوعی عێراق دامەزراندنی حزبێکی شیوعی کوردستانیی تابع بە حزبی شیوعی عێراقییان پێرەوابوو، بەڵام من فیدراڵیەتم دەویست کە ئێمە حزبێکی سەربەخۆ دەبین، بەڵام یەکێتی لە نێوان هەردوو حزب هەبێ کە دوو حزبی یەکسان بن لە ماف و ئەرکەکانیان و دوو سەرکردایەتی هەبێ، سەرکردایەتیەکی یەکگرتووش هەبێ.

ئا بەو شێوەیە لە بۆی هاتم نووسیشم (کام حزبی شیوعی کوردستانیمان دەوێ-ی حزب الشیوعی الکردستان نرید)و دووجار بڵاویشم کردەوە، چوومە کۆنگرەش، بەڵام قبوڵییان نەکرد، تائێستاش ئەو مەسەلەیە هەر ماوە، تائێستاش هەر داوای دەکەم.

**بەڵام تازە چ دەکرێ؟**

- دەکرێ چۆن ناکرێ؟ چونکە هەقیقەت دەبێ بکرێ:

**زۆر جاران دەڵێن هەتا جەمال حەیدەری و سەلام عادل و... مابوون حزبی شیوعی دەورێکی زۆر قیادیان بینی لە عێراقدا، بەڵام دوای ئەوانەو لە ساڵی ۱۹٦٣ کە بەعس هەموویانی شەهیدکرد، سەرکردایەتی ئەو حزبە کە تا درەنگانێک عەزیز محەمەد سکرتێری بوو بەرەو لاوازی چووە کە ئێستا وەک دارێکی بێ لق و پۆپ وبێ سێبەر وایە؟**

- ئێمە دەبێ بزانین ئەو حزبە لە چ بارودۆخێک تێکۆشاوەو کاری کردووە. پاش ساڵی ۱۹٦٣ زۆر گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخی عێراقدا هات، حکومەتێکی شۆڤێنی، دیکتاتۆری حوکمی عێراقی گرتە دەست کە دوژمنی بنەڕەتی شیوعیەکان بوو، بەرنامەی سەرەکیشی نەهێشتنی شیوعیەت بوو، بارودۆخێکی زۆر سەخت هاتە پێش لە ساڵی ۱۹٦٣ کادیرێکی زۆرمان ئیعدامکرا، ئێ حزبیش هەر بە کادرەکانی حزبە، بەبێ کادر هیچ پلان و بەرنامەیەکی سیاسی جێبەجێ ناکرێ، بۆ نموونە ئێستا بە تەمام شتێک بدەمە کاک مەسعود، کە بە راستی کاک مەسعود بەرنامەیەکی زۆر پوختی لە پەرلەمان پێشکەش کرد کە بەرنامەیەکە بۆ حکومەت دەشێ، باشە کێ ئەو بەرنامەیە جێبەجێ دەکا، کادر چارەنووسی ئەو بەرنامەیە دیاری دەکا، ئایا ئەو کادرانە ئامادەن بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە.

**بۆچی..؟**

- لەبەر ئەوەی ئەو کادرانە لەو ئاستەنین، یا هی ئەوەنین

گۆڕانکاری شۆڕشگێڕی بەرەو پێشەوە ببەن، لە کاتێکدا بەرنامەکەی کاک مەسعود کوردستان بەرەو پێشەوە دەبا، بزووتنەوەی کورد بەرەو پێشەوە دەبا، بەڵام کادرەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری پراگماتی بەرژەوەندی، زۆرجار بە کاک مەسعودیشم گوتووە، لە دهۆک رایگەیاند کە پاکسازی دەکا، پاش دوو مانگ چوومە لای، گوتم کاک مەسعود کوا پاکژکردنەوەکەت، گوتی دەمەوێ بیخەمە پێش کۆنگرەی حزب، گوتم کاک مەسعود ئەوجا بۆت ناکرێ، گوتی بۆ؟ گوتم ئەو کۆنگرەیە پڕە لە هەموو کەسێک، ئەوانە هەموو خاوەن بەرژەوەندی خۆیان، چۆن پشتگیری تیرۆانینی تۆ دەکەن، ئەوانەی کە ئێستا ئێوەیان ویستووە، سبەینێ شکستەک بێنن لەگەڵتان نابن، گوتم بە بیرت دێ لە شەقڵاوە بووین، حکومەت هێرشی دەکرد، دەمانویست هێرشەکە رابگرین، من ٥٠ کەسم ئامادەکردبوو سواری لۆریشم کردبوون، رەسول مامەند گوتی من ٨٠کەسم هەیە، گوتم ئەی کاک مەسعود تۆ؟ کاک مەسعود گوتی وەڵڵاهی ١٢ پاسەوانی خۆم لەگەڵدایە، ئێستا پێیان بڵێم دەتانێرمە بەرەی شەڕ ئەوانیش بەجێم دێڵن... ئەوجا پێمگوت لە تەنگانە لەگەڵت نین، لەبەر ئەوە هیچ بەرنامەیەکی شۆڕشگێڕی دیموکراسی جێبەجێ ناکەن، دەگەڕێمەوە سەر پرسیارەکەت، ئێمە هاتین یەکسەر ئینقلابمان کرد، چەکمان هەڵگرت، لە ناوەوەش رێکخستنەکانمان لاواز بوون، چونکە لێدرابووین، لەبەر ئەوە نەمانتوانی ئەو دەورە ببینین... دوایی بەشداریمان لەگەڵ حکومەت کرد کە لەویش زۆر زەرەرمەند بووین، زۆرمان لێ کوژراو گیرا، دوایش

هاتینەوە ناو شۆڕشی کوردستان، ئیتر ماوەیەکی نالەبار بوو، حزب نەیتوانی وەکو جاران راست بێتەوە.

**لە کاتێکدا بەعس خەڵکی ئەنفال و سەرکوت دەکرد، ئێوە هاوپەیمانی سۆڤیەت بوون، بەڵام نەتانتوانی هەر هیچ نەبێ قەناعەت بە سۆڤیەت بێنن، کە بەعس ئەوەندە خەڵکتان لێ نەکوژێ، بۆ جارێک هەڵوێستێکی توندتان لە بەرامبەر سۆڤیەت وەرنەگرت، هەر هیچ نەبێ رای ناوخۆ بۆ خۆتان رابکێشن؟**

- جارێ سۆڤیەت بۆ رووخا؟ ئەگەر حزبی شیوعی سۆڤیەت شۆڕشگێڕ بوو ایەو بەرنامەی مارکسی- لینینی جێبەجێ بکردبا، نەدەڕووخا، ئەوانیش کەوتنە ناو پراگماتی بەرژەوەندی، کەوتنە ناو بیرۆکراتیەت و دابڕان لە جەماوەر، چ شیوعیەک لە رووسیا هەڵسا بەرگری لە حزبەکەی بکات؟ کێ بەرامبەر گۆرباتشۆف راستبۆوەو بڵێ قەحپەباب ئاوها نابێ!؟

**کە ئاوها بوو بۆچی حزبی شیوعی عێراقی هەڵوێستی بەرامبەریان وەرنەگرت؟**

- من زۆرجار بەرهەڵست بووم، کە لە ساڵی ١٩٦٣ مەدحی جەمال عەبدولناسریان کردو خەلاتی لینینیان دایێ، من رەخنەم لە خرۆشۆف گرت، لە (رێگای کوردستان) نووسیم، حزب موحاسەبەی

**نابێ کەس رەخنە لە سۆڤیەت بگرێ؟**

- نابێ، چۆن دەبێ!؟ بە هەرحاڵ ئێمە هەندێ جار دەمانزانی سۆڤیەت هەڵەیە، بە دوای بەرژەوەندی خۆی کەوتووە، کە گۆرباتشۆف

هات، ئێمه مەترسیەکی زۆرمان لەسەر سۆڤیەت هەست پێکردبوو، دەمانزانی لادان هەیە، بەڵام نەماندەزانی دەڕووخێ.

**لادان لەلایەن گۆرباتشۆف بوو، یان پێشتریش هەبوو؟**

- پێشتریش، له خرۆشۆفەوە، هەر چەندە خرۆشۆف بەرگری لێدەکردین، دەستی لەبۆ (عبدلسلام عارف) درێژنەکرد، گوتی ئەوە بە خوێنی هاورێیانمان سووره، لەوکاتەی کە جەمال عەبدولناسر وەک سەرۆک کۆماری عێراق ناساندی... هەرچەندە ئەوەشی کرد، بەڵام ئێمە رەخنەمان لێدەگرت.

**بەڵام دوایی پاڵپشتی بەعسی زۆر کرد؟**

- نا ئەوان پاڵپشتی بەعسییان نەکرد، بریژنیف کردی.

**بەپێی ئەو ئەزموونەی لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات هەبوو کە پێی دەڵێن کەمپی سۆسیالیزم و تا کۆتایی ١٩٨٩ مابوون و بەردەوامبوون، هەستیان نەکرد کە ئەو سیستەمە هیچ داهاتوویەکی نییە، چونکە خەڵک لێی بێزارە، رووخاش کەس ئەسەفی بۆ نەخوارد، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا هەستتان نەکرد کە دوورکەوتنەوە لە واقیع، ئەنجامەکەی ئاوها دەبێ؟**

- نا.. ئێمە دەمانزانی حزبی شیوعی سۆڤیەت بەرەو لادان رۆیشتووە، ئێ ئەوانیش هەموو تابعی ئەو حزبە بوون.

**بە حزبی شیوعی عێراقیشەوە؟**

- ئەویش تاڕادەیەک، بەڵام حزبی شیوعی عێراق لە دەسەڵات نەبوو، ئەوان لە دەسەڵات بوون، هەموویان پێڕی ئەوان بوون، تەنها

(چین) پێی چەقاند گۆرباتشۆفی دەرکرد، ئەوکاتەی گۆرباتشۆف سەرۆک کۆمار بوو، چۆن کە چووە ئەڵمانیا قەناعەتی پێکردن، چووە (چین)یش، بەڵام لەوێ پێیانگوت برۆ دەرێ، ئێمە ئەوەنین سەر بە ئێوەبین. . ئەگەر حزبی شیوعی بووایە، دەبووایە خۆی گۆڕانکاری بکردایە، بۆ تەسلیمی سەرمایەداری دەکا. ئەوە حزبی شیوعی نییە، من هەر گوتوومەو ئێستاش دەیڵێیم: لە هەر وڵاتێک ئەگەر سۆشیالیستیی تێدا دابمەزرێ، دەبێ فرە حزبی هەبێ، ئەحزابی شیوعی جۆراوجۆر هەبێ، بۆ نموونە لە سەرمایەداریدا حزب یەکجار زۆرە، باشە بۆ لە دەوڵەتێکی سۆشیالیستی چەند حزبێکی شیوعی نەبێ بۆ ئەوەی ببێتە ململانێ لە پێناو زیاتر خزمەت کردن. . لەوێ رەخنە نەمابوو، یەک حزب بوو، یەک حزبیش لە ناوخۆیدا ناتوانێ ململانێ بکا، بەڵام ئەگەر حزب زۆربێ، ململانێ دروست دەبێت، کامە حزب بەرنامەی باشتری بۆ سۆسیالیزم هەبێ، ئەو حوکم دەگرێتە دەست، بەڵام ئەوە لە رژێمی سۆڤیەتی دا نەبوو، ئێستا لە چینیش، هەرچەندە خۆیان گۆڕانکاری دەکەن، بەڵام وایان لێدێ، پێویستیان بە دروسبوونی حزبی دیکە هەبێ.

**ئێوە خۆتان پەیوەندیتان لەگەڵ حزبی شیوعی چینی نەبەست، یا کاریگەری حزبی شیوعی سۆڤیەت بوو؟**

- بەڵێ کاریگەری حزبی شیوعی سۆڤیەت بوو.

**بۆچی هەوڵتان نەدا وەک حزبێکی مارکسی پەیوەندیان لەگەڵ ببەستن؟**

-هەوڵماندا، بەڵام بێ سوود بوو، رەخنەیان لێگرتین.

**تۆ تەمەنێکی دوورودرێژ لەگەڵ بزووتنەوەی نیشتمانی، و مارکسی دابووی، ئێستا ئەگەر گەنج بیتەوە، ناچی حزبێکی نەتەوەیی دوور لە مارکسیەت دروست بکەی، کە ئەو حزبە خۆی سەرکردایەتی جەماوەری کورد بکات، نەک (انظمام) لەگەڵ حزبێکی نەتەوەیی بکاو حزبە نەتەوەییە کە سەرکردایەتی بکاو ئەویش هەر رەنج بە خەسار بێ؟**

- من بۆ ئەو مەسەلەیە دەڵێم، نە پارتی وادەمێنێ، نە یەکێتیش، نە ئێمەش وا دەمێنین، جارێ هیچمان وەرنەگرتووە، تائێستا هەر هەوڵدەدەین قەوارەیەکی سیاسیمان بۆ دروست بێ، کە ئەوە مەبەست و بەرنامەو ستراتیژیەتی هەموومانە، ئێستا کە گفتوگۆی دەستووری هەمیشەیی دەکرێ، پێوستە ئەو مەسەلەیە جێگیر بکرێ کە کورد مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆی هەیەو دەتوانێ دەوڵەت دابمەزرێنێ، پێویستە لەو دەستوورە ئەوەش جێگیر بکرێ کە ئەگەر پاش ماوەیەک لە جێبەجێکردنی دیموکراتیەت ر فیدرالیەت، شتێک دژی کورد روویدا، کورد بتوانێ دەوڵەت دابمەزرێنێ، ئەوە زۆر گرنگە.. لەو باوەڕەداین، لە دامەزراندنی دەوڵەتێک ململانێی چینایەتی دەست پێدەکا، چونکە تائێستا ململانێی چینایەتیمان زۆر کزبووە، ململانێیەکە نەتەوەیی بووە. ئەگەر بێتو کوردستان بەو شێوەیە بمێنێتەوە، ئەوا لە هەموو شتێکدا دوادەکەوێ، من قیرتاوکردنی جادەیەک، یا دروستکردنی باخچەیەک بە پێشکەوتن دانانێم، ئەوە بە

شتێکی زۆر شەکلی و کاتی دادەنێم، کوردستان بەوە پێش دەکەوێ کە بەرهەمهێن بێ، پیشەسازی هەبێ، بازاڕ هی خۆی بێ، ئێستا بازاڕ هی خۆی نییە ،بازاڕی سەرمایەداری جیهانییە ، بڕۆ بزانە هیچ کەلوپەلێکی بەرهەمهاتووی کوردستان هەیە ؟ تەنها کلاشی پەڕۆینی هەیە..

**دەگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکەم، کە وەڵامت نەداوە، ئایا دوای ئەو ئەزموونەی هەتە، ئەگەر گەنج بیتەوە حزبێکی نەتەوەیی دروست ناکەی؟**

– ئەگەر ئەو حزبانە دواکەوتن، هیچ پێشکەوتنیان نەبێ، دەبێ دروست بکرێ.

**مەبەستم خۆتە ، زۆرکەس لە تەمەنێکدا بە قۆناغی شیوعیەتی زۆر گەرمدا ڕەت بووە، بەڵام دوایی بۆی دەرکەوتووە کە پێویستە بچێتە قۆناغێکی دیکە ؟**

– من ئێستا بیرم لەوە نەکردۆتەوە تەجاوزی ئەو دوو حزبە (پارتی ویەکێتی) بکەم، بیرم لەوە کردۆتەوە ئەو دوو حزبە چۆن پێک بێن، ئەوان هێشتا حکومەتەکەیان دانەمەزراندووە، ململانێی حزبایەتی تەسک نەمێنێ  هەرچەندە ئێستا مام جەلال و کاک مەسعود دژی حزبایەتی تەسک هاوار دەکەن، بەڵام ململانێکە زیاتر بووە. دەبێ ئەو دوو حزبە پێک بێن، لە یەکگرتنی ئەو دوو حزبە شتێکی نوێ پێک بێت، کە ئەو شتە نوێیە لە قازانجی بزووتنەوەی نەتەوایەتیمان‌دا بێ.

**حزبی شیوعی کوردستان حزبێکی مارکسیە، کەچی تائێستا لەگەڵ**

**حزبە ئیسلامیەکان، وەکو ئەوانەی درێژبووەوەی ئیخوان موسلمین، یا ئەوانی دیکەن، هەماهەنگیان لە گەڵ یەکدی زیاترە لە حزبە نەتەوەییەکان، ئایا ئەوەش جۆرێک لە لادان لە بیروباوەڕی مارکسی- لینینی نییە؟**

- من، پێش سێ ساڵ وتارێکم دەربارەی ئیسلامی سیاسی نووسی، تەئکیدم، لەسەر ئەوە کرد کە پەیوەندیان لەگەڵ ئەو حیزبە ئاینیانە لەسەر سێ شت دیار دەکرێ، یەکەمیان هەڵوێستیان بەرامبەر نەتەوەی کورد، دووەمیان هەڵوێستیان بەرامبەر دیموکراسی، سێیەمیان رەخنەگرتن لە دەسەڵات، ئەگەر بێتو ئەو حزبە سیاسیە ئاینیانە لەگەڵ ئەو شتانە رێک بکەون، ئێمە پەیوەندیان لەگەڵ دەستین.

**پێتوایە حیزبە ئیسلامیەکان بڕوای بە دەستاو دەستکردنی دەسەڵات و دیموکراتیەت هەیە؟**

- ئەوان ئیعلانیان کردووە.

**ئەوە راستە؟**

- ئەوان ئێستتا ئیعلانیان کردووە کە پشتگیری ئەو بۆچوونانە دەکەن، ئێمەش پێ خۆشحاڵین، ئەوان دەڵێن ئێمە وەکو حزبە مەسیحیەکانی ئەوروپا مامەڵە لەگەڵ سیاسەت دەکەین، حزبە مەسحیەکانی ئەوروپا کە دێنەسەر حوکم ناتوانن دەستورو دیموکراسیەت ببەزێنن، ئەمانیش دەڵێن ئێمە ئاوهاین، بۆ نموونە ئێستا حزبی ئیسلامی سوننە پشتگیری کێشەی کورد دەکات، بەلآم شیعەکان نایکەن.

**بەلام ئەوانیش درێژبووەوەی ئیخوان موسلیمین، ئیخوانیش لە مێژووی خۆیدا لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوایەتی نەبوو؟**

**ئێستا دەڵێن گۆڕاوین، وەکو جاران بیروباوەڕی ئەوانمان نەماوە.**

**- بەلام هەر ئەو حیزبە ئیسلامیانەشن خەلکیان تێدا پەروەردە دەبێ و دەبێتە تیرۆریست؟**

- من دەلێم لە رووی فیکرییەوە لەگەلیان ناگونجێین، بەلام لە رووی جێبەجێکردنی بەرنامەی سیاسیەوە، ئەگەر هاتوو بەو شێوەیەی کە گوتم، تەعامول بکرێ، ئەوا ئێمە قازانجمان کردووە، چونکە ئەوان هاتوونەتە سەر هەلوێستی ئێمە، ئێمە نەچووینەتە سەر هەلوێستی ئەوان.

**بەلام لەو نووسینانەی کە بۆ رێکخستنەکانیان بە نهێنی بلاوی دەکەنەوە، نەک هەر لەگەڵ ئەو پرسانە نین، بەلکو بەر بەرەکانێی دەکەن و هێرشی توندیشیان بۆ سەر حزبە نەتەوەییەکان هەیە؟**

- بەلێ، ئێستا ئەوان ململانێی پارتی و یەکێتی دەکەن، ئەوان لە هەلبژاردنەکانی قوتابیان و شارەوانی لە بادینان دەنگی باشیان هێنا، لە ئێمە زۆر زیاتر، سێیەم حزبن، ئێمە چوارەمین، لە رووی فیکریشەوە بڕوایان نە بە حزبە نەتەوەییەکانە و نە بە حزبە مارکسیەکان.

**لە دوایین کۆنگرەی حزبی شیوعی خۆت هەلنەبژارد،پێشتر باس**

**لەوە دەکرا کە تۆ لەبەر پیری و بێ تاقەتی کارت تەواو، بەڵام لە ناو خەڵک باسی شتێکی دیکە دەکرا، پرسیار ئەوەیە خۆ هەڵنەبژاردنت بۆ سکرتێری حزبی شیوعی لەژێر گوشاردا بوو، یان بە ئارەزووی خۆت بوو؟**

- مرۆڤ دەگاتە پلەیەک ناتوانێ ئەو رۆڵە بگێڕێ لە رووی جەستەییەوە، بۆ نموونە من پێشتر دەچوومە هەموو شوێنێک و بەردەوام دەجوولام، هەموو ئەو شاخانەم بە پێ دەبڕی، پێشمەرگە نەیدەتوانی لەگەڵم رێ بکا، دەیانگوت ئەگەر ئەو لەگەڵمان بێ، نایێین. بەڵام ئێستا ئەو توانایەم نەماوە، هەستیشم دەکرد پێویستە گۆڕانکاری بکرێ، لە کۆنگرەی پێشووتریش داوام کرد لە سکرتێری حزب نەمێنم، قبوڵیان نەکرد، گوتم باشە بەڵێنم دەدەنێ کە لە کۆنگرەی داهاتوو خۆم هەڵنەبژێرم، گوتیان بەڵێ، بەڵام تۆ دەبێ خەڵک ئامادە بکەی، گوتم من ئامادەی ناکەم، خۆتان ئامادەی بکەن، سەرەڕای ئەوەش تائێستا هەر لە ناو حزبم، هەر شتێکیان بوێ یارمەتیان دەدەم، بەڵام من لە پێگەی بڕیارنیم، تەنها وەکو بیروڕاو پێشنیار هاوکاریان دەکەم.

**باشە لاچوونی هاورێ عەزیزیش رێی بۆ خۆشکرابوو؟**

- خۆیشی قەناعەتی هەبوو.

**بەڵام لە کۆنگرەی حزب عەرەبێک هەستاوەو بە عەزیز محەممەدی**

**گوت، هەتا حزب گەشاوەو زیندوو بوو، تۆ سکرتێر بووی، ئێستا حزبەکە مردووە بۆنەکەت بۆ ئێمە جێهێشتووە، بیشارەوە ئینجا جێی بهێڵە، ئەمە مانای ئەوە نییە لاوازبوونی حزبی شیوعی لە دوای راپەڕین وایکرد عەزیز محەمەد واز لە حزب بهێنێ؟**

- نەوەڵڵا ئەوە نەبوو، ئەویش کەوتبووە ناوساڵ، دوایی کەسانی دیکەی گەنج هەبوون، بۆ نموونە حەمید مەجید موسا کەسێکی مەبدەئی و گەنجەو لە پەرلەمان ئەو داکۆکییەی ئەو لە کوردی دەکات، کوردەکان نایکەن، ئێ باشە ئەو جۆرە کەسانە پێویستە دەوری خۆیان هەبێ، سەرەڕای ئەوە گۆڕانکارییەکی زۆر لە کۆمیتەی ناوەندی حزب روویداو لە کۆنگرەی پێنج کۆمەڵێک کەسی نوێ هاتن. لەبەر ئەوە هەبوو دژی هاورێ عەزیز بوو، بۆ نموونە تائێستاش زۆرکەس دژی دامەزراندنی حزبی شیوعی کوردستانن، کە بڕیاری ئەو حزبە دامەزراوە.

**دەیانگوت عەزیز محەمەدیش لەگەڵ دروستبوونی حزبی شیوعی کوردستان نەبوو؟**

- با، لەگەڵدا بوو، بەڵام منیان بە توندڕەو دادەنا، من واقیعی بزووتنەوەی کوردم زیاتر هەزم کردبوو، ئێستاش لەو باوەڕەدام پێویستە بزووتنەوەی کوردی ستراتیژیەتی هەبێت و ئەو ستراتیژیەتە ببێتە بەرنامەی هەموو حزبە کوردییەکان، ئەوە وامان لێ دەکا کە

قـەوارەیەکی سـیـاسی کـامل و تەواو دابمەزرێنیین، بەیانی بارودۆخ رەخسا پێویستە دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێ.

**لە ساڵی ١٩٧٢ کە بەرەتان لەگەڵ بەعس دروستکرد، ئەوکاتە سەدام وەک کاسترۆ باسدەکرا، مەدح دەکرا کە ئەوە نەهجی دیموکراتی شۆڕشگێڕی هەیە و ... هتد...**

- ئەوە ئێـمـە مـانان نەبووین، عـەرەبەکان بوون کە بە کاسـترۆی عێراقیان ناوبرد.

**باشـــە هەر لەو بەرەیەدا ئێـــوە لەگـــەڵ پارتی کـــەوتنە سەنگەربەندییەکی خراپ کە گوللەتان بە پێشمەرگەوەنا، ئێوە ئەوکات لەناو سەرکردایەتی حزب چۆن توانیتان پشتگیری ئەو دۆخە بکەن کە بەرەنگاری بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازی ببنەوە؟**

- لە بـارەی ئـەوەوە بـۆچـوونـێـکـی تـایـبـــــــەتیم هەیـەو لـە بیرەوەرییەکانیشم نووسیومە، پاش دروستکردنی بەرە لەگەڵ بەعس لەگەڵ بارزانی دانیشتین، پێمان گوت ئەزبەنی، خۆت دەزانی وەزع لە عـێـراق و کـوردسـتـان چۆن پەرە دەسێنێ، گـوتم لە مـێـژووی ئێـمـە یەکـەمـجـارە کـورد شـۆڕشی سـەرتـاسـەری هەیە، ئێـمـە شـانازی بەوە دەکەین کە تۆ سەرپەرشتی ئەو شۆڕشە دەکەی، نابێ بیدۆڕێنین، دەبێ بەرەو پێشـەوەی ببـەین، بەڵام ئێـسـتـا هەست دەکـەین بەرەو دۆڕاندن دەچین، کـاک مـەسـعـودو کـاک ئیـدریس و عـەلی عـەبدوڵڵاو د.

مەحمودیش لەوێ بوون، بارزانی گوتی باشە، من وا خۆم لەناو دەمی ئەژدیهایەک دەبینم، دەتوانن دەرم بێنن، گوتم نا وەڵڵا ئەزبەنی ئەو توانایەمان نییە، گوتی من چیبکەم لایەک شایە، لایەک تورکیا، لایەک عەرەبە.. گوتمان ئێمە لەگەڵ بەعس بەرەمان کردۆتەوە، بە تەنیا دەرەقەتی نایەین، بەڵام ئێوەمان لەگەڵ بێ، هەزار حیسابمان بۆ دەکەن، وەرنە ناو ئەو بەرەیەو یەیەک کوتلە بەرامبەر بەعس دەوەستینەوە، دیاربوو نە شا رازی بوو، نە ئەمریکاش، چونکە ئەو وەختە پەیوەندیان لەگەڵ ئەوان هەبوو، ئەوەبوو ئێمە لەگەڵ یەک ترازاین، پێموابوو پلان داندرابوو تا ئێمە لێک جیاواز بکەنەوە.

**پیلانەکە لەلایەنە بەعس و سۆڤیەتەوە نەبوو؟**

ـ بەعس و ئەمریکاو شاو هەموو تیکەڵ بوون، پلانەکە ئەوەبوو ئێمە لێک دوور بخەنەوە، کورد بە تەنیا بمێنێ، ئەوەبوو رێککەوتنی جەزائیر هاتەکایەوە، لەو لاوەش ئێمە بکشێینەوە، وایانکرد کە ئێمە دەرچین ئەوکاتەی لە جەبهەی عێراقی بووین، لە ماڵی سامی عبدالرحمان لە بەغدا لەگەڵ سامی عەبدولرەحمان و نوری شاوەیس و ساڵح یوسفی کۆبووینەوە، من و هاورێ عەزیزو موکەرەم تاڵەبانی پێمان گوتن بە بارزانی رابگەیەنن ئێمە نامانەوێ هیچ پێکدانێک لە نێوانمان رووبدات، ئەوە سیاسەتی ئێمە نییە، ئێمە دوور دەکەوینەوە، ئێوە خۆتان بۆ شەڕ لەگەڵ بەعس ئامادە دەکەن، کەیفی خۆتانە، بەڵام

ئێمە داخیلی ئەو شەڕە نابین و لێمان گەڕێن، کەچی هەفتەیەکی تێپێنەچوو یەکسەر هێرش هاتەسەر هەموو برادەرانمان، چەند کەسێکیان گرت، حکومەتیش تەدەخولی نەکرد، ئێ چ بکەین موقاوەمە دەکەی تووشی شەڕ دەبی، موقاوەمە ناکەی بە دوات دەکەون، ئەوەبوو من و زەکی خەیریان بۆ لای بارزانی نارد گوتم ئەزبەنی واکراوەو وادەکرێ، ئەویش گوتی ئێوە وا دەکەن، گوتم وەڵڵاهی ئەزبەنی هەمووی پیلانە، دەیانەوێ شۆڕشەکە لەناو بەرن، گوتم ئەو برادەرنەی ئێمە بۆ گیراون! چیان کردووە؟ ئیتر گوتی بەرەڵڵایان بکەن، گوتم کاکە بۆ شەڕ لە نێوانمان هەبێ، ئەو بڕیاریدا گوتی شەڕ مەکەن، بۆ شەڕ لەگەڵ شیوعیەکان دەکەن، ئێمە شەڕمان لەگەڵ حکومەتە، ئێمە هاتینەوە دووبارە هێرشکرا، ئەو جارە گوتمان با بەرگری بکەین.

**بەڵام هەر خودی بەرەکە هەڵە نەبوو؟**

- با، دواتر رەخنەمان لە بەرەکە گرت.

**ئەوکات بەرهەڵست نەبووی؟**

- نەخێر. لەگەڵدا بووم، چونکە بە هەلمزانی بۆ ئەوەی حزب بگەڕێتەوە ناوشار، لەبەر ئەوەی حزب زۆر لاوازبوو، بەڵام کە بەرەکەمان دامەزراند حزب زۆر پەرەی سەند، سەدام ترسا، لە کۆبوونەوەیەکدا گوتی ئێوە تەحەدای ئێمە دەکەن و تەجاوز دەکەن.

**بەڵام بەپێی بیرەوەرییەکانی فاتح رەسول و ئەبو سەربازو...**

**دەڵێن لەناو کۆبوونەوەکەی کۆمیتەی ناوەندی جاری یەکەم بە دەنگێک زیاتر دژی جەبهەکە بوون، بەڵام عەزیز محەمەد وایکرد ئەو جەبهەیە ببەسترێ، لە کۆبوونەوەی دووەم لایەنگرانی جەبهە دەنگێک زیاتر بوون؟**

- وەکو یەک بوون، بەڵام وەکو یەک بڕیار نادا، دەبێ زۆرینە بێ، فاتح رەسولیش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبوو، ئەبو سەرباز ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو.

**باشە کە ئێوە داواتان لە بارزانی کرد لەگەڵ ئێوە بن بۆ ئەوەی لە بەرە بەهێز بن، ئەوانیش داوایان لە ئێوە نەکرد، کە لەگەڵ ئەوان بن بۆ ئەوەی لە شەڕی دژی بەعس بەهێزبن؟**

- نا، داوایان نەکرد، ئێمە لەکاتی رێککەوتنی جەزائیر گوتمان ئەگەر موقاوەمە بکرێ، ئێمە لە بەرە دێینە دەرێ و دێین پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکەین.

**بەڵام ئایا ئەوکات شۆڕش دەکرا؟**

- وای لێ هاتبوو نەکرێ، بارزانی هەموو لایەکی لێ گیرابوو، سوریا، تورکیا، ئێران هەریەکە لەلای خۆی بەرامبەر بارزانی وەستابوون.

**چەپ لە کوردستان زۆر لەگەڵ حزبی شیوعی هەماهەنگی نییە، نەک هەماهەنگی نییە، بەڵکو زۆرجار رەخنەش لە حزبی شیوعی دەگرن، حزبی**

**شیوعیش هەستدەكرێ متمانەی بەو چەپەی کە هەیە، کەمە، بۆچی حزبی شیوعی نەیتوانی حزبێک بێ، چەترێک بێ بۆ چەپەکانی کوردستان؟**

– ئەو چەپانەی تۆ دەیانناسی یا سەر بە پارتین، یا سەر بە یەکێتین، ئەوانە چەپی ئەسلی نین، چەپی ئەسلی لە کوردستان زۆر کەمە یان هەر نییە، لەبەر ئەوەی کە تۆ دەتەوێ چەپێک بهێنیتە لای خۆت ئەو دەڵێ دەمەوێ بژیینی، ئێ من لە بۆ خۆژیاندن ئەوم ناوێ، من بۆ سیاسەت و بیروباوەڕ ئەوم دەوێ لەگەڵمدا بێ، هەر بۆیەش ئەوانە دەچنە ناو پارتی و یەکێتی، باشە ئەوە چۆن چەپێکە، ئێمە ئەو چەپانەمان ناوێ سەر بە کەس بن، با سەربەخۆبن.

**تێبینی : زۆر پرسی گرنگ مابوو ئامازەیان بۆ بکەین، بۆیە مامۆستا کەریم ئەحمەد رازی بوو، جارێکی دیکەو لە دانیشتێکی دیکەدا، ئەو پرسیارانەی ماون لێی بکرێ، وەڵام بداتەوە، بۆیە دوای ماوەیەک دوو کاتژمێری تر هەندێ پرسی گرنگمان خستە ژێر پرسیارو وەڵامدانەوە، کە لێرەوە دەست پێدەکات.**

# له بەستی شەرغەوە هەتا دەگاتە رۆژی هێرشەکەی پشت ئاشان هەموو جاسووسی حکومەت، نوێنەری حکومەت لەناو یەکێتی رێکیانخستبوو لەو بارەیەوە بەڵگەشمان هەیە

لەبەر ئەوەی مامۆستا کەریم ئەحمەد مێژوویەکی پتر لە ٦٠ ساڵەی پڕ لە خەباتی سەخت و نەپسارەی هەیە، ئیدی ئەزموونێکی زۆر دەوڵەمەندیشی هەیە، بۆیە لە دیانەی یەکەمیدا نەمانتوانی زۆر پرسی گرنگ هەبوون، ئامـاژەشیـان بۆ بکەین، سەرەڕای ئەوەی خەڵکێکی زۆر لە خوێنەران، بە پێویستیان دەزانی زۆر خاڵی شاراوە هەیە، پێویستە لەگەڵ مامۆستا کەریمدا باس بکرێن، بەتایبەتی کەریم ئەحمەد تێکۆشەرێکی کەم وێنەیە، چ لە بواری راستگۆییدا، چ لە بواری ئەوەی رۆژێک لە رۆژان رەچاوی هیچ بەرژەوەندییەکی شەخسی بۆ خۆی نەکردووە، هەمیشە گڕی خەبات لەناو دڵی کەریم ئەحمەددا کڵپەی سەندووە، تەنانەت ئێستاش دوای تەمەنی ٨٣ ساڵەی و دوای ئەو تەمەنە پڕ لە خەباتەی، هەر تێکۆشەرانە دەژی، چاوی لە

هیچ نییه، جگه له خهبات و ئازادی بۆ کوردستان. له ههر شوێنێکیش پێویستی کردبێ، قسهی ههق و ڕهقی خۆی کردووه، ئهنجامهکهی ههرچی بووبێ گرنگی پێ نهداوه. بهڵام گرفتی کهریم ئهحمهد ئهوهبووه له ڕووی دیپلۆماسییهوه، زۆر کارا نهبووه، پێچ و پهنا نازانێ، ههر بۆیه کهریم ئهحمهد تائێستا چ له ناو سهرکردایهتی سیاسی کوردی بهتایبهتی، چ لهناو میللهتی کورد بهگشتی، وهکو خۆی نهناسراوه، لاوازی له دیپلۆماسیهتهکهی ڕووی حهقیقی کهریم ئهحمهدی ون کردووه، دهنا کهریم ئهحمهد تێکۆشهرێکی زۆر مهزنه، دهبوو له سایهی ئهو ئازادییهی که ههیه، کهریم ئهحمهد زۆر باشترو خۆشتر بژی، چونکه خهباتی ئهو له ناو حشع دا، سهبارهت به قووڵکردنهوهی گیانی کوردایهتی جێ پهنجهی دیار بووه. بهڵام، کهریم ئهحمهد ئهو شتانهی بهلاوه گرنگ نییه، بهڵکو گرنگ لای کهریم ئهحمهد کۆڵنهدان و خهباتی نهپساوهیه. ئێستاش دڵی کهریم ئهحمهد له دڵی هیچ شۆڕشگێڕێک کهمتر نییه، بۆیهک چرکه ساتیش بیری له بهرژهوهندی تایبهتی خۆی نهکردۆتهوه، که بۆ ئهمڕۆ زۆر بێ وێنهیه.

بابزانین دیانهی ئهم بهشهمان دڵی چهند کهس دهڕهنجێنێ و خوێنهرانیش چۆن دڵشاد دهکات.

حزبی شیوعی که له ساڵی ١٩٣٤ دامهزراوه، تاساڵی ١٩٧٩ سێ کۆنگرهی بهست، ئهوه جێگای گلهیی ئهندامان و دۆستانی ئهو

**حزبە بوو کە بۆچی حزب کۆنگرە کەم دەبەستێ..؟**

- ئەگەر چاوێک بە مێژووی حزبی شیوعی بخشێنینەوە، دەبینین پرسی ئەمنی لەبەستنی کۆنگرەو کۆبوونەوەکان رۆڵی زۆری هەبووە، چونکە حیزبی شیوعی بە ئاشکرا کارکردنی بەخۆیەوە نەدیوە، تەنها ماوەیەکی کەم نەبێ، ئەگینا لە زۆربەی کاتەکاندا بەنهێنی کاری کردووە. حزب لە ساڵی ١٩٤٤ کۆنفرانسی بەست. لە ساڵی ١٩٤٥ کۆنگرەی بەست، کۆنفرانسەکە وەکو کۆنگرە وابوو، بەڵام ناوی لێنرا کۆنفرانس.. دەمانزانی حزبی شیوعی پێویستی زۆری بە کۆنگرە هەیە، بەڵام وەک گوتم لەبەر پرسی ئەمنی کەم دەتوانرا کۆنگرە ببەسترێ.

**جگە لە پرسی ئەمنی، کەمتەرخەمی لە سەرکردایەتیش نەبوو؟ بۆ نموونە نەدەتوانرا لە ساڵانی ١٩٥٨و دواتریش کۆنگرە ببەستێ؟**

- کەمتەرخەمیەکە لەوەوە بوو هەندێک جار لەبەر ململانێی ناوخۆمان حزب رێگای بەستنی کۆنگرەی نەدەدا، چونکە ئەگەر رێگای بدابا، لەوانە بوو کەرتبوون (ئینشیقاق) روویدابا، لەبەر ئەوە کۆنگرەکە نەدەگیرا، هەتا کۆتایی بەو ململانێیە نەهێنرابا.

**مەترسی کەرتبوون لەبەر ململانێی فیکری بوو، یاخەڵکەک لە کۆنگرە دەرنەدەچوون؟**

- رووخسارێکی فیکری دەدرایێ، بەڵام هەمووی زاتی بوو، ململانێی لاوەکی و شەخسی و بەرژەوەندی تایبەتی بوو، کەچی

رووخسارێکی فیکرییان دەدایێ، ئەو دەیگوت ئەوە بۆرجوازیەو ئەوە بۆرجوازی بچووکە، ئەوە راسترەوەو ئەوە چەپڕەوە. لەبەر ئەوە لە بارودۆخێکی وەهادا نەدەتوانرا ئەو کۆنگرانە بگیرێن، بۆیە زۆر دواکەوتبن، بەڵام پاشان کۆنگرەکان دەستیان پێکرد، کۆنگرەکانی ٣و ٤ لە شاخ گیران، لە دوای راپەڕینیش کۆنگرەکانی حزب بە هەمووی گەیشتوونەتە (٨) کۆنگرە.

**لە ساڵی ١٩٤٥ کە بارزانی نەمر چووە ئێران و لەوێ یارمەتی کۆماری مەهابادی دا.. دواتر هەر لەوێ هەمزە عەبدوڵڵای راسپارد کە بێتەوە پارتی دیوکراتی کورد دابمەزرێنێ، قسە لەسەر ئەوە هەبوو کە هەمزە عەبدوڵڵا پێشتر ئەندامی حزبی شیوعی عێراق بووە، ئەگەر ئەوەش نەبێ، کەسێکی مارکسی بووە، پرسیار ئەوەیە بۆچی بارزانی نەمر هەمزەی بۆ ئەو کارە راسپارد؟ لە کاتێکدا بیروباوەرێکی چەپڕەوی هەبوو؟!**

- هەمزە عەبدوڵڵا کەسێکی تێکۆشەربوو، لە گرووپەکانی مارکسی بوو، لە کوردستان سەرپەرشتی گروپێکی مارکسی دەکرد، یەکەم کەس بووە سەرپەرشتی گرووپێکی مارکسی کوردی دەکرد لە زاخۆ. ئەوکاتە لە هەولێر گرووپی مارکسی نەبوو، لە زاخۆو کەرکوک و سلێمانی هەبوو، لە سلێمانی عەبدولوەهاب نوری و کەریم زەند هەبوون...

**ئەی مەلا عروس لە هەولێر..؟**

- ئەوە لە ساڵی ١٩٤٤و ١٩٤٥ بوو، بەڵام ئەوانی ناوم هێنان لە سییەکان دەستیان پێکردبوو، عەبدولوەهاب نوری کتێبی بەرەو رووناکی چاپکرد، لەو کتێبەدا ستایشی سۆڤیەت دەکات، مرۆڤێکی تێکۆشەر بوو، هەمزەش یەکێک لەوان بوو، دوایی پەیوەندی لەگەڵ حەلەقاتی مارکسی لە بەغدا کرد، بەڵام پەیوەندی بە گرووپە مارکسیە کوردییەکەی خۆی هەر مابوو.. هەمزە عەبدوڵڵا لە تێکۆشەرانی گروپی پێشکەوتووخوازی کورد بوو، لە هەموو کاتێکدا رۆحی نەتەوایەتی لە بۆچوونی مارکسیەتیشی دیاربوو، بۆیە لەناو رۆشنبیرانی کورد کەسایەتییەکی کوردایەتی پەیدا کرد.. بارزانی هێشتا نەچووبووە ئێران کە هەمزە پەیوەندی لەگەڵ پەیدا کرد بوو، پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعیش هەبوو، لەکاتی دامەزراندنی حزبی شیوعیدا ئەو پەیوەندیەی دروست کرد.

**مادام ئەو لە حەلەقاتی مارکسی بوو، ئەو رۆڵەشی هەبووە، بۆچی لە دەستەی دامەزرێنەری حزب نەبوو؟**

- ئەو رێکخستنی حزبی شیوعی لە کوردستان دانەمەزراند، هەر لەسەر حەلەقاتی مارکسی مایەوە.

**دەیویست زیاتر مۆرکێکی کوردانەی بداتێ؟**

- بەڵێ.. هەمزە عەبدوڵڵا پەیوەندی لەگەڵ حزبی شیوعی هەبوو، پەیوەندی لەگەڵ بارزانیش هەبوو، پێش ئەوەی بارزانی بچێتە ئێران ئەو پەیوەندییە دروست ببوو، کە بارزانی چووە ئێران، ئەویش دواتر

چوو، ئەو رۆشنبـیـرانەی لەگـەڵ بارزانی چووبوون، بەتایبـەتی ٤ ئەفسەرە شەهیدەکە، کەسانی نەتەوەپەروەری پێشکەوتوخواز بوون، پێش چوونیان بۆ ئێران لەگەڵ بارزانی لیژنەی شۆرشی کوردستانیان دامەزراندبوو، ئەوسا قەناعەتیان بە بارزانی هێنا کە نابێ تەنها پشت بە ئاغاو عەشیرەتەکان ببەستێ، ئەوان کوردت بۆ کۆناکەنەوە، ئەوەی کوردت بۆ کۆدەکاتەوە رێکخستنێکی سیاسییە، نەک عەشیرەت و ئاغاکان.. دوایی ئەوانە لەگەڵ تۆ (مەبەستم بارزانی یە) راستگۆ نەبوون، هەمووی پەتکیان دەپساند، کە بارزانی دەستی بە شۆرش دەکرد، ئەوان (سەرۆک عەشیرەت و ئاغاکان) خۆیان دەکشاندەوە، ئێ چییان لێ بکات، سوێندیشی پێ دەخواردن کە خیانەتی لێ نەکەن، بەڵام سوێندەکەش دەڕۆیشت و بارزانیش بە تەنیا دەمایەوە.

لەبەر ئەوە ئەوانە کـاریان لە بارزانی کـرد کـە دەبێ پشت بەرێکخستنی سیاسی ببەستێ، ئەوسا حزبی هیوا هەبوو، تاکە حزب بوو، بەڵام ئەو حزبە بڕوای زۆر بەبەڵێنەکانی ئینگلیز دەکرد، پێیوابوو حکومەتێک بۆ کورد دادەمەزرێن، کە ئینگلیز بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ نەکرد، کاریگەری لەسەر کوردەکان هەبوو، ئەوە بوو وازیان لە پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیز هێنا، دامەزراندنی حزبێکی سیاسییان بۆ کورد بە پێویست زانی. لە ساڵی ١٩٤٥ هاوڕێ فەهد نووسی، کورد پێویستی بە حزبی عەمەلە، نەک حزبی ئەمەل، پێویستە حزبێکی دیموکراتی جەماوەری لە کوردستان دابمەزرێ، تا ئەو میللەتە لە دەوری

خۆی کۆبکاتەوە، هیوا ئەو حزبە نییە. ئینجا هیوا ململانێی ناوخۆیی تێکەوت و تێکچوو و نەما، هەرچەندە کەسەکانی هەموویان نیشتمانپەروەرو پێشکەوتنخوازبوون، لە ٩٥٪ی گەنجان و رۆشنبیرانی کورد لەناو ئەو حیزبە بوون، هیچ حیزبێکی دیکە بەو شێوەیە فراوان نەبوو، ئەو حیزبە زۆر گەورە بوو. هەمزە عەبدوڵلاو تۆفیق وەهبی و چەند کەسێک دەستیان بەوەکرد کە پێویستە پارتی دیموکراتی کورد لە عێراق لە شێوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دابمەزرێ، رەشنووسی بەرنامەیەکیان دانا، لەگەڵ پەیڕەوی ناوخۆ، دەبووایە بیخەنە بەردەم بارزانی و پێی بڵێن کە سەرپەرشتی ئەو حزبە بکات، هەمزەو مستەفا خۆشناو چوونە لای بارزانی و پێیانگوت کە دەمانەوێ حزبێکی نەتەوەیی و دیموکراتی لە شێوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە عێراق دابمەزرێنین.. ئێستا لە ناوەوە رزگاری و شۆرش و حزبی شیوعی عێراقی هەموویان ناکۆکییان لە نێواندایە، ئەو حزبە دێت هەموویان کۆدەکاتەوە، سێ رۆژ گفتوگۆیان لەگەڵ یەکدی دەبێ، بارزانی زۆر پەیوەندیدار بوو بە پەیوەندی خێزانی، ئەگەر شێخ ئەحمەد شتێکی نەگوتباو لەسەر شتێک رازی نەبوایە، بارزانی نەیدەکرد. بۆیە لەو مەسەلەیەدا بارزانی پێیاندەڵێ دەبێ رووخسەتی شێخ ئەحمەد وەربگرم کە ببمە سەرۆکی ئەو حزبە، ئەگەر ئەو رازی بێ من ئامادەم.

گوتیان باشە تۆ پێی بڵێ، گوتی نا من پێیناڵێم، چۆن پێیدەڵێم

ببمه سەرۆکی حزب، بۆ خۆتان پێی بڵێن. ئەوان چوون لەگەڵ شێخ ئەحمەد دانیشتن و گوتیان زۆرمان باسکرد کە پێویستە حزبێکی وەها دابمەزرێ، ئەو زۆری پێ خۆشبوو، بەس گوتی مەلا مستەفا رازییە؟ ئەوانیش دەڵێن ئەگەر تۆ رازی بی، ئەو رازییە، گوتی دەپێی بڵێن بابیکات، بە بارزانیان گوتەوە، ئەویش گوتی ئامادەم. ئینجا چۆن دروستبکرێ ، هەمزە عەبدوڵڵا گوتی من دەچمەوە عێراق پەیوەندی بە حیزبەکان دەکەم، کە هاتەوە لێرە حزبی شیوعی کوردستان (شۆرش) ململانێی ناوەخۆیان هەبوو..

**ململانێیەکە لەسەر چی بوو؟**

- ململانێیەکە لەسەر ئەوە بوو کە ئەو حزبە لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی دادەمەزرێ، یا لەسەر بنچینەی چینایەتی، ئەگەر لەسەر بنچینەی چینایەتی بێت، ئەوە حزبی شیوعیە. ئەگەر لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی بێ، ئەوە حزبی شیوعی نییە، ئینجا کۆنگرەیان بەست. حزبی رزگاریش تابعی حزبی شیوعی کوردستان (شۆرش) بوو، کە لەرووی فراوانی و گەورەییەوە باڵی لە هیوا دەدا.

**کێ سکرتێری ئەو حزبە بوو؟**

- کاک عەلی عەبدوڵڵا سکرتێری حزبی رزگاری بوو، چونکە ئەو ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی کوردستان (شۆرش) بوو، کاک ساڵح حەیدەری سکرتێری حزبی شۆرش بوو. ئەوانە کاتی خۆی لقێک بوون لە یەکێتی تێکۆشان (رابطە الشیوعیین العراقیین) لە

کوردستـان کە ئەو لقە خۆی هەڵوەشاندەوەو چووە ناو حزبی شـیوعی عێراق، کوردەکان نەچوون، گوتیان ئێمە لەگەڵ حزبی شیوعی عـێراقی وتوویژێکی تایبـەتی لەبارەی پرسی نەتەوایەتی دەکـەین، ئەوە بوو وەفدێکیان پێکهێنا کە ساڵح حەیدەری و کاک عەلی عەبدوڵلاو نافع یونس چوونە لای هاوڕێ فەهدو لەگەڵی دانیشتن، بەڵام نەگـەیشتنە ئەنجام، ئەوان دەیانگوت لقی کوردستـانی حزبی شیوعی عێراقمان بدەنە دەست، ئەوکـات مـەلا عـروس بەرپرسی ئەو لقـە بوو هاوڕێ فـەهدیش گـوتی باشە ئێـوە هەوڵبـدەن، لەناو حـزبدا تێبکۆشن هەتا چنگتـان بکەوێ، مـەعـقـول نیـیـە لە ئێسـتـاوە بیـدەینە ئێـوە، ئەوە دیموکراتیەت نییە. ئینجا گەڕانەوە کۆنگرەیان بەست و حزبی شیوعی کـوردستـانیـان دامـەزراند، رۆژنامـەکـەیان ناوی شـۆڕش بوو، بۆیە بە حزبی شۆڕش ناویان دەرکرد. دواتر کە ململانێ کەوتە نێوانیان لەوەی ئەو حـزبە شـیـوعـیـە شـەرعـیـە، یان نا، مـەبدەئیـە، یان نا، لەو ململانێیەدا کۆنگرەیەکیان بەست، لەوکاتەدا هەمزە عەبدوڵلا هاتەوە، ئەو هانیدەدان کەوا ئەو کۆنگرەیە کۆتایی بەو حزبە بێنێ، بە ئامانجی دامـەزراندنی حـزبێکی دیموکـراتی کـوردی، ئەوەبوو حـزبی شـۆڕش هەڵوەشایەوە، بەشێکی زۆر لە سەرکردەکانی چوونە ناو حزبی شیوعی عـێـراقی، حـیـزبی رزگـاریش هەمـوو بوونە پارتی، ئەوەبوو بە سەرپەرشتی هەمزە عەبدوڵلاو بە یاریدەدەری کاک عەلی عەبدوڵلا، کۆنگرەی پارتی بەسـترا، پێشی ئەوە بارزانی مەرجێکی هەبوو، کە

دەبێ کاکە زیادی کۆبەو شێخ لەتیفی حەفید لە سەرکردایەتی پارتی دابن، بە راستی کاکە زیاد هەرچەندە ئاغا بوو، بەڵام تا مرد تێکۆشەر بوو، شێخ لەتیفیش ماوەیەک لە سەرکردایەتی پارتی بوو، بەڵام دواتر بووە شیوعی.

**شێخ لەتیف بیروباوەڕێکی ئایینی هەبوو، چۆن بووە شیوعی؟**

- کەی شێخ لەتیف بیروباوەڕی ئایینی هەبوو! ؟ ئەو شێخایەتی نەدەکرد.

**دەڵێن زۆرکەس لە کۆنگرەی یەکەمی پارتی بەشداری کرد، کەچی ئەندامی حزبی دیکە بوون، بۆ نموونە ئیبراهیم ئەحمەد؟**

- نەخێر، نەمبیستووە ئیبراهیم ئەحمەد لە کۆنگرە بەشدار بووبێ، ئەو ژێکاف بوو، دواتر بووە پارتی.

**ئەی بۆچی هەمزە عەبدوڵلا لەناو پارتی نەما، لەکاتێکدا ئەو رۆڵەی هەبووە لە دامەزراندنیدا؟**

- هەمزە لە سەرکردایەتی پارتی بوو، پاش بارزانی ئەو بوو، هەتا ساڵی ١٩٥٨ مایەوە، لەو ساڵەدا ناکۆکی لەناو سەرکردایەتی پەیدابوو، کێشەی چەپڕەوی و راسترەوییان کەوتە ناو، لەوانە هەمزە، خەسرەو، نەژادو... چەپڕەو بوون. ئیبراهیم ئەحمەد بەوە رازی نەبوو، بە بارزانی گوت ئەوانە شیوعین و حزب تێکدەدەن، ئەو بۆ رەواجدان بەخۆی وایدەکرد، چونکە ئەو سەلماندی لەگەڵ بارزانی نییەو دژیەتی، بەڵام ئەوەی رێکخست تا هەمزە لابباو خۆی بێتە جێگای.

**ئیبراهیم ئەحمەد کە لە کۆنگرەی دامەزراندن نەبوو، دواتر هاتە ناو پارتی چۆن توانی ململانێی هەمزە بکات؟**

ئاخر دوایی کە هاتە ناو پارتی، یەکسەر هاتە ناو سەرکردایەتی، ئەوکاتیش ململانێ هەبوو، لەناو پارتی تەکەتولات هەبوو، مام جەلال یەکێ بوو لەو کوتلانە.

**مام جەلال لە سەرەتادا لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد دابوو؟**

- نا، دوایی لەگەڵیدا بوو... سەرەتا گرووپی تایبەتی هەبوو، یەکەمجار لەگەڵ هەمزە بوو، دوایی وازی لێهێنا، یەکەم کەس کە پەیوەندی بە بارزانی کرد لە سۆڤیەت مام جەلال بوو، لە ڕێگای کۆنگرەی قوتابیان و لاوان چووە یەکێتی سۆڤیەت، راپۆرتێکی تێروتەسەلی لەسەر بارودۆخی کوردستان بۆ بارزانی نووسیبوو، کاک مەسعود لە کتێبەکەیدا ئەو راپۆرتەی بڵاوکردۆتەوە، لەو راپۆرتەدا مام جەلال هەزار جوێنی بە ئێمەداوە. ئینجا دەستیکرد بە ناردنی نامە بۆ بارزانی، چونکە بارزانی لەو ماوەیە لە کوردستان دابڕابوو، لەبەر ئەوەی پەیوەندی نەبوو، ئاگای لە بارۆدۆخی ئێرە نەبوو، تا وای لێهات بگەڕێتەوەو ئەو بارودۆخە گۆڕا.

**رەفیق حیلمی سەرۆکی حزبی هیوا بوو، بەڵام وەک سەرۆکێکی رەمزی بێت، وابوو، قورسایی لەناو ئەو حزبە نەبوو، کەسێک بوو نەیتوانی بەردەوامی بە سیاسەت بەشێوەیەکی وەهابدا کە شتێکی لێ شێن ببێ، باشە حزبی هیوا چۆن کەسێکی وایان کردە سەرۆکی خۆیان**

**که قورسایی نەبوو، هەر هەیکەلێک بوو؟**

- ڕەفیق حیلمی لە ڕووی فیکری و سیاسی مرۆڤێکی ڕۆشنبیر بوو، ڕۆشنبیرێکی گەورەبوو، کاریگەریشی لەسەر ناوەندی ڕۆشنبیری هەبوو، دەیتوانی خەڵک کۆبکاتەوە، بەڵام کەسێکی لیبرالی بوو، ئەو لیبرالیەتەی وایلێکردبوو مەرکەزیەتی بەهێز نەبێ لەناو حزبدا، لەبەر ئەوەش زوو هەڵوەشایەوە.

**دوای نەمانی حزبی هیوا ڕەفیق حیلمی چی بەسەرهات؟**

- سەرەتا دانیشت، دوای ماوەیەک هات بۆ لای حزبی شیوعی، بووە دۆستی حزب، بەڵام نەبووە ئەندامی.

**بەهادین نوریش لەناو حزبی هیوادا بوو؟**

- نەمبیستووە، ئەو لە مزگەوت فەقێ بوو. لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی دەیخوێند، زۆرشتی سەیریشی لەکاتی فەقێیایەتی لێ دەگێڕنەوە، دەڵێن فەقێیەک هەبووە جاسوسی حکومەت بووەو خەبەر لە (بەها)و ئەوانە دەدا کە خەریکی کاری ڕێکخستن، بەها دەزانێ کە ئەو فەقێیە خەبەری لێداوە، هەڵدەستێ کاغەزێک بۆ (ئەمن) دەنووسێ کە لەبن سەری فلان فەقێ بڵاوکراوەی سیاسی هەیەو دابەشی دەکا، تومەز خۆی بڵاوکراوەکانی لەبن سەری فەقێیەکە داناوە، کە هاتن دەبینن ڕاستە بڵاوکراوە لەبن سەری هەیە، بەڵام نەیانگرت، چونکە فەقێیەکە جاسوسی خۆیان بوو، زانیان کە بۆیان ڕێکخستووە.

**باشە حزبی شیوعی هەر لەسەردەمی پاشایەتیەوە، هەتا ساڵی ١٩٨٨ کە بەرەی کوردستانی دامەزرا، بەناو ریزێک بەرە داهاتووە، هەمووشی حــزبی شــیــوعی رۆڵی هەبووە، یا جــێی پەنجــەی دیاربووە لە دروستکردنیاندا، لەسەردەمی بەعس کە هاوپەیمانێتی دۆستایەتی و هاوکاری بوو، چ لە سەردەمی جوقدو جودو دوایی بەرەی کوردستانی، کەچی نەیتوانیوە دەورێکی قیادی لە جەبهەکاندا ببینێ، بۆچی؟**

- یەکەم بەرە لە ساڵی ١٩٥٧ کە بەرەی نیشتمانی عێراق بوو لە نێوان حیزبی شیوعی و حیزبی نیشتمانی دیموکراتی کامل چادرچی و حزبی ئیستقلالی مەهدی کوبەو حزبی بەعس پێکهات، ئەویش بە هەوڵی حزبی شیوعی بوو، هەر ئەو بەرەیەش سەرکردایەتی شۆرشی ١٤ی تەمموزی کرد، بەنسبەت دەوری سەرەکی، لە رووی عەمەلی و شەقامەوە هەمووی لەبن دەستی حزب بوو، بەڵام لە رووی سیاسیەوە حزبی نیشتمانی دیموکراتی رۆڵی سەرەکی هەبوو، کامل چادرچی وەکو کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر دانی پێدانرابوو، هەموو لایەک لێی رازیبوون .لەو بەرەیە حزب داوای کرد کە پارتی دیموکراتی کوردستان بێنە ناو بەرەکە، بەڵام حزبی بەعس و حزبی ئیستقلال رەتیان کردەوە، کوتیان ئەوە حزبێکی نەتەوەیی و جیاخوازە، نامانەوێ بێننە ناو بەرە، حزبی شیوعی نارەزایی دەربری و گوتی ئەوە حزبێکی نەتەوەییە، چۆن ئێــوە نەتەوەی عــەرەبن، ئەوانیش نوێنەری نەتەوەیەکن کــە مــافی چارەنووسی خۆی هەیە، ئەوان دانیان بەوە نەنا، حزبی شیوعی هەڵسا

بە تەنیا لەگەڵ پارتی بەرەیەکی کردەوە، دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزیش، حزب دووبارە ئەو مەسەلەیەی وورووژاندو ئینجا پارتی بووە ئەندام لە بەرەکە، عەبدولکەریم قاسمیش رازی بوو.

**پرسیارەکەم ئەوەبوو بۆچی حزبی شیوعی نەیتوانی سەرکردایەتی ئەو بەرانە بکات؟**

- ئاخر لەناو حیزبیشدا ململانێ هەبوو، ئاراستەیەک پێیوابوو کەوا ئێمە پاڵ بەو بارودۆخە نەنێین بەرەو چەپ بڕوا، با بەرەو لیبرالیەت و نیشتمانی بێت باشترە، با حزبەکان نەکەینە دوژمنی خۆمان، ئاراستەیەکیش پێیوابوو ئێستا ئێمە دەتوانین وا بکەین حزب رۆڵی خۆی هەبێ، لایەنگری بردنی بارودۆخەکە بەرەو چەپ بوون.

**تۆ ئەوکاتە لەگەڵ کامیان بووی؟**

- من لەگەڵ چەپ بووم، دەمویست حزب رۆڵی خۆی دیاربێ. لەبەر ئەوە ئەو ململانێیە وایلێکردین کەوا کۆنگرەش نەبەستین، چونکە بەشەک لەگەڵ قاسم بوون و بەشێکیش دژی بوون، بێگومان ئەوەش دابەشبوون دەخاتە ناو حزب.

**ئەی لە «جوقد»یش هەر ئەو ململانێیانە دەوری هەبوو؟**

- جوقد پارتی تێدانەبوو، هاوڕێ عەزیز داوای کرد کە ئێمە یەکێکمان نەقسە، ئەویش پارتی دیموکراتی کوردستانە کە پێویستە لەناو بەرە جێگای خۆی هەبێ.

**لەبەرچی پارتی لەگەڵ نەبوو؟**

- یەکێتی رازی نەبوو.

**بۆچی ئەو بەرەیە زوو هەڵوەشایەوە؟**

- ئێمە بەرەیەکمان لەگەڵ پارتی دروستکرد، ئەوان لێمان رازی نەبوون، نە بەعسی قیادەی قوتر رازی بوو، نە یەکێتی رازی بوو.

**ئەوە لە ساڵی چەند؟**

- لە ساڵی ١٩٧٩ دەستپێکرد، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٠ راگەیەنرا.

**حزبی شیوعی رۆڵی نەبوو لە لەبارچوونی ئەو بەرەیە؟**

- با.. دەمانویست پارتی بێنینە ناو بەرە، دەمانگوت بێ پارتی بەرە نییە.

**ئەو بەرەیەی لەگەڵ پارتی دروستتانکرد، یەکێتیتان داخیل نەکرد؟**

- کە بەرەکەمان لەگەڵ پارتی کردەوە، ئەوان رازی نەبوون، ئێمەیان لە ئەندامێتی جوقد سڕکرد، بە پراکتیکیش ئەو بەرەیە پاش دەرچوونی ئێمە، نەما.

**دەڵێن حزبی شیوعی لەسەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ هەر لایەنێک بێ تووشی شکست دەبێ...؟**

- نەخێر وانییە. لە گفتوگۆی پێکهێنانی بەرەی کوردستانی پرۆژەی ئێمە سەرکەوت، پرۆژەی یەکێتی سەرنەکەوت.

**مەبەستم لە هەموو وتووێژەکانە؟**

- با نموونەیەکت لەو بارەوە بۆ بهێنمەوە، پێشنیارکرا بەرەیەک لەگەڵ ئیسلامییەکانی عێراق بکەینەوە، ئیسلامییەکان زۆر داوایانکرد کە (بسم الله الرحمن الرحیم) لەسەر کۆنووسی رێککەوتنەکە بنووسرێ، من گوتم نابێ.. بسم الله الرحمن الرحیم دروشمەکی ئایینییە نەک سیاسی، ئێوە ئایین بۆ مەبەستێکی سیاسی بەکاردێنن، ئێمە قبوڵی ناکەین. گوتم: باشە ئێوە قبوڵ دەکەن وطن الحر والشعب السعید لەگەڵ بسم الله الرحمن الرحیم بنووسرێ، گوتیان نەخێر، گوتم منیش قبوڵ ناکەم، مام جەلال و نوێنەری پارتیش لەوێ بوون.

**لە ساڵی ١٩٦٣ دوای کودەتای شوبات حزبی شیوعی تووشی باروودۆخێکی خراپ هات، هەندێک لە قیادەو قەواعدی حزب هاتنە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان.. دەڵێن بارزانی ئەمر جێی بۆ دەکردنەوەو یارمەتی دەدان، بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد ئازاری دەدان و دەیگرتن، لە کاتێکدا ئەو خۆی بە مارکسی دەزانی.. بۆچی هەڵوێستی وابوو؟**

- ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ وتوێژکردن لەگەڵ بەعسیە کودەتاچیەکان بوو، بەڵام مەلا مستەفا دژی وتوێژ لەگەڵ بەعسیان بوو، دەیگوت ئەوانەی کەسانی پێشکەوتووخوازو نیشتمانپەروەر دەگرن و لە سێدارەیان دەدەن، یان ئەشکەنجەیان دەدەن، ئەوانە خێریان تێدا نییەو هیچمان بۆ جێبەجێ ناکەن. هەرچی ئیبراهیم بوو دەیگوت بائێمە

سوود لەو بارودۆخە وەربگرین، بەلاّم بۆچوونەکەی مەلا مستەفا ڕاستتر بوو. ئیبراهیم لەگەڵ ئێمە دۆست نەبووە، بارزانی ڕێنمایی بۆ هەموو بنکەکانی پارتی دەرکردبوو دەڵێ شیوعیەکان لەوماوەیە تووشی شکست بوونە، دێن بەرەو کوردستان، پێشوازیان بکەن، لە خۆتان زیاتر خزمەتیان بکەن، بەلاّم ئیبراهیم ئەحمەد شتێکی بلاّوکردەوە دەڵێ شیوعیەکان روو لە کوردستان دەکەن، روویان ڕەشکەن! ئینجا ئەو شیوعیەکانی دەگرتن و سوخرەی پێ دەکردن.. زۆر سەیر بوو! دوایی گەمارۆی ئابووری بەسەردا سەپاندین. من خۆم یەکێک بووم لەوانەی چووینە کلکە سماقە بۆ ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی خۆمان دابمەزرێنین، گەمارۆی ئابووری لەسەر دانایین، نەیهێشت هیچ یارمەتیەکمان بگاتێ، رۆژێ یەک نانمان دەخوارد، ئەویش کاکە حەمەی مامە رەزا دەیدایێ، نەیدەهێشت یارمەتیەکانمان پێ بگا کە دەهات دەستی بەسەردا دەگرت. من چوومە لای مەلا مستەفا گوتم ئەوە وامان لێدەکرێ، ئەوسا مام جەلالیش لەوێ بوو، مەلا مستەفا توورەبوو، گوتی ئەو ئیبراهیم ئەحمەدە هەمووشتمان لێ تێکدەدا، مام جەلالیش توورەبوو گوتی ئەوە کوفرە.. دواتر چەکیان لە مامە رەزا و جەماعەتەکەی ستاندبوو، چوومە لای بارزانی گوتم ئەزبەنی ئیبراهیم ئەحمەد دەستی بەسەر چەکەکانی ئێمە داگرتووە، کاغەزێکی دایێ گوتی برۆ چەکەکان وەرگرنەوە، من چووم ١٥ رۆژ لەو بارەگا بۆ ئەو بارەگا گەڕام، کەس گووی بەکلاّوی نەپیوم، هاتمەوە

گـوتم ئەزبەنی هیـچم وەرنەگـرت... ئینجـا لەوکـاتەوە ئیـبـراهیم دەستیکرد بە دژایەتیکردنی بارزانی، ئاخر لە کۆنگرەی کوێسنجق کە کۆنگرەیەکی گەورە بوو، لە هەمـوو چین و توێژەکـانی تێدابوو بارزانی رازی نەبوو بچنە وتوێژ، گـوتی من داوا دەکـەم هەرچی زیندانیـیـە ئازادی بکەن، ئینجـا وتوێژیان لەگـەڵدا دەکـەم.. ڕۆیشت گـوتی من دەڕۆم ئێـوە کـۆنگرەی خـۆتان بکەن، ئەوە بوو وەفـدێکیـان بەسـەرکـردایەتی مـام جـەلال پێکهـێنا، وەفـدەکـەش هیـچی چنگ نەکەوت، دواتر مام جەلال چووە لای جەمال عەبدولناسر، تائەو بکاتە واسیتە بۆ چارەسەرکردنی ئەو پرسە، جەمال عەبدولناسریش هیچی پێ نەکرا، گەڕاوە گوتی ئەوانە هیچ ناکەن.. مەلا مسـتەفا پێیانی گوت من لەسەر هەقم، ئێوە لەسەر هەق نین، ئیتر ئەوەبوو هەر شتێک دەبوو، لە دژی مەلا مسـتەفا رادەوەستـان، مەکـتەبی سیـاسی لە کـۆنفـرانسی مـاوەت بڕیاریدا کـە بارزانی لە سـەرۆکـایەتی پارتی تەجـمـیـد بکات. من و هاوڕێ عـەزیز چووینە لای بارزانی گـوتمان ئەزبەنی ئەوە تۆ چی دەکەی؟ بۆ خۆت تووشی ئەوانە دەکـەی، ئەوانە شاخن، قـوەتێکن و شەڕکـەریان هەیە، پێکەنی گـوتی ئێـوە زۆر بێ عـەقڵن، گوتی ئەوانە نین نین! من پێتـان دەڵێم ئەوانە نین، سفرن.. گوتمان ئەوانە ٦٠٠٠ کەسیان هەیە، گوتی ٦٠٠٠ کەسی چی، ئەوانە پیاون؟ ئەوە بوو گوتمان ئێستـا تۆ چی دەکەی؟ گوتی ئەمـشـەو بەرەو سلێمـانی دەڕۆم.. بۆیان ڕۆیشت.. جەمـاعـەتی مەکـتەبی سیـاسی

کەسیان لەوێ نەمان، هەمووی بۆ ئێران ئاوابوون. یەک فیشەکیان نەتەقاند، لە ترسان هەموویان رۆیشتن، کە هاتەوە چووینە لای گوتی نەمگوت ئەوانە نین، ئینجا پێدەکەنی و دەیگوت ئەها بلە منی تەجمید کردیە!

**ساڵی ١٩٧٩ کە لەگەڵ حزبی بەعس تێکچوون و رووتان لە شاخ کرد، قسە هەیە کەوا یەکێتی بەو شێوەیە یارمەتی نەدان، پارتی زیاتر یارمەتیدان...**

- ئێمە لەگەڵ پارتی لە ساڵی ١٩٧٤ ناکۆکی کەوتبووە نێوانمان، شەڕی ناوخۆش لە نێوانمان روویدا، هەردووولاشمان هەڵەبووین، پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی نەما، تەنها دواین جار لە ساڵی ١٩٧٥ خەبەرمان بۆ بارزانی ناردو گوتمان بیستوومانە شۆرش حەل دەکەن، ئێمە رازی نین، لەگەڵ سامی عەبدولڕەحمان و نوری شاوەیس و دارا تۆفیق و ساڵح یوسفی لە بەغدا کۆبووینەوە، پێش ئەوەی برۆن، دواین رۆژیان بوو لە بەغداو دەچوونەوە چیا، بیستبوومان لەوێ کۆدەبنەوەو بریاردەدەن کە کۆتایی بەشۆرش دێنن، گوتمان بە جەنابی بارزانی بڵێن ئێمە ئامادەین، ئەو بەرەیەی لەگەڵ بەعس هەمانە بەجێی بهێڵین و دووبارە بپینەوە یەک تا شۆرشەکە بەردەوام بێ، بەڵام ئەوسا شتەکە ترازابوو، پێشتریش بارزانی بە ئێمەی گوت من کەوتوومەتە ناو دەمی ئەژدیها، هەر ئەوەندەم ماوە قوتم بدات، پێتان دەکرێ لەناو دەمی ئەژدیها دەرمبێنن؟

گوتمان ئاخر ئەزبەنی چۆن ئاوایە؟ دەیگوت ئاوایە لایەک ئێرانە، لەلایەک تورکیا، لەلایەک سوریا، ئەمریکا، ئەوە قوتدراین هیچم پێ دەکرێ، جا لەو ماوەیەدا گوتی هیچ سودی نییە، دوو ئاراستەی هەبوو، یەکیان پێیوابوو شۆرش بەردەوام بێ، یەکێکیش لەگەڵ کۆتاییپێهێنانی شۆرش بوو، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٧٥ ئێمە جوابمان بەوەفدەکەدا نارد کە ئێوە دەڕۆنەوە، ئێمەش ئامادەین ئەو بەرەیە جێ بهێڵین بۆ ئەوەی شۆرش بەردەوام بێ.

**مەبەستم ساڵی ١٩٧٩ بوو کە چوونە شاخ...**

- ئێمە لە ساڵی ١٩٧٩ چووینە ناوزەنگ لای یەکێتی، هەر لەو ساڵەدا چوومە ئێران لە ئوتێل لە کاک مەسعود هاتە لام و داوای لێبوردنی کردو باسی بارودۆخی پێشترمانکرد، گوتم کاک مەسعود هەردوولامان هەڵەبووین، با لەنوێوە دەست پێ بکەین، گوتی وەڵڵا هیچ قسەم نەما.

**یەکێتی یارمەتی دەدان؟**

- یەکێتی یارمەتی دەداین، بە چەک و بە پارە. هەر دەیویست بمانقۆزێتەوە لە دژی پارتی. ئەوسا یەکێتی دەیگوت دوژمنی یەکەمم پارتییەو پارتیش دەیگوت دوژمنی یەکەمم یەکێتییە. ئێمەش دەمانویست پێکیان بێنینەوە، ئەو دژایەتییە لە راگەیاندنەکانیان نەهێڵێین.

**لە ساڵی ١٩٧٩ زۆربەی بارەگا سەرەکییەکانتان لەناو زەنگ**

**بوون. دەڵێن ئەوکاتە تۆ لەگەڵ ئەبو سەرباز لە سوریا گەڕایەوە، تەنها فاتیح رەسوڵ لە بارەگا دەمایەوە، ئێوە ماوەیەکی کەم لەوێ دەمانەوەو دواتر دەچوونەوە سوریا، بۆ بەس فاتیح رەسوڵ لەوێ دەمایەوە؟**

- یەکەم جار بەمەبەستی سەردانی برادەران هاتم بۆ ناو زەنگ، کە برادەرانمان هاتبوون. بۆ ئەوەی لە ئەحواڵیان بپرسین و بزانین چییان پێویستە، چونکە لە سوریاوە هاتبووین. لەگەڵ ئەبو سەربازیش لە مەهاباد گەیشتینەیەک. ئیدی ئەمن چوومە ناو زەنگ لەگەڵ مام جەلال و ئەوانە کۆبوومەوە. ئەو زۆر بە پەرۆشەوە گوتی تازە شۆرشەکەمان سەرکەوت، مادەم حیزبی شیوعی هات.. کردبیە هەڵلا.

**دەڵێن شەری ناوخۆی نێوان حیزبە کوردستانییەکان لە ساڵانی ٨١و٨٢و٨٣و٨٤.... جگە لەوەی هۆکاری بەدەستەوەگرتنی حوکمڕانێتی ناوچەکانی تێدابوو، هۆکاری سەرەکی بۆ کۆکردنەوەی باج و گومرگانە بووە، تۆ چی دەڵێی؟**

- ناوەڵلا.. حوکمڕانییەکە هۆی سەرەکی بوو، چونکە هەرلایەک حوکمی کەوتە دەست، باج و ئەوانەشی دەکەوێتە دەست. لەبەر ئەوە ململانێی سەرەکی لەپێناو حوکمڕانی بوو.

**ئەو کاتەی نەوشێروان لەلایەن سۆسیالیستەوە گیرا، ئەو ماوەیە عەزیز محەمەد تەکلیف کرا بۆ ئازادکردنی، بەڵام وابزانم هەوڵەکەی هیچی لێ شین نەبوو...**

- با.. هاورێ عەزیز وەکو وەفد قادر رەشیدی نارد، بە

سۆسیالیستمان گوت موستەحیلە دەبێ نەوشیروان بگەڕێتەوە، ئەگەرنا دوژمنایەتی دەکەوێتە نێوان ئێمەو ئێوە. ئەوکاتە من لە سوریا بووم.

**قادر رەشید لەگەڵ کێ قسەی کرد، مەبەستم لەگەڵ رەسول مامەند، یان دکتۆر مەحمود؟**

- لەگەڵ قادر جەباری قسەی کرد، ئەوسا قادر جەباری سوور بوو لەسەر ئەوەی نەوشیروان بکوژن، بەڵام کە قادر رەشید بریاری حیزبی ئێمەی برد، کە دەبێ بەزووترین کات تەسلیمی ئێمەی بکەنەوە، ئیتر ناچاربوون و تەسلیمی ئێمەیان کردەوە، نەوشیروان لای ئێمە هەڵات.

**ئەی بۆچی ئەو لە بیرەوەرییەکانی خۆی دەڵێ، من لەناو سوسیالیست هەڵاتم؟**

- راست ناکا، درۆ دەکا. ئەو لە بندەستی ئێمە هەڵات.

**بەڵام ئەو (نەوشیروان) ناوی چەکدارەکانیشی هێناوە، گوایە حیمایەیان کردووەو قوتاریان کردووە؟**

- نا.. نا.. راستیەکەی ئەوەیە، سۆسیالیست تەسلیمی ئێمەیان کرد کە لەگەڵ خۆمان بیبەینەوە.

**چۆن هەڵات؟ ئەی لای ئێوە نەبوو؟**

- ئەو نەیدەویست ئێمە لەو ئازادکردنەی ئەو رۆڵمان هەبێ، نەوشیروان زۆر شەیتانە.

**بابێینە سەر خۆت. شەڕی پشتئاشان ئێستا بۆتە مەسەلەیەکی زۆر مێژوویی، دەڵێن پێش ئەوەی یەکێتی هێرشتان بکاتە سەر، ئێوە**

**پێتان زانیوە، بۆیە نەخۆشخانە و چاپخانەو چەکی قورس و هەموو ئەوانەتان لەکارخستبوو، ئەوە راستە؟**

- کێ وادەڵێ؟

**نەوشیروان، دەڵێ چونکە دەیانزانی ئێمە هێرشیان دەکەینە سەر، بۆیە ئەو شتانەیان هەموو تێکدابوو، تاسودیان لێ نەبینن.**

- نا.. ئەوە راست نییە. ئێمە پاش ئەوەی کشاینەوە ئیتر ئەو کەلوپەلانەمان تێک و پێکدا.

**بۆ؟ شەڕەکە چەندی خایاند؟**

- دوو رۆژی خایاند، لە ماوەی ئەو دوو رۆژە هەموو کەلوپەلەکانی خۆمان تێکشکاند.

**بەڵام ئەو دەڵێ زۆربەی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی چووبوونە دەرەوەو بارەگایان چۆڵ کردبوو، تەنها کەریم ئەحمەدو قادر رەشیدو ئەحمەد بانیخێلانی و چەند کەسێک مابوونەوە؟**

- نا.. نا.. وا نییە، هەموومان بەیەکەوە رۆیشتین، بەڵام من رێگام ونکردو یەکێتیش بۆسەیان بۆ دانامەوەو گرتمیان. ئێمە ببووینە دوو بەش. بەشێکمان رێمان برزکردو بەشێکیش ئاوابوون و چوونە ئێران.

**واتە پێشتر ئێوە نەتاندەزانی هێرشتان دەکرێتە سەر؟**

- نەء. نەماندەزانی هەتا کاغەزێکمان بۆ هات، ئاخر ئەوە زۆر دوورودرێژە، لەبەستی شەرغەوە هەتا دەگاتە رۆژی هێرشەکەی پشت ئاشان هەموو حکومەت رێکیخستبوو. جاسوسی حکومەت، نوێنەری

حکومەت لەناو یەکێتی ڕێکیانخستبوو، لەو بارەیەوە بەڵگەشمان هەیە، کە لە پاش ڕاپەڕین ئەو بەڵگەنامانەمان لە بینایەکانی موخابەرات چنگ کەوت، دەڵێ ئێمە ئەو شتانەمان ڕێکخست، ئەوەبوو لە بەستی شەرغەوە بۆسەیەکیان دانابوو، گوایا لە بۆ سۆسیالیستە، بەڵام ئێمە بەرکەوتین، وابزانم دوو شەهیدمان دا، ئینجا لیژنەیەکمان پێکهێنا کە لەو مەسەلەیە بکۆڵێتەوە، نە مام جەلال، نە ئێمەش بەو ڕێککەوتنە رازی نەبووین، کەس نازانێ چۆن بوو؟ ئەوە حکومەت دەستی تێدا هەبوو.

**بەڵگەکان ناوی کەسیان تێدا نییە کە بەو کارە هەڵسابن؟**

- نا، ناوەکان ئاشکرا ناکات.

**دەڵێن حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران زۆر هاوکاری یەکێتی کرد لە دژی ئێوە، ئەوە راستە؟**

- نەخێر، راست نییە. باشترین پەیوەندی لە نێوان ئێمەو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەبوو.

**لەکاتی ئەو شەڕانە هیچ هەڵوێستێکیان نیشان نەدا، چونکە ئەوان زۆر دۆستی یەکێتی بوون؟**

- ئەوان دژی ئەو شەڕەبوون، هەتا من کە چوومە لای مام جەلال، پاش گرتنەکەم، وەفدێکی باڵایان هات بۆ ئەوەی نابێ شتێکم لێ بکەن، دەبێ بە زووترین کات ئازادم بکەن.

**لەوکاتەی ئەمە روویدا، دەڵێن نەوشیروان لە دۆڵی خانەقابوو؟**

- نا، نەوشیروان راستەوخۆ سەرکردایەتی شەڕەکەی دەکرد، ئینجا

هەڵوێستێکی شۆڤینیانەشی هەبوو، ژن و پیاوە عەرەبەکانی دەکوشتن، کوردی نەدەکوشت، دواتر چووە دۆڵی خانەقا کە بپەڕێتەوە بۆ بالیسان لە پارتی و ئێمەو سۆسیالیست بدات.

**نەوشیروان لە کتێبەکەیدا دەڵێ مەفرەزەیەک ئەوی گرت و هێنایە لای من...**

- نا ئێمە چووینە دێیەک پێش ئەوەی بگەیتە ناودۆڵی خانەقا، بارەگایان لەوێ هەبوو، نەوشیروان لە پشتئاشان هاتە ئەوێ، لەوێوە بۆ بالیسان ڕۆیشت.

**نەیزانی تۆ گیراوی؟**

- نا، بەڵام مام جەلال دەیزانی من گیراوم، چونکە خەبەریان دا کە فلان کەسمان گرتووە.. ئێمە ١٠ کەس دەبووین، عەرەبیشمان لەگەڵ گیرابوو.

**لە سەرکردایەتی بەس جەنابت بوویت؟**

- سەرکردایەتی چی!! پەرت و بڵاوبووین، نەماندەزانی چی بکەین، خۆمان شاردەوە، هەتا ئەوان هاتن ئێمەیان گرت، بەڵام هەندێکیان دەرچوون و خۆیان رزگارکرد، ئێمەش ڕێمان لێ ون ببوو..

**کە ئێوەیان گرت هیچ شتێکی ناشیرینیان لەگەڵ نەکردن؟**

- نا، نا.. وڵاغێکیان بۆ هێنام، بەڵام سوارنەبووم، برادەرێکمان بەسووکی بریندار ببوو، ئەوم سوار کرد هەتا گەیشتینە ئەوان لە دۆڵی خانەقا.

**نەوشیروان لەوێ بوو؟**

- نا، هێشتا نەگەیشتبوو، ئینجا کە هات دەستیکرد بە ناورانەوە من پیاوێکی رۆشنبیرم چیم لەوەدایە بێم لەگەڵ تێکۆشەران و خەباتکەران شەڕ بکەم، منیش ئەوکات نەمدەزانی چی کردووە، چی نەکردووە، فەزاحەتەکەی دواتر زانیم.

**کە ئەو قسانەی کرد، تۆ هیچت پێ نەگوت؟**

- با، گوتم ئێوە هۆکاری سەرەکی ئەو شەڕەن، چونکە ئێمە لە مانگی دوازدە ئیتیفاقمان لەگەڵ مام جەلال کرد، کە خۆشت ئامادەبووی، کە پێویستە ئێمەو ئێوەو پارتی سێ قۆڵی کۆببینەوە، تا چ ناکۆکییەک هەیە، نەیهێڵین، ئەی بۆچی ئەو مەسەلەیە روویدا؟ لەسەر چ ئەساسێک واتان کرد، گوتی ئێمەتان لە بالیسان دەرکرد، حیزبی شیوعیش بەشداربووە، هەروەها دەیگوت ئێمە هاتین لە سۆسیالیست بدەین، بەڵام حزبی شیوعی لەگەڵ سۆسیالیست بوو، لەبەر ئەوە ئێوە تووشبوون.. بەڵام ئەو (نەوشیروان) بە جەماعەتی خۆی دەگوت برۆن پەرێزتان پاک بێ، واتە کەس قوتار نەکەن، هەموویان بکوژن.

**ئینجا لەوێوە چوویە لای مام جەلال؟**

- بەڵێ، مام جەلال گوتی من ئامادەم پێشوازی بکەم و بەرەو پیرمان هات، ئەوکاتە وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش هاتبوون، شەرەفکەندی هات، ئەوکاتە هێشتا قاسملو مابوو، ئیتر بەیەکەوە دانیشتین و دانیشتنەکەش لە دەرەوەی بارەگای مام جەلال بوو، دانیشتنێکی هاکەزایی بوو، ئینجا لەگەڵ مام جەلال بەیانێکمان

دەرکرد.

**ئەو بەیانە فشاری مام جەلالی تێدا نەبوو؟**

- نا.. من پێشنیارم کرد.. خەتای من بوو.. دەمویست ئەو شەڕە رابگیرێ، بەڵام حیزب لێم رازی نەبوون.

**حیزب گلەیی زۆری کرد.. ئەوکاتەش دانی بەو بەیانە نەنا، بەو پێیەی تۆ دیل بووی، دیلیش ناتوانێ بڕیاربدا؟**

- وابوو گوتیان دیلە.. گوتم بابە من دیل نیم، ئازادم.. سوودی نەبوو.

**لای مام جەلال هەستت نەدەکرد دیلی؟**

- نەء.. زۆر ئاسایی بوو.. دیلی چی؟! کە لەوێ گەڕامەوە بۆ ئەوەی شەڕی تۆڵەکردنەوەی حزبی شیوعی رابگرم، بەڵام کە چوومەوە لەگەڵ پارتی بڕیاردرابوو شەڕی دووەم دژی یەکێتی بکەین، بەڵام تازە دوای شەڕی شکست، چۆن دەتوانین شەڕی دیکە بکەینەوە، بۆیە لە شەڕی دووەمیش دۆڕاندمان، شەڕی دووەم بە سەرکردایەتی ئەبو حیکمەت و ئەبو..... بوو.

**کە گەڕایەوە حزب رەخنەیان لێنەگرتی؟**

- با، رەخنەیان لێگرتم، بەڵام من موقتەنیع نەبووم بەو رەخنەیە، دەمویست ئەو شەڕە رابوەستێ، ئەوەچییە ئێمە لەناو یەکتری، یەکتر بکوژین.

**لە سلێمانی مەلا بەختیارو بەهائەدین ئەحمەد کەم شەڕیان دەکرد، بۆ؟**

- نەیانکرد.. لەوێ پێکهاتبوون.

**ئەو پێکهاتنەی ئەوان چۆن بوو؟**

- پێکهاتنێکی دوو قۆڵی بوو، بەڵام لە قازانجی یەکێتی بوو، چونکە ئەو هێزەی سلێمانی نەدەهات بۆ یارمەتیدانمان، ئەو هێزە سڕکرا.

**باشە کە ئێوە بەرەی جودتان پێکهێنابوو، بۆچی سوسیالیست پێش ئێوە لەگەڵ یەکێتی ئاشتبووەوە، ئێوە ڕەخنەتان لێنەگرت؟**

- سوسیالیست دەیگوت پێکهاتنەکە بۆ ئەوەیە تووشی شەڕی شکست نەبین.

**ئەی دوای ئەوە پاسۆک کردی، دواتر مام جەلال چووە ئێران و لەگەڵ کاک مەسعود ڕێککەوتنیان کرد؟**

- نا.. کاک ئیدریس چووە بارەگای یەکێتی بۆ لای مام جەلال، ئەمەش لەوەوە هات کە ئەوکات سەدام گوتی کورد بەیەک شت رزگاریان دەبێ، ئەویش یەکبوونیانە، بەڵام من تەحەدایان دەکەم ئەگەر یەکبگرن، منیش گوتم کاک مەسعود با ئێمە تەحەدای سەدام بکەین و یەکبگرین، گوتی ئاخر چی لە یەکێتی بکەین، ئەو لەگەڵمان ڕێک ناکەوێ.. کاک ئیدریس گوتی ئەوان بۆمن لێگەڕێن.. ئیدی کاک ئیدریس بۆ لای مام جەلال ڕۆیشت و لەگەڵ خۆی بردیە ئێران، چونکە ئەوکات مام جەلال پەیوەندی لەگەڵ ئێران نەبوو، ئەوەبوو کە مام جەلالی برد لەگەڵ ئێران پێکیهێنانەوە، دوای ئەوە دەستکرا بە گەیشتنەیەک و تەفاروب. ئینجا مام جەلال دەستی کرد بە

پروپاگـەندەو دەیگوت با بەرەیەکی کـوردسـتـانی و ئۆتۆنۆمـیـەکی راستەقینە بۆ کوردستان دابمەزرێنین، ئینجا من نووسیم چ بەرەیەکی کوردستانی و چ ئۆتۆنۆمیەکمان دەوێ، مەقالەیەکی بەناوبانگەو بڵاویشم کردەوە. جا لەوەوە لەگەڵ ئێمەش پەیوەندی کرد. من نامەیەکم بۆ مام جەلال نووسی و لە رێگەی کاک عەلی عەبدوڵڵاوە بۆم نارد، لە نامەکە پێم گوت ئێستاش وەکو قوتابیە بچووک و بزێو و موخەربیەکەی جاران تەماشات دەکەم.. کاک عەلی گوتی کورە ئەوهای بۆ مەنووسە گوتم نا من دەماری دەزانم. ئینجا ئەو لە جوابێکی بۆ هاورێ عەزیز نووسیبووی، مامۆستایەکەم هێشتا بە منداڵم تێدەگا، ئێ من ئێستا وا لە عومری گۆرباتشۆفم.

**لە رەخساندنی مفاوەزاتی ساڵی ١٩٨٣و١٩٨٤ی نێوان یەکێتی و بەعس، حیزبی دیموکرات رۆڵێکی زۆری هەبوو حیزبی دیموکرات هەوڵی لەگەڵ ئێوەو سوسیالیستیش نەدا بۆ ئەو مەسەلەیە؟**

- لەگەڵ ئێمە هیچ هەوڵێکی نەدا، لەگەڵ سوسیالیستیش نازانم، چونکە سوسیالیست دوو سێ جار چوون بۆ لای حکومەت و لەگەڵ حکومەت دانیشتن بەبێ ئاگاداری کەس. من کاک مەسعودیشم ئاگادارکردەوەو پێم راگەیاند کە وەفدێکی سوسیالیست چوونەتە بەغدا.

**دوای ئەوەی یەکێتی لە گفتوگۆ کشایەوە، ئیتر بەرەبەرە لەگەڵ لایەنەکان ئاشتبووەوە، ئایا ئێوە کە بەرەی جودتان هەبوو، لایەنەکان هەرکەس بۆخۆی لەگەڵ یەکێتی رێک دەکەوت، یان پرسیان دەکرد؟**

- نا نا.. هەر هەنگاوێک بهاوێشترابا بۆ یەکتریمان باس دەکرد، بۆ نموونە ئێمە نامەیەکمان دەنووسی، یا وەفدێکمان بۆ لایەک دەنارد بە پارتیمان دەگوت، ئەویش بە هەمان شێوە.

**کێ لە سەرەتا هەنگاوی بۆ دروستکردنی بەرەی کوردستانی نا، چ وەک فکر، چ وەک کردار؟**

- یەکەم وەفد کاک ئیدریس بوو، چووە لای یەکێتی، چوو مام جەلالی بردە تاران، ئەوە رێی خۆشکرد، دواتر یەکێتی وەفدێکی چووە لای پارتی و مام جەلال باسی بەرەی کردو ئێمە وەلاممان دایەوە ئەوانە هەموو رێیان خۆشکرد، بەلام پارتی دەوری باشی هەبوو. ئینجا کە بڕیاردرا بەرە پێکبهێنرێ، کێ لەو بەرەیەدا بێ؟ نابێ پارتی گەل ئامادەبێ، پارتی دژی بوو!! نابێ زەحمەتکێش ئامادەبێ، سوسیالیست دژی بوو!! پارتی و یەکێتی و سوسیالیست و ئێمەو پاسۆک ماینەوەو ئەو پێنج حیزبە کۆبووینەوە، ئەوانیتر ئامادەنەبوون، ئەوەبوو هەرکەسە وەفدی خۆی پێکهێنا، وەفدی ئێمە من و ئەبوو حیکمەت و د. رەحیم عەجین بووین، وەفدی پارتی بە سەرکردایەتی کاک مەسعودو عەلی عەبدوللاو فرەنسۆ هەریری بوو، کاک نێچیریش وەکو گوێگر دەهات، وەفد نەبوو، ئەوکات زۆر گەنج بوو، هەندێکی دیکەشیان دەهاتن، چونکە گفتوگۆیەکە لە راژان بوو. وەفدی یەکێتیش فەرەیدون عەبدولقادر بوو، هی سوسیالیست رەسول مامەند بوو، ئەوەی پاسۆکم لە بیر نییە. ئینجا دەستمان بە موناقەشەکرد، دوو پرۆژە هەبوو، پرۆژەیەک هی ئێمەبوو، پرۆژەیەک هی یەکێتی بوو،

پرۆژەکەی ئێمە بووە ئەساس بۆ گفتوگۆ، هی یەکێتی وەک کرایەوە،
پرۆژەکەی ئێمە کە بەرنامەی بەرەی کوردستانی لەسەر پێکهات بە
پارتیشمان نیشان دابوو، ئەوان پێی رازی ببوون. دەمەوێ بڵێم لە
پێکهێنانی بەرەی کوردستانیدا کاک ئیدریس دەورێکی زۆر باشی
هەبوو، لە راستیدا کاک ئیدریس قیادەیەکی تەکتیکی باریع بوو، زۆر
باریع بوو.

**دوای راپەڕین زۆر کەسی فایلدار دەرچوون تەنانەت لە ئاستی سەرکردایەتی بوون، ئێوە کەسێکتان لەو ئاستە هەبوو فایلی هەبێ؟**

- نەخێر هیچ کەسمان نەبوو، لە ئاستی لیژنەی محەلیش نەمان بوو، تەنها لە ئاستی ئەندامان هەمانبوو.

**ئەوانەی لە ئاستی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی حزبەکان بوون، ئێوە لەگەڵتان باس نەدەکردن کە دەبێ ئەوانە نەمێنن؟**

- با، زۆرباسمان کرد، دەیانگوت ئەوە تازە بەعس کۆتایی پێهاتووەو نەمان و ئەوە حالەتێکی ترە..

**بەڵام دەورەکانیشیان لێ کەم نەکردنەوە؟**

- (بەبزەیەکەوە) هیچیان لێنەکردن. چیان لێ بکەین.

**قسە هەبوو کە ئەبو حیکمەت پەیوەندی هەبووە؟**

- نا، ئەبو حیکمەت لەگەڵ پارتی هەیبوو. هەر لەرێی پارتیشەوە لەگەڵ حکومەت هەیبوو، رەزامەندی لە پارتی وەردەگرت، ئینجا دەچوو لەگەڵیان کۆدەبووەوە، لەگەڵ موخابەرات کۆبووەوەو پارەشی لێ وەرگرتن.

**بارودۆخی ئێستای کوردستان چۆن دەبینن؟ گەشبینی، یان رەشبینی؟**

- ئینسان ئەگەر گەشبین نەبێ، کۆتایی پێ دێت، بەڵام شۆڕشگێڕ بەردەوام گەشبینە، بە راستی من بە پاشەڕۆژی کورد گەشبینم، جارێ لە سەرەتادایین، زۆرمان ماوە بگەینە ئەنجامێکی باش، بەنیسبەت خۆمان لەرووی عەمەلییەوە هەموو شتێکمان جێبەجێ کردووە، پەرلەمانمان هەیە، حکومەتمان هەیە، سەرۆکمان هەیە، ئیدارە لەژێردەستی خۆمانە، لەرووی دەستوورییەوە ئێستا مرخێش مرخێشمانە لەگەڵ تائیفەکان و شۆڤێنیەکان، خەتەری سەرەکی لەسەر عێراق و ئایندەی عێراق ئەوانەن، ئەوەی لەسەر شانی هێزە کوردستانیەکانە ئەوەیە دووبارە یەکبگرنەوەو بەرەیەکی کوردستانی پێک بهێنن. هەروەها بەرەیەکی عێراقی لەگەڵ هێزە دیموکراتییەکانی عێراقی ئەوانەی پشتگیری لە کێشەی کورد دەکەن پێک بێنین. لەسەرووی هەموویانەوە حیزبی شیوعی عێراقی، چونکە تاکە حیزبە پشتگیری لە کێشەی کورد دەکا، لە هەمانکاتدا حیزبی دیکەش هەن پشتگیری لە ئێمە دەکەن، بۆ نموونە جەماعەتی عەبدولئیلاهی بەسراوی کە حەرەکەی عەرەبی ئیشتراکییە، هەروەها عەرەبە لیبرالیەکانی وەکو حیزبی وەتەنی دیموکراتی کامل چادرچی، جەماعەتی پاچەچیش رەنگە لەگەڵمان بن، مەبەستم ئەوەیە بە دروستکردنی بەرەیەکی کوردستانی و هەروەها بەرەیەکی عێراقی لەگەڵ ئەو هێزانەی ناوم بردن، ئێمە سەردەکەوین.

**لەو بارەوە پرۆژەیەکتان هەیە؟**

- من وتارێکم داوەتە رۆژنامە، بە عەرەبی نووسیومە، بەڵام دەیکەنەوە کوردی (لا مفر من تحقيق الفيدرالية كحل للمسألة القومية الكردية) هیچ رێگایەکتان نییە غەیری ئەوەی دەبێ تەئیدی فیدرالی بکەن، گوتوومە لە سەرەتای حکومەتی عێراقەوە، یا لەو رۆژەی کوردستان بە عێراق لکێنراوە، هەتا ئێستا لە عێراق سەقامگیری نەبووە، چونکە کێشەی کورد چارەسەر نەکراوە.. میللەتی کورد دنیایەک قوربانی داوە تا بە ئەمڕۆ گەیشتووە، لەبەر ئەوە سەقامگیریشتان نابێ ئەگەر دان بە فیدرالیەتی کوردستان نەنێن، فیدرالیەتێک کە ئێوە بەشێوەیەکی شۆڤێنی تەفسیری دەکەن، ئەمە لای کورد مەفهوم نییە، ئێمە فیدرالی ئیداریمان ناوێ.

**ئەدی لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی باسی ئەو بەرەیەتان نەکردووە؟**

- با.. باسمان کردووە.

**رایان چۆنە؟**

- ئەوان ئێستا وەفدێکی هاوبەشیان لە هەموو حیزبە کوردستانیەکان لەگەڵ خۆ بردووە، کە ئەوە هەنگاوێکی باشە.

**لەو بەرەیەدا پێت باشە حیزبە ئیسلامیەکان بەشداربن کە زۆرجار دەگوترێ ئەو حیزبانە سەرچاوەی تیرۆرن لە کوردستان؟**

- کاتی خۆی وتارێکم دەربارەی ئیسلامی سیاسی نووسی، ئێستاش بڕوام بەو وتارە هەیە، چەند مەرجێکم دانابوو بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ هێزە ئیسلامیەکان، یەکەمیان ئەوەبوو، دەبێ

کوردایەتی بکەن، دووەمیان دیموکراتی بن؛ سێیەمیان بڕوایان بە گواستنەوەی دەسەڵات بەشێوەی ئاشتیانە هەبێ.. یەکگرتووی ئیسلامی وەڵامی دایەوە گوتی ئەو خاڵانەمان قبوڵە. نابێ ئێمەش لە دەستیان بدەین، دەبێ هاوکاریان لەگەڵ بکەین، هەر هێزێکی دیکەی ئیسلامی بڕوای بەو خاڵانە هەبێ هاوکاری لەگەڵ دەکەین، بەڵام ئەگەر بوونە سەرچاوەیەک بۆ تیرۆر ئەوە نەک هاوکاریان لەگەڵ ناکرێ، بەڵکو ناشبێ هەروا بە ئاسانی بەسەریاندا تێپەڕێ و حیسابیان لەگەڵ نەکرێ.

**ئەو نوێنەرانەی حیزبی شیوعی ناردونیەتە پەرلەمان هیچیان هەولێری نین، بۆ؟**

- ئێمە سێ کەسمان هەیە، مەبەستت ئەوەیە دابەشیان کردبێ بەسەر شارەکاندا، واتە جوگرافیا لە بەرچاوبگرن؟.

**بەڵێ!**

- بە پێکەنینەوە ئێ نەیانکرد، چی بکەین؟

سەید کاکە :

# ئەو خەڵکەی لەناو سۆسیالیست ببوونە مارکسی، لەگەڵ من ناڕێک بوون



سەید کاکە کەسایەتیەکی دیارو جەربەزەی نێو بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی گەلەکەمانە، رەنگە لەنێو ئەو چەند کەسە لە ژمارە کەم و لە بەرگری بێ وێنەیە بێ کە گوللەکانیان دەتەقاند لە بەرامبەر حکومەتی ئەوساکە، بەرکوڵی شۆڕشێکی نەپساوەو درێژخایەنی میللەتێک بووبن.

بۆیە یەکەمین گوللەو پێکدادانی نێوان خەڵک و حکومەت، سەید کاکە یەکێک بووە لەو خەڵکەی کە چەقیوەو، رۆحی بەرەنگاربوونەوەو سەنگەر قایمکردنی هەبووە، ئیتر بەدرێژایی ئەو مێژووە درێژە کە چەند رۆژێک بەر لەسەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول دەستپێدەکات، پێشمەرگەیەک بووە لە بەرامبەر حکومەتی قاسم و تا نسکۆی ۱۹۷٥ بەشداری لە دەیان چالاکی پێشمەرگە کردووەو زۆرجاریش رۆڵی فەرماندەیی بینیوە، بەڵام سەید کاکە هێشتا نەبوویبووە ئەو ناوەی کە ئەمڕۆ گەلی کورد دەیناسێ، بەڵکو لە دوای نسکۆی ۱۹۷٥ سەید کاکە رۆڵێکی زۆر گرنگی بینی و لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ بوو، ئەگەرچی کاتێک چاوێک بە مێژووی خەباتی نەپساوەی سەید کاکە دەخشێنیت، دەبینین هەموو ژیانی بریتی بووە لە هەڵاتن و بەرەنگاربوونەوەو گوزەرەشاندن، ژیانێکی پڕ لە جەربەزەیی بردۆتە سەر، لەو کونە بەردەوە بۆ ئەو کونە شاخ، لەم لوتکەوە بۆ ئەو دۆڵ، لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند، دیمەنی خەباتی سەید کاکە، دیمەنی پێشمەرگەیەکی .

زۆر ماندووه، زۆرترین ئازاریشی بەدەستی سەردەمی ناکۆکی و دوویەرەکی نێوان حزبە سیاسیەکانی کوردستان بووە لە شاخ.

ئێستا دەکرێ زۆر شت لە سەید کاکە بزانین، چونکە ئەزموونێکی زۆر دەوڵەمەندی لە شاخ هەبووە، ئێمە بەپێویستمانزانی دیمانەیەکی تێروتەسەلی لەگەڵدا بکەین، چونکە ژیانی ئەو، زانیاریەکانی ئەو، بەشێکن لە مێژووی گەلەکەمان، بۆیە بە پێویستمان زانی بیدوێنین و زۆر پرسی گرنگ و مێژوویی بورووژێنین کە تا ئەمڕۆش یەکلا نەبوونەتەوە.

**لە ساڵی چەند بووی بە پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول؟**

- لە ٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ بووەمە پێشمەرگە، ئێمە لە شێراوە بووین، حیزب فەرمانی دەرکرد وەک مانگرتنێک رێگاکان بگرین و نەهێڵین حکومەت هاتوچۆ بکات، سەید عزەدین و کوڕێکی دی ناوی (نوری) بوو، سەرکردایەتی مانگرتنەکەیان دەکرد، خۆی بڕیاربوو مانگرتنەکە سەعاتێک بخایەنێ، بەڵام ئەوان کردیانە ٨-٩ سەعات، سەرەتا چەند فرۆکەیەک هاتن، بەڵام لێیان نەدائین، بۆ ئێوارەکەی هێزێکی زۆر هاتن کە ٩ لۆری پڕ سەربازبوو، ئەو هێزە لە دووری ئێمە لە لۆریەکانیان دابەزین و هێرشیان بۆ هێناین، من هەندێک لەوانی دیکە زیاتر شارەزای شەڕ بووم، گوتم کاکە بائێرە بەجێبێلین، بەو کۆنە

تفەنگانەی ئێمە ئەو هێزە ناشکێ، گوتیان ئێمە بەناوی موزاهەرە هاتووین، گوتم کورە موزاهەرەی چی و حاڵی چی بابڕۆین، ئەگەر ئەوان مەیدانی شەڕیان خواست و هاتنە پێش!؟ ئەوەبوو خەڵکەک ڕۆیشتن، هەشت نۆیەک ماینەوە لە دوای ئەوان دەڕۆیشتین، پۆلیس گەیشتە سەرمان، منیش بە سەید عیزەدینم گوت، پێیان بڵێ ئێمە بۆ شەڕ نەهاتبووین، بۆ (ئیزراب) هاتبووین، ئەویش گەڕاوە ئاوهای پێگوتن، کەچی گوتیان تفەنگەکانتان دانێن سەگبابینە!

دایانگرتین وەک ئاخیر زەمان، قەت گوێم لە تەقەی ئاوها نەبووە. ئەوکات پۆلیس چەکی رووسییان وەرگرتبوو، نازانم فیشەکەکان فەرقیان هەبوو، یان نا، چونکە کە بە زەوی دەکەوتن دووجار دەتەقیەوە، ئێمە ۱۰-۱۲ کەس شەڕمانکرد، دوایی باش بوو ڕۆژمان بەسەردا ئاوابوو، دەنا کەس قورتار نەدەبوو، وابزانم لەوان یەکێک بریندارببوو، بەڵام ئێمە سەلامەت دەرچووین.

**بەپێی بیرەوەرییەکانت، منداڵێکی بزێوو ئازانەبووی، غەدرێکی زۆریشت لێکراوە، ئایا ئەو غەدرانە وایکرد ببیە پێشمەرگە، یان هەر هەستێکی نیشتمانیانەت هەبووە؟**

- وەڵڵاهی لە منداڵیش فەقیر نەبووم، غەدرەکەش ئەوەبوو، گوندەکەمان دوو بەرە باب بوون، ئەو دوو بەرەبابە شەڕیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، ئێمەش یەک ماڵە سەید بووین، بچووبامایە هەر لایەک، ئەوەیدیکە وایدەزانی لە دژی ئەوم، بە هەردوولا دەیانوبست غەدرم لێ بکەن، منیش تخونیان نەدەکەوتم.

**تۆ ئەوەندە ساڵە پێشمەرگەبووی و ناوێکی دیاریش بووی لە دەشتی هەولێر، ئەو کاتانەش لە دەشتی هەولێر ئاغا تارادەیەک حوکمیان مابوو، نەمانزانی رۆژێک تۆ ئاغایەکت ئازاردابێ، یان حەپست کردبن.. بۆچی؟**

- خۆی ئاغا سێ قۆناغە، خەڵک ئەوە نازانێ، لە قۆناغێکدا عەدالەتیان هەبووە، پێش پەیدابوونی دەڕاسەو تراکتۆر، ئاغا حاکمی عەدالەتی گوند بوون، خەڵک بەهۆی ئەوانەوە دەژیان، کە تراکتۆرو دەراسە پەیدابوون، گەنم بووە دوو هەزار دینار، ئەوانە غروربوون و منداڵەکانیان پێگەیشتن و زۆر گوێیان بە باوەکانیان نەدەدا، ئەوانە دیکتاتۆر بوون، زوڵمی وایان دەکرد لە قەوام دانەبوو، زوڵمێک کە لە مێژوودا زوڵمی وانەبووە، هێندێکی هەر ناگوترێ، تەبیعی ئێمە لەو قۆناغە لێیان بەجواب هاتین و توانیشمان سەرکەوین، تاقمەی دزان بەسەریاندا سەرکەوتین، من یەکەم جار لەگەڵ حیزبی شیوعی بووم، بەڵام لەگەڵ دزەکانیش دۆستایەتیم هەبوو.

**مەبەستم ئەوەبوو لەکاتی پێشمەرگایەتیت لە شۆڕشی ئەیلول و پاشتریش لە دوو ئاغات نەدا؟**

- ئاخر ئاغا نەما..

**- بەس پێشتر زوڵمیان کردبوو؟**

- نا، تۆڵەکردنەوە خراپە.

**باشە تۆ قەت بڕوات بە مارکسیەت نەبووە، چۆن لە حیزبی شیوعی بوویت؟**

- ئاخر من دژی زوڵمی ئاغا بووم.

**هەڵوێستت لە بەرامبەر نسکۆی شۆڕشی ئەیلول چی بوو؟**

- باوەڕم بە بارزانی هەبوو، ئەوەی ئەو بڵێ ئەو راستە، لەبەر ئەوەی قەناعەتم وابوو ئەو شتی غەڵەت ناکات.

**تۆ کە رۆڵێکی زۆر دیارت لەناو بزوتنەوەی سۆشالیستی کوردستان هەبوو، یەکەمجار کێ فیکرەی دروستکردنی بزووتنەوەی سوسیالیستی دانا؟**

- من ئەوکات لە سەرکردایەتی نەبووم، خوا لێیان خۆشبێ شەهید عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید ئەو فیکرەیان هەبوو کە حیزبێکی نوێ دوور لە پارتی و یەکێتی دروست بکەن.

**ئەی بۆچی عومەر دەبابە چووە سوریا بۆ لای مام جەلال؟**

- حکومەت ناردی.

**پێش ئەوەی بڕوات لەگەڵ ئێوە راوێژی نەکرد؟**

- من نازانم، چونکە ئەوکات من سەرکردە نەبووم، ئەویش لەگەڵ سەرکردەکان کۆببووەوە، بەڵام کە هاتەوە پێیگوتین مام جەلال گوتویەتی وەرنەدەرەوە، من چەکم لە لیبیاو سوریا وەرگرتووە.

**باشە ئێوە بەنیاز بوون حیزبێک دروست بکەن، دوور لە پارتی و باڵی مام جەلال بێ، ئەی چۆن بە فەرمانی مام جەلال چوونەوە چیا؟**

- قەیدیناکە، خۆ ئێمە هەر دەچووین، بەس ئەو پاڵپشتیەک بوو کە چەکمان دەداتێ.

**بەڵام مەرجیشی هەبوو...**

- من نازانم، ئەگەر لەگەڵ عومەر دەبابە هەیبووبێ، بەڵام ئەوە بەئێمە نەگوترا، تەنها گوتیان ئەو چەکمان دەداتێ.

**بەڵام گوتبووی دەبێ من ببمە سکرتێر؟**

- نەء، ئەو وەختی نەبوو.

**دواتر مام جەلال ئەو داوایەی کرد؟**

- بەڵێ لە مانگی ٩ی ساڵی ١٩٧٧ ئەو داوایەی کرد. ئێمە سەرەتا کاغەزمان بۆ کاک مەسعودو کاک ئیدریس نارد، گوتیان د. کەمال کەرکوکی ببینن، ئێمەش د. کەمالمان نەدەناسی، ناچاربووین پەیوەندی بە مام جەلال بکەین بۆ ئەوەی هاوکاریمان بکات، نەک سەرکردایەتیمان بکات، مام جەلالیش جارەک کەریم خانی ناردبوو، شەهید سەعدی و دکتۆر خالید گوتیان ١٥٠٠ دیناری داینێ، ئەوان بەمنیان گوت، من نازانم.

ئینجا لە پاش ساڵێک و هەندێک، مام جەلال کاغەزێکی نووسی دەڵێ من بەو مەرجە دێمەوە، هەموو لەسەر دەستەکانی بزووتنەوەو کۆمەڵە ئیمزا بکەن کە من سکرتێر بم. ئێمە لە مەلەکان بووین، سەعدی گچکەبوو، قادر عەزیز بوو، حاجی حاجی برایم بوو، گوتیان وەڵڵا کاک سەید ئێمە هەموو ئیمزامان کردووە، کە مام جەلال بێتەوە، پێمان ناکرێ، ئەو چەکی پەیداکردووەو پارەمان دەداتێ و شۆڕش بە رووت و قووتی ناکرێ، تۆ رات چییە؟ گوتم من رام نییە، بەڵام شەڕیشی لەگەڵ ناکەم، چونکە ئێوە هەمووتان رەئیتان دایەو منیش

بەتەنیا نەلەکوردستان دەچمە دەرێ، نەشتەرێشی لەگەڵ دەکەم، بەلام ئەگەر رەئی من وەردەگرن، رایەکم هەیە: گوتیان بنووسە، گوتم وەڵلاهی لە ساڵی ١٩٦٦ چەندێت بۆ کوزد کرد، ئەوجا رەش دەعواکردنەکەت هەر لەوە دەوەشێتەوە، من رازی نیم کە دێیەوە، بەلام خۆ کوردستان بەس هی من نییە، هی تۆشە، مادام برادەران بۆیان ئیمزاکردی فەرموو وەرەوە، بەلام بەرەئی من بێت نایەوە، لەبەر ئەوەی لەجیاتی شتمان بۆ بکەی، کێشەمان بۆ دروست دەکەی. من کاغەزەکەم دا دەست حاجی حاجی برایم، حەزدەکەم لێشی بپرسن و لە قادر عەزیزیش بپرسن.

**باشە بۆ بیرتان نەکردەوە لە ناوخۆتان سکرتێرەک هەڵبژێرن؟**

- کەس توانای نەبوو.

**ئەدی کۆمەڵە خۆ سکرتێری خۆی هەبوو، بۆ خۆی تەسلیم کرد؟**

- درۆ دەکەن، ئەوان سەر بە مام جەلال بوون، مام جەلال لەو کاتەی هاتە ناو شۆڕش لە دوای بەیانی ١١ی ئازار، دروستیکردن.

**سەرەتای ململانێ کە رێگای خۆشکرد بۆ ئاژاوەو شەڕی ناوخۆ لە بەینی د. خالیدو عەبدوڵلا پشدەری بووە، ئەو ململانێیە لەسەر چی بوو؟**

- شتی وانەبووە، ئەوەی تۆی وا تێگەیاندووە غەلەت بووە، عەبدوڵلا پشدەری ئامیر هێزێکی فەقیر بووە.

**دکتۆر خالید زیاتر دۆستایەتی لەگەڵ مام جەلال هەبوو؟**

- راستە، بەڵام کێشەو موشکیلەکانی پەیوەندییان بەو دووانە نەبوو.

**مەلا بەختیار کە لە ساڵی ١٩٧٧ لەگەڵ مام جەلال گەڕایەوە، هاتە دەشتی هەولێرو خۆشناوەتی، بۆچی هاتە ئەو شوێنانە؟**

- وەڵڵاهی ئەوە نازانم، سیاسەتی خۆیان بوو، بەڵام مەلا بەختیار کوڕێکی ئازاو خۆراگربوو، بەس لەگەڵ فکرەی ئێمە نەدەگونجا، ئێمە زۆر لەگەڵی ڕێک نەبووین لەبەر ئەوەی هەڵسوکەوتەکانی لە دەشتی هەولێر زۆر بەدڵی ئێمە نەبوون، بەردەوام زەمی کاک عەلی شەعبانی دەکرد، یان زەمی شۆڕشی ئەیلولی دەکرد، ئێمەش قبوڵمان نەدەکرد، هێسترێکی لە کابرایەکی ستاندبوو، چل ڕۆژبوو نەیدابووەوە، ئێمەش گوتمان کاکە تۆ نە شۆڕش دەزانی، نەقسان دەزانی، ئەو خەڵکەشمان لێ توورە دەکەی، تۆ کتێبێکی سورت لەبن هەنگڵی ناوە، چل شەوە هێستری ئەو کابرایەت بردووە، ئێ ئەو کابرایە لە فەلاحەتی کەوت، لە ژیان کەوت، خۆ دەبێ ئەو هێسترە ئەو پیاوە بژیێنێ، ئەوە غەلەتەو پێمان خۆشە بڕۆی، گوتی بەسەرچاو، ئێمەش ڕەوانمانکرد.

**لەو شەڕەی کە سەعدی گچکە تێیدا شەهید بوو، ئێوە پێنج بریندارتان هەبوو، بەڵام تەسلیمی حکومەت کران، ئەوە چۆن بوو؟**

- بەڕاستی کاک سەعدی پیاوێکی ئازابوو، لەو شەڕەدا ئەو هەندێک نەخۆش بوو، من سەرپەرشتی شەڕەکەم کرد، کاک قادریش نەخۆش بوو، کە بەسەرکەوتین لە شاخەکە بەجێمان هێشت، شەڕەکە دەوامی کرد، هەشت تەیارە هاتن، ویستیان لەناو ئێمە بنیشن، گوتم

کوڕە لێیان مەدەن بابنیشنەوە، بەڵام لێنەگەڕان لە ئاسمانێ لێیاندان، قائید فەیلەقیش دانی بەوەداناوەو دەڵێ لەناو تەیارەکان هەر هەشت فرۆکەوانمان بریندارابوون و دوو فرۆکەشمان لە کەڵک کەوتن، بەڵام پڕی عەسکەربوو، زۆربەیان کوژران و لەناوچوون و شەڕ دەوامی کرد، چەند بریندارێکمان هەبوو، قادر عەزیز لەپشت من لەناو کونە بەردان بوون، ئومێدیان بەمن هەبوو کە بەجێیان ناهێڵم، هەستام لەگەڵ کوڕێک بەناوی کەریم بریندارەکانم ناردە خوارەوە لای کاک قادر کە ئەو لە خوارەوە بوو، ئەوانیش بەلای کاک قادر داچووبوون، کاک قادریش نەیگێڕابوونەوە تاچووبوونە ناو هێزی عەسکەری.

**ئەو دەمیزانی هێزی عەسکەری لەوێ هەنە؟**

- بەڵێ، ئەو بۆ خۆی لە عەسردا کەوتبووە شەڕ، کوڕێکم بەناوی رەشید بەهاوار بۆ نارد گوتم نەوەک تەنگاو بووبێ، رەشید گوتی کە چوومە لای کاک قادر هیچ تەقەی نەکردبوو، گوتم فیشەکم کەم ماوە، کاک قادر گوتی من فیشەکم هەمووی ماوە، دوو مەخزەن فیشەکی پێدام، گوتی هێندێک تەقەمانکرد، بریندارەکان بەلای ئێمە داهاتن.. دیارە نەیانگێڕانەوەو چوونە ناو عەسکەری عێراق.

**لە ساڵی ١٩٧٧- ١٩٧٨ رەسوڵ مەمەند پێگەی لەناو حیزب چ بوو، ساڵح یوسفی سکرتێر بوو؟**

- ساڵح یوسفیمان لە کۆنگرە لادا، پێش ئەوە رەسوڵ مەمەند سکرتێر نەبوو.

**ئێوە ناوتان لەخۆ نابوو بزووتنەوەی سوسیالیستی یەککگرتوی**

**کوردستان، رەسوڵ مەمەندیش کابرایەکی عەشایەربوو، ئێوە لەسەر چ ئەساسێک ئەوتان کردە سکرتێر؟**

- رەسوڵ مەمەند کابرایەکی پارێزەر بوو، عەشایەر نەبوو، زۆریش ئازابوو، ئینسانەکی زۆر حیزبی و سەرکردەبوو، خاوەن هەڵوێست بوو، ساڵح یوسفی توانای نەمابوو، حیزبی دیموکراتمان نارد تابێتە دەرێ، بەڵام توانای نەبوو بێتە دەرێ، لەبەر ئەوە ناچاربووین سکرتێرێک دابنێین داوامان لە دکتۆر مەحمود کرد، بەڵام خۆی هەڵنەبژارد، رەسوڵ مەمەند بووە سکرتێر.

**ئەی کە خۆی هەڵنەبژارد، بۆچی ململانێ لە نێوان دکتۆر مەحمودو رەسوڵ مەمەند دروست بوو؟**

- ململانێیەکە زۆر نەبوو، بەڵام شتێکیان لەنێوان دروست ببوو، ئەویش خەڵک لەبەینی ئەو دوو کەسە دروستیدەکردن، دکتۆر مەحمود تەبیعەتێکی هەیە، ئەگەر ئەقلی یەکێک نەگرێ لەناو مەجلیس باسی دەکا. یەکێک کەموکوڕیەکی هەبوایە، باسی دەکرد، ئەوەبوو کێشەکان، ئەگینا ئەگەر دکتۆر خۆی هەڵبژاردبووایە، لەوانەبوو ...بچووبایە.

**دکتۆر خالیدو ئەوانی دیکەش خۆیان هەڵنەبژارد؟**

- نا، دکتۆر خالیدو ئەوان سەرکردە بوون، کە چوونە هەکاری سەرکردایەتی کاتی کاک سامی لەوێ بوو، نازانم بە چ تەوجیهێک بوو، ئێمە ٤٠کم لەناو خاکی تورکیا بووین، هاتنە سەرمان، شەڕمان لەگەڵ کردن، دوو کەسیان کوژرا، دووشیان بەدیل گیرا، هەر ئەوەندە

شەڕەیان کردو شکان، بەڵام عەشائیری کوردی تورکیا کە مام جەلال دەیگوت لەگەڵ ئێمە بوون، هەمووی لەگەڵ پارتی بوون، هاتن دەورەیان لێداین، ئەوەی لێمان کوژرا، هەمووی خەڵکی گوندەکانی کوردستانی تورکیا کوشتیانن، بەڵام لەوانیش کوژران.

**راستە ئەوکات سەرکردایەتی کاتی بەهۆی دوورییان زۆر لە ژێر کۆنترۆڵی ماڵی بارزانی نەبوون، هەندێک شت دەکرا ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، بۆ نموونە دەڵێن شەڕی هەکاری بەخواستی ئەوان نەبوو، زیاتر خەڵکێکی دیکە پێی هەڵسا؟**

- ئەوەی من دەزانم، کاغەزێکی د. کەمال کەرکوکیمان پێگەیشت، دەڵێ ئێوە ئەگەر بۆ تفەنگ دەچوون بهاتبان لەگەڵ ئێمە قسەتان بکردبا، ئێمە خاوەن شۆڕشین، ئێوە بە قسەی ئیدریس هاتوونە، (کاغەزەکەم لاماوە). هەڵبەت شەڕەکە کرا، دکتۆر خالیدو جەماعەتەکەی بەلایەکدا رۆیشتن، من بەو سیفەتەی لەماڵی مەلا مستەفا نزیک بووم، دۆستی سەرکردایەتی کاتی بووم، هەر لەو وەختیەوە بەربەرەکانێی جەلالیم دەکرد، بەینم لەگەڵیان ناخۆش بوو، بۆیە گوتم دەچمە لای مستەفا نێروەیی، لە رێگا کوردەکانی تورکیا تووشم بوون، من تفەنگم پێ نەبوو، لای جەماعەت بوو، تەنها لەکاتی شەڕ تفەنگم هەڵدەگرت، گوتیان خاڵە زەحمەت نەبێ، ئەو تفەنگانەمان بدەنێ، لەگەڵتان دێین دەتانبەینە لای مستەفا نێروەیی، منیش هێندێک بێ تاقەت ببووم، گوتم وڵاغم بۆ پەیدا بکەن، دوایی کە تفەنگەکانمان دانێ، نەک هەر وڵاغیان بۆ پەیدا نەکردین، بەڵکو

ئەزیەتیشیان داین، کە گەیشتینە ئەوێ، لەوێ ڕێزی منیان گرت و خزمەتیان کردم.

**بۆ تۆ بەدیل نەگیرابووی؟**

- نەخێر بۆ خۆم چووم، لە کتێبەکەم نووسیتم، ئەگەر وانییە، باوەڵامیان دابامەوە، کەچی ئەوان گوتیان پاش ١٠ ڕۆژی دیکە بەرت دەدەین، من پێمگوتن خۆمنتان نەگرتووە، من خۆم هاتوومە، ئەوە بوو شەوێک هەڵاتم، برادەرەکم لەگەڵ خۆم هێنا، زۆر برادەری مام جەلال بوو، ناوی قادر ئاغای پشدەری بوو، مەلەوان بوو، ڕووباری شینمان لە پێش بوو، بۆ ئەوەی ئەو لەو ڕووبارە ڕزگارم بکا بەڕاستی پیاوێکی ئازابوو، تەنها ئەو وێرا لەگەڵم بێ، بەبرادەرانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانم گوت، کەسیان نەوێران لەگەڵم بێن، گوتیان خوا بکەم تۆ ڕزگار بی، ئێمە ناوێرین بێین، منیش هەڵاتم. من نەگیرابووم و نا ئەوانیش بڵێن بەرت نادەین، قەت ئەوەم قبوڵ نییە.

**لەناو سەرکردایەتی بزووتنەوە دەستێک نەبوو کە پەیوەندی لەگەڵ مام جەلال زۆر بەهێز بێ و بزووتنەوە تەسلیم بە یەکێتی بکا؟**

- نەخێر کەسی وا نەبوو، د. خالیدو کاک عەلی عەسکەری خۆشیاندەویست.

**کە شەڕی ناوخۆ دەستیپێکرد بەتایبەتی لە نێوان ئێوەو یەکێتی، ئەوەی کە زۆر دژی شەڕەکە بوو کێ بوون، چ لەناو ئێوە، چ لەناو یەکێتی؟**

- سۆسیالیست هەمووی دژی شەڕەکە بوون، کەسیش قبوڵی نەبوو شەڕ بکرێ، تەوجیهاتی حیزب و کاک ڕەسوڵیش وابوو، دەیانگوت کەی لێیاندان، ئینجا لێیان بدەنەوە، ئەوەش لە دنیادا شتی وەها نییە، من ئەوەم قبوڵ نەکرد، ئەگەرنا من لە هەموویان زیاتر دژی شەڕبووم.

**وابزانم لە هەموانیش زیاتر شەڕمکەت دەکرد؟**

- شەڕەکە هەز من دەمکرد، چونکە قەت قبوڵم نەدەکرد، ئەو بێ لە من بداو زەلیلم بکا، جارێک کەوتمە دوایان گەرەدێ و یاخسەمەرو سەرگەلوو ئەوانەم هەموو لێگرتن، لەکاتی گەڕانەوەمان لە هەوارە بەرزە هێزی گەرمیانیان هێنا، لەو شەڕەش چەند کەسێکیان کوژرا، ئێمەش بە سەلامەتی گەڕاینەوەو ئەوانیشمان شکاند.

**ڕاستە فوئاد مەعسوم و مەلا بەختیارو عومەر شێخ موس حەزیان لە شەڕ بوو، بەڵام سالار عەزیزو ئەوانی دیکە دژ بوون؟**

- کۆمەڵە پێی خۆش نەبوو، مەلا بەختیارو سالارو نەوشیروان و بەکری حاجی سەفەرو ئەوانە پێیان خۆش نەبوو، مام جەلال و عومەر شێخ موس و فؤاد مەعسوم لەگەڵ شەڕبوون.

**حەمەی حاجی مەحمود تاساڵی ۱۹۸۰ لەگەڵ یەکێتی بوو، بۆچی لە یەکێتی جیابوویەوە، دواتر بۆ سۆسیالیستی هەڵبژارد؟**

- ئاخر هەڕەشەی کوشتن و لێدانیان کرد، ئامۆزایەکەشیان گرت، هەڵات هاتە لای ئێمە لەناو زەنگ. کۆمەڵە لەگەڵی نارێک بوون، ئەو کوڕێکی ئازابوو، حەزی لەسەربەخۆیی بوو، ئیدی کەوتنە دوای،

ئەویش هاتە لای ئێمە. ئیدی ئامۆزایەکەی لەوێ گیرا، دوایی بەریاندا.

**راستە دەڵێن حیزبی شیوعی کەیفیان بەتۆ نەدەهات دەیانگوت تۆ کەسێکی راستڕەوی؟**

- ناوەڵڵا، بەڵام ئەو خەڵکەی لەناو سۆسیالیست ببوونە مارکسی، بڕێک لەگەڵ من نارێک بوون، دەنا من لە ئەساسەوە لەگەڵ حیزبی شیوعی رێکم، بەڵام ئەوان لەگەڵ من نارێک بوون، چونکە من لە کتێبەکەم عەیبی هەموو لایەکم باسکردووە، عەیبی ئەوانیشم باسکردووە، ئەوان دەڵێن نابێ عەیبی ئێمە باس بکەی، ئێ من عەیبی پارتیشم باسکردووە، وەختی خۆی وافێر کراوم، ناتوانم درۆ بۆ کەس بکەم.

**تۆ قەت تەئیدی بیری مارکسیەت و لینینیەتت کردووە؟**

- نەوەڵڵا.

**ئەی سۆسیالیست ناوەکەی ئیشتراکی بوو، تۆ چۆن لەگەڵیان بوویت؟**

- قەیدیناکە، کەس لای من باسی مارکس و لینینی نەدەکرد.

**بەس حیزبەکە بۆ خۆی مارکسی بوو، باسی سۆشیالیزمی عیلمی دەکرد؟**

- نا، هیچ نەبوو، بەشی ئەکسەریەت من بووم، ئەو بزووتنەوەیە ئەگەر من بەجێمهێشتبان تێکدەچوون، گوتیان تۆ بۆ خۆت چی دەڵێی بڵێ، ئێمە بۆیە وادەڵێین تا خەڵک حیسابێکمان بۆ بکا.

**لەو ماوەیەدا هەستت نەکرد ئەو حزبە سەرکردایەتیەکی رێکوپێکی نییە؟**

- سەرکردەی باشمان هەبوو، خەڵکێکی لەگەڵ بوو، دەیویست هەمووی رازی بکا، بەڵام هەندێ برادەری ناو سەرکردایەتی هەبوو، نەیاندەزانی ئیش بکەن، ئەگینا ئێرانیەکان هاتنەلامان گوتیان ئێمە پارتی و یەکێتیمان ناوێ، ئێمە ئێوە دەکەینە حیزب، بەڵام خۆ لە سنووری رووسیا نین، ئێوە لە سنووری دەوڵەتێکی ئیسلامین، ناوەکەی خۆتان لە سۆسیالیست بگۆڕن، چیتان دەوێ دەتاندەینێ، بەڵام قادر عەزیزو ماموّستا سەعدو ماموّستا ئەمین گوتیان ئەوە مەبدەئی نییە. ئێ ئەوانیش هیچیان نەداینێ. دوایی لایەنەکانی دیکە شتیان وەردەگرت، ئێمەش دەچووین لە پارتیمان وەردەگرت.

**هەتا لەناو سەرکردەکان کێشەو ململانێ هەبوو، ئایا سکرتێر نەدەبوو حەسمی ئەو ململانێیە بکا؟**

- موشکیلەمان ئەوە بوو، سکرتێرەکەمان نەیدەتوانی ئەو ململانێیە یەکلابکاتەوە.

**هەتا لەناو پێشمەرگەش هەر کەس بۆ خۆی لە هەرێمێک حوکمی دەکرد، بۆ نموونە قادر مستەفا لە دەشتی هەولێر، حەمەی حاجی مەحمود لە شارەزوور... هتد**

- حەمە ئیزنی لەمن وەرگرتبوو، لەبەر ئەوەی لە سەرکردایەتی نەیانویست هیچ شتێک لە ئێران وەربگرن.

**بۆ نموونە لە دەشتی هەولێر دەواجینانەو دەڕاسانەتان**

**وەردەگرت، سەرکردایەتی ئاگای لێ نەبوو؟**

- بەڵێ وەرمانگرتووە، بەڵام بە ئاگاداری من بوو، چونکە من بەرپرسی سەربازی بووم، نەدەژیاین چی بکەین!؟

**هیچیان دەدایە سەرکردایەتی، یان بۆ خۆیان بوو؟**

- ئێمە خوا خوامان بوو، خۆمان بژیەنین، بە دەرۆزە ئیدارەمان دەکرد، بەڵام ئێمە زۆر کەمتر لە یەکێتی شتمان وەردەگرت، ئەوەی حیزبەکان بەو میللەتەیان کردووە، بەعسیش هەر ئەوەندەی پێکردووە، بۆیە من جگە لە شۆڕشی ئەیلول، قەت ئیعترافم بەو شۆڕشەی دوایی نەکردووە.

**- لە کتێبەکەتدا وات دەرخستووە کە رات لە سەرکردایەتی کورد نییە، ئێستاش هەمان رات هەیە؟**

- بەڵێ، لە راستیدا من دەرویشی بارزانیمە، ئەو سیفەتەی مەلا مستەفا هەیبوو لەناو شۆڕشی ئێمەدا نەبوو، من ناتوانم تەئیدی شۆڕشێک بکەم کە ڕێبازەکەی، ڕێبازی بارزانی نییە، ئەوەی ئەمڕۆ هەیە هیچی لەسەر ڕێبازی بارزانی نییە، تەنها حەرفێکیشی لەسەر ئەو ڕێبازە نییە.

**پەیوەندی نێوان نەوشیروان وەک کەسێکی مارکسی لینینی، سوار ئاغا وەک سەرۆک عەشیرەت و جاش لەسەر چ ئەساسێک بوو؟**

- حەزدەکەم بزانیت نە کۆمەڵە مارکسی- لینینی بوو، نەسوسیالیست مارکسی- لینینی بوو، هەڵخەڵەتاندنی خەڵک بوو.

**ئەی چی بوون؟**

- قەومی بوون، ئێستا هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ پارتی نییە، من زیاتر شتم لەناو یەکێتی دیتوە کە خزمەتی ئاغاو دەرەبەگی کردووە، مارکسیەت وانییە.

**دەڵێن رەسوڵ مامەند زیاتر لە حیزبی شیوعی نێزیک بوو، نەک د. مەحموود؟**

- رەسوڵ مامەند دۆستایەتی حیزبی شیوعی هەبوو، بەس بەم دواییە نا، چونکە شتی لێ دیتن و بێ هەڵوێست بوون.

**دەڵێن شەهید حەمەی حەلاق، شەماڵی ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەو سەربازی یاریدەدەری کوشت؟**

- نەوەڵڵا، ئەوەی شەماڵی کوشت دەزانم کێیە، حەمەی حەلاق و جەماعەت هەر تەقەشیان نەکردبوو.

**لە سالانی ۱۹۷۹- ۱۹۸۳ حیزبی سوسیالیست بە تەنها دەچوون گفتوگۆیان دەکرد، لە کاتێکدا ئەندامی بەرەی جودبوون، بەلام پرسی بەجود نەدەکرد، ئەوکات هەڵوێستت چۆن بوو؟**

- یەک مفاوەزات کرا، ئەویش لە رێگای کاکە حەمەی حاجی مەحموود بوو، ئێمە زۆر پێی رازی نەبووین، ئیدانەشمان کرد. د. مەحمود بە ئاشکرا چووە بەغدا.

**مەبەستم ئەوەبوو بۆچی پرس بە حیزبەکان نەکرا؟**

- قەیدیناکە، ئێمە لەوێ بەناوی هەموو کوردستان قسەمان کرد، بەس بەناوی خۆمان قسەمان نەکردووە، ئێمە پێمانگوتن کە گفتوگۆ

دەکەین، خۆ گفتوگۆ شتێکی شەرعیە، کورد پێویستی بە گفتوگۆ بوو.

**ئێوە واتان دەبینی بە تەنیا دەتوانن حەقی کورد لە سەدام وەربگرن و حیزبەکانیش لە چیابن؟**

- کابرا بڵێ گفتوگۆم لەگەڵ بکەو حەقت دەدەمێ و ئەتۆ بڵێی ناچم، ناکرێ. ئەوان گوتیان بتانبینین بۆ کێشەی کورد، کە چووین لەوێ شتێکی دیکە بوو، گوتیان وەرن و چەک و فیشەکتان [illegible] بەخێوتان دەکەین، بەڵام شەڕ لەگەڵ ئەوانە [illegible] بکەن، هەڵبەت لە چوونەکە پرس بە مام جەلالیش کرا، ئەو گوتی باشە بڕۆن.

**وەفدەکەتان کێ بوو؟**

- دکتۆر مەحمود بە تەنیا بوو.

**عەدنان موفتیشی لەگەڵدا بوو؟**

- وابزانم.

**تۆ هیچ جار لەگەڵ نەبووی؟**

- نا.. بەس کە هاتبوونەوە، قائیدەکە برای سەدام بوو، بە دکتۆری گوتبوو پێم خۆشە سەید کاکەی لەگەڵ خۆت بێنی، ئەویش گوتبووی باشە، کۆبوونەوەیەکمان لەبارەی سەفەرەکەی کاک دکتۆر کرد، دکتۆر گوتی لەلایەن قائیدێکەوە تەکلیفێک کراوە کە سەید کاکە لەگەڵ خۆمان ببەین، ئەحمەد خانمان لەگەڵ بوو، ئامر هەرێم بوو، کوڕێکی زۆر جوان و کەشخە بوو، هەستایەوە گوتی من قایل نیم سەید کاکە ببەن. گوتیان بۆ؟ ئەوجا من زۆر ماندوو بووم، هیچم لێ نەمابۆوە، گوتی سەید کاکەی ببینن لێمان پەشیمان دەبنەوە، کاکە من ببەن بڵێن

ئەوە سـەید کـاکـەیە، کێ دەزانێ، بووە پێکەنین، نەمنیـان برد، نە ئەویش.

**لە سـاڵی ١٩٨٢ کە قـادر عـەزیز ئەندامی سـەرکردایەتی بوو، بۆچی سـووربوو لەسـەر ئەوەی کە هەر بچێتـە دەشتی هەولێرو ناچێتە هیچ جێیەکی دیکە؟**

- قادر عـەزیز گەنجێکی خوێن گەرم بوو، خۆڕاگر بوو، وایدەزانی ئەو مـسـتـەحـەقـ[illegible] تێـر بێ، نەک رەسـول مـامـەند، بیـری لە دروستکردنی ئینشقاق دەکردەوە، بوی[illegible]ست بێتە ناوچەی دەشتی هەولێر، بەڵام سەرنەکەوت، یەکێتی ئێمەو ئەوانیان د[illegible]

**لە سـالانی ١٩٨٢–١٩٨٣ خـۆپیشـاندان زۆر دەکـرا، دەڵێن ئەو قـوتابی و مـامـۆسـتـایانەی دەهـاتنە ناو شـۆڕش، تۆ زۆر پێیـان دڵخۆش نەبووی و دەتگوت نازانن تەقەی بکەن.. ئەوە راست بوو؟**

- نەخێر، گەنجێک دەهات، پێمانخۆشبـوو، دژی کـەسانێ نەزان بووم، ئێـمـە لەگـەڵ برادەرانی یەکـێـتی بەرەمـان هەبوو، رۆژێـک مـام جـەلال کـاک عـەلی نـاردە بەغـدا، لە جـادەی کـۆیە پەریمەوە، دەبینم ئەوانەی لەبەر تەیارە لەبن بەرد نەدەهاتنە دەرەوە، دەسـتـیـان بەشـایی کـردبوو، منیـش گـوتم ئەو شـاییـە چیـیـە؟ گـوتیـان عـەلی عـەسکەری چووەتە بەغدا، هیچیان نەداوەتێ و مفاوەزاتەکە پووچەڵ بووەوە، گوتم ئێوە دژی گفتـوگۆن، گوتیان بەڵێ، ئێ چیان پێ بڵێم، گەنجن. یەکیان ناوی سامـانە درێژ بوو، یەکیان ناوی سەعدی بوو، یەکـێکیش ناوی د. عـەبدوڵلا بوو، ئەگـەر قـسـەیەکم پێ بگوتبـان رەنگە لەلای مـام

جەلال شکایەت بکەن، زۆریشیان لێ تورە بوومە، هەستاین چووینە بانی ماران، شەختە بوو، دەبووایە لە سێ چوار جێیان لە بەستی شەرغە بدەین، من ولاغم پێ بوو، جەماعەتی ئێمەش شارەزاو قایم بوون، ئەوەی لاواز بوو، یەک یەکم لە پشتە خۆم سوار کرد، لاوازەکانم بە پشتی ولاغ پەڕاندەوە، گوتمە گەنجەکان، ئێوە گەنجن بپەڕنەوە، دوایی شەوێ دیسان هەمووم لەوبەری بەناو ئاوێدا هێنانەوە، تە سامانە درێژ نەبێ، ئەوانیتر هەموویان تەسلیم بوون سێ کاکە مادام ئەوەت پێ ناکرێ، بۆ دژی مفاوەزات نەزانن نەزان، یان دەچوون لە مزگەوتان دژی مزگەوت ...یان دەکرد.

**پێدەچێ لەگەڵ مە... حتیار پەیوەندیت باش نەبووبێ وەک لە کتێبەکەش... ردەکەوێ، بۆچی؟**

– هەندێک شتی خراپی کرد، بۆیە لێی تووڕەبووم، ئەگینا کە هاتە دەرێ مرۆڤێکی خۆڕاگرو شۆڕشگێڕ بوو.

**مام سەید هەموو ساڵێ کە یادی شەڕی کۆڕێ دەکرێتەوە، هەریەک لە حیزبەکان خۆی دەکاتە خاوەنی.. ئەوەندەی تۆ ئاگادار بی، ئەوانەی زیاتر دەوریان لە شەڕەکە هەبوو کێ بوون؟**

– رەسول مامەند، بەرپرسی رێگای هەیبەت سوڵتان بوو. یەکێتیش لای ئەزمەڕیان پێ سپێردرابوو. ئەو رێیەش، واتە رێی هەولێر- سۆران بە کاک مەسعود سپێردرابوو، بە حەقیقەت لەو رێگایە بارزانییەکان بەجدی خۆیان ئامادەکردبوو، بەڵام کە ئێمە لە مەسیف شکاین، بەس بارزانییەکان لەوێ مانەوە، کەسی دی لێ

نەما. هێزی حکومەتیش دوابەدوای ئێمە هاتن. ئەمنیش سێ چوار پێشمەرگەم لەوێ بەجێهێشت، دەچووم هاوار بۆ کاک مەسعود ببەم، تا چارەیەک لەو هێرشەی حکومەت بکا. بە کاک مەسعودم گوت، ئەگەر لێرە شەڕ نەکەین، هەتا سەرسنورمان دەبەن. من نەشمزانی ئەوها زوو هێزی رژێم شۆڕدەبێتەوە، دەنا بەخۆم لەوێ دەمامەوە. لەوێ ب... ـیەکان بە سەرکردایەتی حەمەدو عەلی دۆڵەمەڕی و دکتۆر سەعید شەڕ... ان کردبوو لەوێندەر حکومەتیان شکاندبوو، بەڵام سێ چوار پێشمەرگەکەی ... شیان لەگەڵدا بوو. من بە کاک مەسعودم گوتبوو، ئەگەر ئازوقە بنێری، ئێمە ...ەی چۆڵناکەین. خوا هەڵناگرێ بە زووترین کات پشتیوانییەکی چاکی بۆ ن... و ئازوقەی گەیاند. بارزانییەکان رووەو سەرەوە سەرکەوتن، دیاربوو چەک و ...ەکیشیان گرتبووو هێزەکەی رژێمیان شکاندبوو، ئێمەش چووین و هەموو حیزبەکان گەڕاینەوەو ناوچەکەمان دابەشکرد، یەکێتی نیشتمانی لای رۆژهەڵاتی بەرکەوتبوو کە جەماعەتی کاک سامی عەبدولڕەحمان و قادر عەزیزیش لەگەڵ ئەوان دانرابوون. لای رۆژ ئاواش، کە دەکاتە سەر گردە هەرە بڵندەکە درابووە سۆشیالیست. دواتر هێزەکەی حکومەت بەهۆی ئەو گردە شکا، چونکە ئەوەی لە شەڕ بزانێ، دەزانێ ئەو هێزە لە کوێ شکاوە. شیوعییەکان لە شاخێک بوون. دواتر حکومەت هێرشی هێناو چەند بنکەیەکی گرت، بارزانییەکان ٣ بریندارایان هەبوو، بارزانییەکان لەشەڕ زۆر شارەزان، کە شکابوون، راستەو راست نەرۆیشتبوون، بەلاکەی دی سووڕابوونەوە. من ئەوانم

دیت، گوتم کوڕە ئەوە بۆ هەڵدێن. ئەوە مەعنای هەیە. گوتم ئەوە کاک
مەسعود هێزی هێنا ، ئێوە تازە هەڵدێن، ئەوجا گوتیان ئەوە کاک
مەسعودیش هات. حەمەد گۆتی قسەمان پێ مەڵێ، من وا برینداران
رەوان دەکەم، من بەرپرسی ئەو هێزەم. گۆتم بگەڕێنەوە شتی وا نییە
خواهەڵناگرێ دکتۆر سەعیدو ئەوان هاتنەوەو چووینە پاڵ شاخەکە، کە
هێزەکەی ئێمە لەوێ بوون. جەماعەتێکی خالید ئاژگەیی، کە
سەرپەرشتکارەکەی وابزانم مام سلێمان بوو، ئەوانیش هاتنە سەرێ،
لەوێ سەرکەوتین و گەیشتینە جەماعەت دکتۆر سەعید گوتی با...
وێ. پێیناخۆش بوو جێگە بگۆڕین، چونکە کاک مە... ...ەوی لەگەڵ
خالید ئاژگەیی دانابوو. ئەمنیش گۆتم کا... ...ۆر با جارێ راوەستین،
با خۆمان پتەو بکەین. با ه... ...سی ئێمەش بێن، جەماعەتی زیاتر
هاتن، کۆمانک... ...ە. لە خوارێ هەندە تەقەکرا. گوتم ئەوە بۆ لە
خوا... ...ەقە دەکەن. ئەوا ئەو جوندیانە لە بەسرەوە هاتینە سەر ئێوە،
ئێوەش لەوێندەرڕا تەقە دەکەن؟! ناوێرن بەسەر بکەون. گوتم لێ بوو
یەکێک، کە ناوی رەسول بوو ئێمە پێمان دەگوت شوانە، پێشتر لەگەڵ
ئێمە بوو، دواتر چووبووە ناو یەکێتی و سەرتیپ بوو. گوتی کوڕە
تەحسین کاوانی ئەوە سەید کاکەیە. وەرە با سەرکەوین، دوایێ
ناوێرین لە هیچ مەجلیسەک لەگەڵی دانیشین، بە چاوماندا دەداتەوەو
دەڵێ لە خوارێ تەقەیان دەکرد. گوتی کاک سەید قسەمان پێ مەڵێ
وا هەر ئێستا سەردەکەوین. سێ کەس بوون، هەریەکەو دەوری ١٥
پێشمەرگەیەکیان لەگەڵ بوو، دوو B.K.Cیشیان پێ بوو، کە ئەوان

گەیشتنە لای ئێمە، دکتۆر گۆتی کاکە ئەوە ئەوانیش هاتن، با هێرش بکەین. گۆتم یاڵڵا با هێرش بکەین، کە هێرشمان کرد، دووسێ کردمان گرت. ئیدی لەولاوەش سەفینی مەلاقەرەو هەڵگورد و جەماعەتی حەسەن نەجارو ئەوانە هەموو تێکرا شەڕەکەیان بەڕێوەبرد. بەڵام شکانی هێزی ڕژێم لەلایەن ئێمەوە بوو. ئەوەش بە سەرکردایەتی من بوو. من هێرشەکەم پێ کردن، چونکە ئەگەر شاخێک هێزی دوژمنی لێ بێ، چۆن لە خوارەوە را دەگیرێ. شتی وا لە دنیادا نییە.

**ئەی ڕۆژی ئازادکردنی شاری هەولێر جەنابت لەوێ بووی؟**

– من ناهەتبووسەوە خوارێ، ئاگام لێ نییە.

**بابێینە سەر یەکگرتن. کێ بیرۆکەی یەکگرتنی پاسۆک و پارتی گەل و سۆشیالیستی دانا؟ پێتوابوو یەکگرتنەکە ساغ و ڕێک بوو؟**

– بیرۆکەکە هی کاکە حەمەی حاجی مەحمود بوو، بۆ ...ەی حیزبەکە لە ناوبیا، کە بە تەواوی تێکیدا.

**خۆ ئەوکاتە ڕەسول مامەند سکرتێربوو، خەڵکی دیکە هەبوو چۆن پێشیان پێ نەگرت؟**

– ڕەسول مامەندیش حەزی دەکرد، هەندێ لە برادەران دەیانگوت با د. مەحموود ببێتە سکرتێر ڕەسول مامەندیش لەوشتە عادز ببوو. دەیگوت من چەند ساڵە ماندووبوویمە، ئێستا ئەو وەزعەی هاتییە، دەیانەوێ من بگۆڕن. بۆیە ئەویش خۆی بۆ تێکدانەکە ماندوو نەکرد. وانەبوو ئێمە هان بداو بڵێ بابە ئەوە بۆ تێکدانەو قبوڵی مەکەن. خۆ

ئەگەر ئەوەیان بە من گوتبا، هیچیان دەسەلاتی ئەوەیان نەبوو، بتوانن تێکی بدەن، من بە تەنهاش بووما، نەمدەهێشت وای لێ بێ، چونکە هێزی سۆشیالیست زۆربەی لەگەڵ من بوون. بەلام کەس دەنگی نەکرد.

**واتە هەڵوێستی تۆش دیارنەبوو؟**

– نازانم، من شارەزانیمە. من کابرایەکی عەسکەریمە، لە سیاسەت نازانم، گوتیان بەو یەکگرتنە ئێمەش قەوارەمان وەک یەکێتی و پارتی لێ دێ. منیش گۆتم باشە،من چوزانم بۆ تێک...

**دواتر هێندەی نەخایاند رەسول مامەند ... ناو یەکێتی، ئەوانیدیش چوونە ناو پارتی. لە ک... ئێوە دەتانویست ببنە هێزی سێیەم، ئەمە چۆن...**

– ئەو یەکگ... لەوە دروست بوو، کە ئێمە لە کۆبە دوو بارەگامان هە...، یەکێتی هێرشی کردبوونەسەر، یەکیان گرتبوو، یەکیشیان پێ نەگیرابوو، یەک دوو پێشمەرگەی ئێمەیان بریندار کردبوو و لەسەر جادەش گەنجێکیان کوشت.

**– لەسەرچی ئەو بارەگایانەی ئێوەیان گرت؟**

– هەر بۆ ئەوەی تەنگاومان بکەن و نەمێنین. پاش ئەوەش هێرشیان کردە سەر بارەگاکانمان کاک رەسول مامەند چووە وێندەر. هەندەک لە برادەرانی سەرکردایەتیش وەک شێروان شێروەندی کە خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو، لەگەڵ ئەحمەد شاکەلیش کە کۆن لەگەڵ مام جەلال برەک دۆست بوون، ئەوانە زیاتر مەیلیان بەولای‌دابوو، کاک

رەسـول هاتبـوو کـاک مـەسعـود ببینێ. دووسێ جـار هاتبـوو کـاک مـەسـعـودی نەدیبـوو، ئەویش لەوە زۆر عـادز بوو کـە وەکـو پێـویست پێـشـوازیان لێ نەکـردبوو،ئیـدی هاتەوە لە رکـان بووە یەکـێـتـی. کە رۆیشت شێخ محەمەد شاکەلی و شێروان شێروەندی لەگەڵی چوون.

**کـە چووە ناو یەکـێتی راوێژی لەگـەڵ ئێـوە کـرد، کـە بڵێ من دەچمە ناو یەکێتی؟**

- نەخێر، هەر بۆ خۆیان چوون.

**[illegible]جی لەلایەن پارتی پێشوازی لە رەسول مامەند نەکرا؟**

- چوو[illegible] کـە ئێـمـە خـەریک بوو بچـینە نـاو پارتی، ئەوان کـۆبوونەوەکـەیان تێکـ[illegible]ون بە تەنیـا مـانەوە، گـوتیـان ئێـمـە سۆشیالیست تێکنادەین. بڕیاربوو [illegible]مان بچینە ناو پارتی، بەلام ئەوان تێکیاندا، دواتر لە سۆشیالیستەکەش ویس[illegible] کاک مەسعود ببینن، نەیاندیت، راست بوونە یەکێتی، لە خۆیان رانەدیت.

**ئێوە کە تازە سێ حزب یەکتان گرتبوو بەو گەرماو گەرمییە، کێ دەستپێشخەری ئەوەی کرد هەمووتان بچنە ناو پارتی؟**

- مەسەلەکە هەر لێدانەکەی یەکێتی نەبوو، کە لە دوو بارەگاکەی ئێمەیاندا لە کۆیە. ئێمەش قبوڵمان نەکرد، چونکە یەکـێتی قـەت لە هەقی ئێـمـە نەهاتووە لە شـاخ،. بەلام بەم دواییە دەسـتـمـان شکا کـە لەگـەڵ ئەوانە یەکـمـان گـرت. تەن بەتەن یەکـێـتـی قـەت بە ئێـمـە نەوەستاوە. خۆشیـان ئیـعـتراف دەکەن. ئیـعـترافـیش نەکەن مەیدانەکە شایەدە، کە ئەو دوو بارەگایەیان گرت، بڕیاربوو کۆبوونەوەیەک لەگەڵ

پارتی و یەکێتی بکەین لە هۆتێلی زەیتونە لە هەولێر، چونکە ئەوکاتە یەکـێـتـی و پارتی پێکەوە حکومـەتـیـان پێکهـێنابوو، من هێـزەکم ئامادەکردبوو، خانووەکانی ئەو ناوچەیەم هەموو گرتبوو، گۆتم بێن لێرە لێیان دەدەم، نابێ یەک یەکێتی رزگاری بێ. بەڵام ئەو قادر جەبارییە گـوتی ئێـمـە رازی نین. ئەی دوایی چی دەکـەیەوە، لێـمـان دەدەنەوە. گوتم پاشان دەچینە دیبەگە، ئەوکاتە لەژێر دەستی رژێم بوو. دەڵێـینە حکومـەت وەرن حەق بدەنە ئێـمـە، ئێمە لەگەڵ ئێوە دەبین، ئەگەریش هاتن لەوێ لێیان داین، لێیان دەدەینەوە. خواهەڵناگرێ قادر جەباری گوتی ئەوە مام جەلال جارەک هەلی بۆ رێککەوت، جارێکی دی ئەو هەلە بۆ ئێـمـە رێکناکـەوێ بڕۆینە ناو حکومـەت و دوایێ بێـینەوە مەیدانێ، لە جـاشـاتی بێینەوەو لێـمـان خۆش بن و ببینە شۆڕشگێڕ، ئێمە رازی نابین، ئەوە بوو گوتم من بە تەنێ دەچم، هەر لێیان دەدەم، گـوتی وەڵڵا قـبـولّی ناکـەین و نایەڵێن... لە دوای ئەوە من گـوتم وەرن بابینە پارتی. مـامۆسـتـا سـەعدو کـاک سـامی حـەزیان لێ بوو، بەڵام نەدەوێران لای جـەمـاعـەتی خۆمـان باسی بکەن، یەکـەم جـار من گـوتم وەرن با لەگـەڵ پارتی یەکـبگرین، کـاک سـامی و مـامـۆسـتـا سـەعـد دەسـتـیـان پێکـردو قـۆسـتـیـانەوە. بەڵام هەردووکـیـان بە منیان گـوت بۆ ئێمە نابێ لە کۆبوونەوە ئەمە بڵێین، مام سەید تۆ ئەم پێشنیارە بکە، هەموو کـەس لەتۆ قبوڵ دەکاو ئێـمەش هێدی هێدی دەیخورێنین، ئیدی منیش گوتم یان شەڕ لەگەڵ یەکێتی، یان لەگەڵ پارتی یەکدەگرین. لە رکی ئەو لێـدانەی یەکـێـتی. ئـیـدی ئەوەبوو بڕیارمـاندا بچـینە ناو

پارتی.

**لە ناو ئێوە کەس لە دژی چوونە ناو پارتی ڕانەوەستا؟**

- نەخێر... بە باشیان زانی.

**ئیشەکەیان بەتۆ کرد؟**

- ئاخر... دواتر بە خۆشیـان خۆیان بردە پێشـەوە. خۆ مـن ناچم بڵـێم من وەهام گـوتووە. ئامـادەنیـمـە شـتی وابکەم. من ئەوەندی کردوومە بەهی خۆمی دەزانم، بە دەست و تفەنگەکەی خۆمی دەزانم. گوێم لەوە نییە بڵێم خەڵکینە منیش ئەوها بووم.

**پەیوەندی شەخسی و سیاسیت لەگەڵ دکتۆر مەحمود باشتر بوو یان لەگەڵ ڕەسول مامەند؟**

- وەڵڵا هەردووکیانم وەکو یەکتر خۆشدەویست، چونکە دکتـۆر مەحموود لە شۆڕشی ئەیلول پیاوەکی زۆر دڵسۆز بوو، ڕۆژهەتا ئێوارێ بۆ فەقیرو هەژاران دکتۆری دەکرد. دکتۆرم یەکجار زۆر خۆشدەویست. خۆشـەویستی شۆڕشی ئەیلول بوو. هەر شتـەکی کردبایە لەبەر دڵم نەدەکەوت. بەس کاک ڕەسولیشم خۆشدەویست.

**کاتێ تۆ پێشنیاری ئەوەت کرد، ئێوە بچنە ناو پارتی، حەمەی حاجی مەحمود هەڵوێستی چی بوو؟ گوتی با نەچینە ناو پارتی؟**

- نەخێر، هاتە ناو کۆنگرەش.. ئاخر موئامەرەبوو، پێیانگوتبوو. لە ناو کـۆنگرە ئینجـا وای گـوت. بەس من تەقـریبـەن لە ناو سۆشـیـالیـسـتـیش هەر پارتی بووم، بەڵام پێم عـەیب بوو ڕۆژەک لە ڕۆژان بڵێم پارتیمە، بەڵام لەناو سۆشیالیستیش نەمهێشت هیچ

کەسێ بەقەد یەک جگەرە قسە بە پارتی بڵێ.

**لەو ئەندامانەی ئێستای ناو پارتی کە پێشتر لە سەرکردایەتی پاسۆک، یان پارتی گەل، یان سۆشیالیست بوون، کاتی یەکگرتن، کەس دژی ئەوەبوو بێنە ناو پارتی، یان بڵێن با بچینە ناو یەکێتی، یان شتێکی دی؟**

- نەخێر ئەوانەی هاتبن کەس دژی نەبوو.

**لە دوایین کۆنگرەی پارتی تۆ خۆت هەڵنەبژارد، یان دەرنەچووی، یان پێیانگوتی خۆت هەڵمەبژێرە؟**

- خۆی دەبێ کۆنگرە لە ئەندامانی حیزب پێکبێ، من خۆم هەڵبژارد، بەڵام ئەوانەی ئەندامی حیزب بوون دەنگیان دامێ، بەڵام ٧٠٠ کەسەکە دەنگیان نەدامێ، ئێ ئەگەر ٧٠٠ کەس دەنگت نەداتێ چۆن دەردەچی!؟

**چەند دەنگت هێنا، نزیکت نەکردبوو دەربچی؟**

- وەڵڵاهی لەبیرم نییە.

**کاتێ سەدام رووخا، زۆر لە کەسانی بەرپرس فایلیان دەرکەوت، ئاشکرابوون کە پەیوەندییان لەگەڵ بەعس هەبووە. سەبارەت بەتۆ هیچ شتێکی لەو بابەتە هەبوو؟**

- نەمزانییە... کاکە حەمەی حاجی مەحمود لە بەغدایێ لیستێکی هێنابۆوە، هی ئەمنی هەولێر بووە، تێیدا نووسرابوو، ئەو کابرایە بەشتێک ئیقناع بکەن ئەوانیش وەڵامیان دابوونەوە. کە ئەو پیاوە نەحەزی لە ئافرەتانە، نە مەشروبخۆرە، نە پارەشی خۆشدەوێ، واتا هیچی لەگەڵ ناکرێ، تەنها چارەی ئەوەیە بکوژرێ.

**بەپێی ئەو زانیارییەی هەتە، ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبەکانی زۆر تێدا بوون، کە پەیوەندییان لەگەڵ بەعس هەبووبێ؟**

- ئەوە حیزبەکان دەزانن. من فایلی کەسم نەدیتییە..

**بەم دواییە کە بوویە ئەندام پەرلەمان، تۆ خۆت حەزت لێ بوو؟**

- ناوەڵلا حەزم لێ نەبوو. زەوقم لێ نییە هەتا دنیا ماوە هیچ ئیشەک لەگەڵ هیچ حیزبەک بکەم.بەڵام هەندێ برادەری خۆم لە سەرکردایەتی پارتی هاتن گوتیان کاک مەسعود خۆی نوسیتی ببێتە ئەندام پەرلەمان پێمان خۆشە رەتی نەکەیەوە، ئەمنیش رەتم نەکردەوە، دەنا پێم خۆش نەبوو، پێشتریش وایان لێ کردم پۆستێکیان لێ وەرگرم.

**لەو ئاخیرەدا هەندێک لە پەرلەمانتاران داوایان کرد مووچەکەیان زیاد بکرێ، تۆ ئیمزات کرد؟**

- وەڵلا من ئیمزام کردووە بۆ زیاد کردنی مووچەی پەرلەمانتاران، بەڵام هەر نەشمزانی بۆ چییە، هەر گوێشم لێ نەبوو، چونکە لە دوای تەقینەوەکەی کە ویستیان تیرۆرم بکەن، گوێم گران بووە، ئەگەرنا عەیبە مەزبەتە بکەی بڵێی مەعاشم زیاد بکە، شتەکی باشیان نەکرد، بەمنیان گوت وەرە ئیمزابکە، منیش ئیمزام کرد.

**تۆ هەوڵی تیرۆرکردنت درا، رات بەرامبەر تیرۆریستان چییە؟**

- خۆی ئەمریکا هەڵەی کرد کە ویستی وەکو خەڵکی ئەمریکا هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی ئێرە بکا، بۆیە لە بەغدا حاڵی بەوە گەیشت، دەوڵەتی ئێمەش هەمان هەڵەی ئەمریکا دەکا، چونکە

بەراستی حوکمەکی شلە، دەبێ حوکمێکی توندی لە دژی تیرۆریستان هەبێ، ژنێک دەبینی هەموو چاوی داپۆشیوە، دەستی داپۆشیوە، کەسێک نییە پێی بڵێ خوشکە بۆ تۆ هەموو خەڵک دەبینی نەزەر نییە، بۆ خەڵک تۆ ببینێ نەزەرە، یان خەڵک هەیە لە مزگەوتەکان بەشێوەیەک نوێژ دەکا کە جێگەی گومانە. جارەک یەکێکی وام دیت، دیتم چاوم لێ سووردەکاتەوە، گوتم با لە مزگەوت نەیگرم، لە دەرێ دەیگرم، بەڵام لێم بزربوو، رۆژێکی دیکە دیتمەوە بە پاسەوانەکانم گوت، کە لە مزگەوت دوورکەوتەوە بیگرن، ئەوەبوو گرتیان تەسلیمی ئاسایشم کرد، بەڵام ئاسایش بەریدا، بەس ئێستاش سوێند دەخۆم ئەو کورە تیرۆریست بوو، هەروەها دەمەوێ ئەوەش بڵێم ئەوەی تیرۆریست دروستدەکا، ئەو کەسەیە کە لە ئێزگەو رۆژنامەکان دژی ئیسلام قسە دەکا.

**پاش ئەوەندە ساڵە خەبات و چەرمەسەری و برینداربوونە، ئێستا پەشیمان نیت؟**

- نەوەڵڵا بۆ میللەتی خۆم کردووە، پیاوی کەس نەبوویمە، پیاوی میللەتی خۆم بوومە، پێشی شۆڕشی نەتەوەیش، لە دژی ئاغایان شەڕم کردووە، بەرگریم لە میللەتی خۆم کردووە، لەسەر چینەکەی خۆم شەڕم کردووە، لە دەشتی هەولێر من توانیم سەرکەوم، بەڵام حیزبی شیوعی فەشەلی هێنا، هەندێک گیران و هێندێک هەڵاتن و مەسئولی مەفرەزەکە جەمالی شێخ تایەر تەسلیم بووەوە، من بەتەنێ مامەوە.

# لەم عێراقە گەورەیەدا، بڕیار لە دەست ئەو باڵیۆزخانە بچکۆڵەیەی ئەمریکایە کە لە بەغدایە



حەمەی حاجی مەحموود، چارەگە سەدەیەک زیاترە، پێشمەرگەیەو، وەک خۆی دەیلێت (٦) جاریش برینداربووە، ناوی حەمەی حاجی مەحموود یەکەمجار لە ناوچەی شارەزوور بڵاوبووەوەو ئیدی شەڕ لە دوای شەڕ ناوی ئەو دوورتر ڕۆیشت، تا هەموو کوردستانی تەنییەوە، لە هەشتاکان و نەوەدەکانیش، حەمەی حاجی مەحموود، زیاتر وەک کەسێکی عەسکەری خۆی بە خەڵک ناساند، زیاتر لەوەی سیاسی بێت، ڕەنگە هەر ئەو کاریگەرییەیەش بێت، لە دیمانەو چاوپێکەوتنەکانی ڕاشکاوانە دەدوێت، قسەی خۆی دەکات، گرنگ نییە دوایی سەرکۆنە دەکرێت یان نا، زۆر حەز لە هاوپەیمانێتی دەکات لەگەڵ حزبەکانی دیکەی کوردستانی (بێجگە لە پارتی و یەکێتی) بەڵام، ئەوەیشی بۆ نەچۆتە سەر، جا چ لەبەر گوشاری دوو حزبە دەسەڵاتدارەکە بێت، چ لەبەر خۆویستی هەندێک سەرکردەی حزبەکان بێت.

بەشیاومان زانی هەندێک لاپەڕەی مێژووی خەباتی حەفتاکان تا نەوەدەکان بە کاک حەمەی حاجی مەحموود هەڵدەینەوە، زۆر بە جورئەتانەش وەڵامی پرسیارەکانی داینەوە، بەو هیوایەی توانیبێتمان تینوویەتی خوێنەران بشکێنین.

**سەرەتای هاتنت بۆ نێو دنیای سیاسەت لە کوێوە دەستپێدەکات؟ ئایا لە بزووتنەوەی یەکگرتنی دیموکراتی سوسیالیستی کوردستانەوەیە؟ یان پێشتر رۆڵێکت هەبووە؟**

- من پێشتر پێشمەرگە نەبووم، کاری سیاسیشم نەکردووە، هەفتاکان یەک حیزب لە کوردستان هەبوو، هەمووی هەر پارتی بوون، بەڵام من زۆر هەوڵمدا بمکەنە پێشمەرگە نەیانکردم، واستەشم کرد هەر نەیانکردم. بە چەکی خۆشمەوە هەر نەیانکردمە پێشمەرگە، لە شەڕیشدا وەکو عەشایەر بەشداریم کرد... ئیتر نازانم هۆیەکەی چی بوو؟!

بەس لە ساڵی دوای نسکۆی شۆڕش، هەوڵی زۆرمدا کە شتێک بکەین، ئەوە بوو لەگەڵ زۆر لە برادەران هەوڵماندا، بەڵام ئەوکاتە نەکرا، ئیتر بەرەبەرە هەوڵی پەیداکردنی کۆمەڵێ خەڵکماندا، وەکو رێکخراوێک توانیمان رێکخستنەکانمان بڵاوبکەینەوە، پاشان بیرمان لەوە کردەوە کە پەیوەندی بە رێکخستنی دیکەوە بکەین، ئەمە بوو پەیوەندیمان بە بزووتنەوەوە کرد، ئەوکات بزووتنەوە هێشتا فکرەیێک بوو.

**- ئەوە کەی بوو؟**

- هەر چەند رۆژێک دوای رێککەوتنی جەزائیر، دەتوانم بڵێم لە ١٩٧٥/٤/٤ پەیوەندیم بە برادەرانەوە کـــرد، لە ١٩٧٥/٥/١٠ جارێکی دیکە دانیشتینەوە، ئەو دانیشتنانە بەردەوام بوو تا رۆژانی

مانگی ٦، بە درێژایی ساڵی ١٩٧٦ ئیشمان کردو هەوڵماندا و چەکمان کڕی و لەژێر زەوی شاردمانەوە، پەیوەندیمان بە خەڵکەوە کردو تابیعەمان پەیداکرد، ئەوکات دوو سێ جۆرە ڕێکخستن هەبوو، بزووتنەوەی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان هەبوو، کۆمەڵەی ڕەنجدەران هەبوو، کۆمەڵەی مارکسی- لینینی هەبوو، هەریەک لەلایەکەوە خەریکی کاری ڕێکخستن بوو، دوایی ئێمە توانیمان بڕیاری دروستکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکان بدەین، ئەوە بوو لە ١٩٧٦/٦/٢٦ بڕیاری دروستکردنی یەکەم مەفرەزەمان دا.

**- تۆ خەڵکی ناوچەیەکی خێڵەکی کە ناوچەی شارەزوورە، بۆچی بە مارکسیەت و سۆشیالیزمی زانستی دەستت پێکرد، بەڵام حزبێکی نەتەوەیی، یان جۆرێک لە حزبێکی عەشایری دەرەبەگیت هەڵنەبژارد؟**

- بەراستی وەکو فیکر، من فیکرێکی نەتەوەیی و نیشتمانیم هەیە، ئەوکاتیش لەسەر هەمان فکر بووم، بەڵام ئەوکات لە دوای ڕێکەوتنی جەزائیرو ئەو بارودۆخەی بەسەر کورد داهات، پەرچەکردارێک دروست ببوو، کەوا لێکدەدرایەوە شۆڕش پشتی بە ئەمریکا و ئێران بەستووە، ئەو پەرچەکردارە وایکردبوو خەڵک هەوڵ لەگەڵ چەپەکان بدات، خۆت دەزانی کورد هەوڵی لەگەڵ هەمووان دا، لە ماوەیەکدا لە ڕێگای خانەقاو تەکیەو شێخەکانەوە هەوڵیدا شتێکی بۆ بکرێ، بۆی نەکرا. لە ڕێگەی سۆڤیەت و شیوعیەتەوە هەوڵیدا، ئەوەبوو نەگەیشتە ئەنجام، کۆماری مەهاباد نموونەیەکە لەو

بارەیەوە. لە ڕێگەی ئینگلیزو بەریتانیا هەوڵیدا، نەگەیشتە ئەنجام، بارزانی ڕەحمەتی بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەمریکاو ئێران هەوڵیدا، ئەویش نەگەیشتە ئەنجام. ئەمانە هەمووی هەوڵدانی بێ ئاکام بوون.

وەکو گوتم نسکۆی شۆڕش وایکرد پەرچەکردارێک دژی ئێران و ئەمریکا دروست بێ، گوایە ئێران وای لە ئێمە کردو ئەویش سەر بە ئەمریکایە، کەواتە ناچاربووین پەنا بۆ شتێکی دیکە بەرین کە خەڵک قەناعەت پێ بکەین. خۆی دووشت دەتوانێ زوو کار لە گەنجان بکات، یەکیان بەناوی ئیسلامی، ئەویدیکەیان بەناوی مارکسیەت، ئەوەی یەکەم زوو تاقیکرابۆوە، ئەوەی دووەمیان مابوو، وەک ئەوەی مرۆڤ دەکەوێتە ناو ئاوێکەوە بۆ ئەوەی خۆی رزگار بکا دەست بۆ پوشیش دەبا، واتە کورد ئەوکات هیچ پشت و پەنایەکی نەبوو، ئەوەش لە گۆڕێ بوو دەیانگوت حزبی شیوعی هەڵوێست وەردەگرێ، پێمانخۆش بوو، گرنگ ئەوەیە دژی عێراق بێ، ڕۆژێک دوو سێ کەسم بانگکرد، دوای ئەوەی قەناعەتیان کرد ئیشمان لەگەڵ بکەن، پێمگوتن ئەو ڕێکخستنە ڕێکخستنێکی مارکسیە، هەرچەندە بزووتنەوە لە بنچینەدا ڕێکخراوێکی مارکسی لینینی نەبوو، (بزووتنەوەی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان) بوو، بەڵام کە بزووتنەوە چووە شاخ لە دەرەوە مەرجیان لەسەر بزووتنەوەکەدانا کە سوسیال دیموکرات ئیمپریالیزمی دووەمە، دەبێ ناوەکەی بگۆڕن.

**- کێ مەرجەکەی دانا؟**

- یەکێتی نیشتمانی کوردستان داینا، کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستان گوتیان سۆسیال دیموکرات ئیمپریالیزمی دووەمە، ئەگەر وشەی دیموکرات لە ناوی حزبەکەتان لانەبەن، نەبێتە بزووتنەوەی سوسیالیستی، کەواتە ئێوە باوەڕتان بە چەک نییە، ئەوەش فیکرەی ئیمپریالیزمی دووەمە لە جیهاندا، لەبەر ئەوە ئەگەر وانەکەن لەبەرەی ئێمە قبوڵ ناکرێن. ئەوکات نیمچە بەرەیەک لەگەڵ یەکێتی کرابۆوە، لەبەر ئەوەش وەزعی میللەتەکە ئەوەندە لە مەترسی دابوو، پەنا بۆ هەموو شتێک دەبردرا، هەر بیروباوەڕێک بووایە گرنگ ئەوەبوو چۆن ئەو میللەتە رزگار بکرێ.

**- ئێوە کە ئەوکات لەگەڵ یەکێتی زۆر رێک بوون، بۆچی لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ شەڕێکی گەورە لە نێوانتان دروست بوو؟**

- خۆی ئەوکات کۆمەڵە ئەو فکرەیەی هەبوو کە ئەوەی لەگەڵت نەبێ دوژمنتە، بۆ نموونە لە کاتی شەڕی ناوخۆ ئەگەر لەگەڵ سەرکردایەتی کاتی پارتی شەڕیان هەبا، هیچ کێشەیان لەگەڵ بزووتنەوە نەبوو، بەڵام کە شەڕیان لەگەڵ کەس نەدەما، ئینجا لەگەڵ بزووتنەوە دەیانکرد.

**- ئێوە وەکو بزووتنەوەی سوسیالیستی بڕواتان بە خەباتی چەکداری هەبوو، ئەو بزووتنەوەیە کۆمەڵێک کادیرو سەرکردەشی لێ دروستبوو، کەچی سکرتێرەکەتان بڕوای بە خەباتی چەکداری نەبوو، یان لەبەر هەر هۆیەک بێ نەهاتە شاخ، ئێوە وەکو سەرکردایەتی**

**ئەوکات چۆن قەناعەتتان بەو سکرتێرە کرد کە ئەو لە بەغدا بێت و خەڵکیش لە شاخ خەبات بکات؟**

– سەیدا ساڵح یوسفی پیاوێکی ئاشتیخوازو نیشتمانپەروەر بوو، دەیویست میللەتەکەی لەو بارودۆخە رزگار بکاو شتێکی دەسکەوێ، هەتا کاتی خۆی چ کاک عەلی عەسکەری، چ کاک خالید، چ عەلی هەژارو شەهید کاردۆ گەلالی و مامۆستا مەلا ناسیح بەو فکرەیە لە ئێران گەڕانەوە کە ئەگەر حکومەتی عێراقی هەندێ گۆڕان لە سیاسەتی خۆی بکاو چیتر نەڵێ ئیتر شۆڕش تەواو بووەو میللەتی کوردیش تەواو بووە، ئەوان ئامادەبوون لەگەڵ عێراقدا وتووێژ بکەن، ئەوە خاڵی یەکەم بوو، خاڵی دووەم سەیدا یوسفی بڕوای وانەبوو کە ئەرکی هێزی کوردییەکان رووخانی رژێم بێ، بەلای ئەو ئەرکی هێزە کوردییەکان ئەوەبوو مافی کورد بەدەستبێنن لە چوارچێوەی عێراقدا، لە دیدی ئەو ئیشی ئێمە ئەوە نەبوو شەڕ بکەین تارژێمی عێراق دەرووخێت، بەڵام لە راستیدا دوژمنەکەت جوابی نەدەدایەوە، تۆ ناچار دەبووی پەنا بۆ چەک بەریت تا دوژمنەکەت ناچار بکەیت گفتوگۆت لەگەڵ بکات، بۆ ئەوەی هێندێک لە داواکانی میللەت جێبەجێ بکا.

مەسەلەی نەهاتنە دەرەوەی سەیدا ساڵح یوسفی بۆ چەند هۆیەک دەگەڕێتەوە، یەکەم تەمەنی زۆربوو، نەیدەتوانی بە ئاسانی بێتە شاخ، دووەم کێشەی ماڵەوەی هەبوو، ئێمە هەوڵماندا بچێتە دەرەوە، ئەوەبوو بڕیاربوو لەگەڵ کاک عەزیز عەقراوی و چەند کەسێکی دیکە

پێکەوە بچنە دەرەوە، ئەوان لە سوریاوە ڕۆیشتنە دەرەوەو لەوێوە هاتنە لامان لە شاخ، بەڵام ئەو نەیتوانی بچێتە دەرەوە، ئەوەبوو لە کۆنگرەی یەکەم ئێمە سکرتێرمان هەڵنەبژارد، حکومەتی عێراقی زۆرجار پرسیاری دەکرد بۆ ئەوانە سکرتێریان نییە؟ یان سکرتێرەکەیان لە کوێیە؟ پاشانٔ شەڕی ناوخۆی بەسەر داهات و زۆرجار دەگوترا سکرتێرەکەیان لە بەغدایە، ئەمانە وایکرد حکومەتی عێراقی پێی بزانێ و ئەوەبوو لە ڕێگای نامەیەکەوە شەهیدیان کرد.

**- لە هەشتاکان زۆرجار باس لەوە دەکرا کە ئێران سەیتەرەی لەسەر حیزبی سوسیالیست کردووە، ناوی هەندێک سەرکردەی بەرچاویش دەهات، بەتایبەتی لە شەڕی ناوخۆدا ئەوشتانە زۆرباس دەکران کە ئێران لە ڕێگای ئیستلاعاتەوە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی سوسیالیستی کڕیوەو دەستی بەسەر ئەو حزبەدا گرتووە، لە ڕاستیشدا دوای ساڵی ۹۱ دەرکەوت هێندێکیان ڕاستن، ئەوە لە کاتێکدا حزبی سوسیالیست بە حزبی چەوساوەکان خۆی دەناساندو بنکەیەکی جەماوەری بەرفراوانیشی دروستکردبوو، ئایا ئەو مەسەلەیە چەندە ڕاستە کە خۆشت لەسەرکردایەتی بووی و یەکێک بووی لەوانەی ناوت دەهات؟**

- لە ڕاستیدا کە ڕژێمی شا نەماو شەڕی عێراق و ئێران دەستیپێکرد، ئێمە لە یەکێتی نیشتمانی جیابووینەوە، کە لێی جیابووینەوە دژایەتی زۆر توندی کردین. هەروەها شەڕی ناوخۆش زۆر

ئازاری داین، یەکێ لەو فاکتەرانەبوو کە فشاری زۆری لەسەرمان دروستکرد، هەروەها ئێرانیش فشاری زۆری خستە سەرمان، هەوڵیان دەدا ناوی حیزب بگۆڕین، بەوبیانووەی ئەگەر ئێمە ئەو ناوەمان گۆڕی ئەوان پشتیوانیمان لێ دەکەن، بەڵام ئێمە نەچووینە ژێر ئەو بارە، گوتمان ئێمەو ئێوە هەردوولامان دژی عێراقین، با لەو خاڵە یەک بگرین. بۆیە دەڵێم ئێمە نەچووینەتە ژێر باری حکومەتی ئێرانی و هیچ رۆژێکیش لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا ئێران نەهاتووە لەسەر ئێمە شەڕی حزبێکی دیکە بکات، بەڵام لەسەر زۆربەی حیزبەکانی کوردستان شەڕی کردو تۆپ و راجیمەشی دانێ.

**- ئەوە دوای راپەڕین بوو...**

- لە پێش راپەڕینیش هەر یارمەتی ئەوانی پتر دا، لە زۆر بابەت پشتگیری ئەوانی کرد، لە دوای راپەڕینیش ئێران بە پێشمەرگەی هەموو حزبەکان بەرهەڵستکارەکانی ئێرانی کوشتن، بەس ئێمە ئەوەمان نەکردووە، تۆپ و راجیمەی بۆ هەمووان تەقاند، خۆم بینیم هەر سەیارەکەی قەرارگەی رەمەزان کاتیۆشاکەی لەسەر یەکێتی شەڕیکرد، لەسەر پارتی شەڕیکرد، لەسەر بزووتنەوەی ئیسلامی شەڕیکرد، بەڵام لەسەر ئێمە یەک راجیمەی نەتەقاندووە.

ئەمە خاڵی یەکەم، خاڵی دووەم: ئێران هیچ کاتێ ئەوەندە یارمەتیەی نەداوین کە بتوانین بەرگری پێ بکەین، چونکە ئێمە نەشەڕمان بۆ ئێران کرد، نە ئێرانیش تەکلیفی لێکردین شەڕی بۆ

بکەین، هەتا ئێمە زۆرجار لەسەر مەسەلەی حزبی دیموکرات لەگەڵ ئێران تووشی کێشە بووینە، سەید کاکە ئێستاش لە ژینداماوە لەسەر حزبی دیموکرات زیندانی کرا، ئەوان دەیانگوت دەبێ ئێوە شەڕی حزبی دیموکرات بکەن، بەڵام ئێمە نەشەڕی کوردی تورکیامان کرد، نەهی کوردی ئێرانیش.

**- ئەی ئەگەر ئەو حزبە ئەو هەڵوێستانەی هەبووە، بۆچی وەکو گەڵای پاییز هەڵوەری؟**

- دوو هۆ هەبوو، یەکەمیان سەرکردایەتی حزب لەناوخۆیدا کێشەی هەبوو، بەتایبەتی لە نێوان کاک ڕەسول و کاک د. مەحمود، دووەم سەرکردایەتی حیزب لە ئاست ئەو بنکە جەماوەریە بەرفراوانە نەبوو کە حزب هەیبوو، هەروەها هەردوو حزب پارتی و یەکێتی کۆکبوون لەسەر ئەوەی لە حزبی سوشیالیست بدەن، جگە لەمانە لەکاتی هەڵبژاردندا مەرجی ٧٪یان دانا، ئێمەش نەمانتوانی ئەو ڕێژەیە بێنین و بچینە پەرلەمان. دوای ئەوە سەرکردایەتی حزب هەندێ شتیان لە دەستداو نەیانتوانی خۆیان رابگرن.. هەر لەبارەی پەیوەندی ئەو حزبە بە ئێران رەنگە زۆرجار باسی من بکرێ کە من لێیان نزیک بوومە، من خۆم پەیوەندیم لەگەڵ ئێران هەبووەو ئێستاش هەمە.

**- پەیوەندییەکە چۆن بووە؟**

- پەیوەندیەکەمان ئاوا بوو، ئێمە لەسەر ئەو سنوورانە بووین و هێزێکی کاریگەری شەڕکەر بووین، هێزێک بووین لە ناوچەکە

دەمانتوانی هاوسەنگی هێز بگۆڕین، ئێرانیش دژی عێراق بوو، ئێمە ڕێککەوتنی سیاسی و ستراتیژیمان لەگەڵ ئێران نەبووە، ڕێککەوتنی کاتی و ڕۆژانەییمان کردووە، بۆ نموونە گوتومانە هێزی حکومەتی عـــێـــراقی لەو ناوچەیەیە با پێکەوە هێـــرشـیـــان بۆ بکەین و دەسکەوتەکانیش دابەش دەکەین، هەمیشە ڕێککەوتنەکانی ئێمە لەگەڵ ئێران ڕۆژانەیی بووە، نەک سیاسی، چونکە ئێمە بە درێژایی شەڕەکانمان لەگەڵ حکومەتی عێراق یەک دیلی خۆمان تەسلیمی ئێران نەکردووە.

**- بەڵام بریندارەکانتان دەچوونە ئێران و لەوێ یارمەتی دەدران؟**

- بەڵێ، بریندارەکانمان دەچوونە ئێران و لەوێ برینەکانیان سارێژ دەکران، هەروەها جێگاو ڕێگای ۳۰۰ ماڵە ئاوارەیان بۆ دابینکردین، کە تا ئێستاش هەندێ ماڵمان لەو ئۆردوگایانە ماون.

**- چەک و ئازووقەشتان وەردەگرت؟**

- ئازووقەشمان وەردەگرت.

**- باشە پێتوایە ئێران وەک دەوڵەتێکی گەورەی ناوچەکە بەتایبەتی لە کاری هەواڵگریدا دەستێکی درێژی هەیە، بەبێ بەرامبەر شت دەدا بە حزبەکان.؟**

- بەرامبەر چییە؟ ئێمە شەڕمان کردووە، ئەو یارمەتیانەی بە هەموو کورد دەدا. هی وا هەبوو هەر لە ترسان رایکردبوو هاتبووە ئێران و ئەویش ئازووقەو یارمەتی پێدەدا، بەڵام ئەو چەکانەی بە

حـزبەکـانی دیکە درابوو، بە ئێـمـە نەدراوە، ئەو پارەیەی درابووە حزبەکانی دیکە، نەدراوە بەئێمە، تەکلیفی شەڕو رفاندنی خەڵک و تەسلیمکردنی بە ئێران، بە ئێمە نەکرا.

**- ئەوان تەکلیفیان لێنەکردن؟**

- با تەکلیفیان کردووە، بەڵام ئێمە نەمانکردووە.

**- کە نەتاندەکرد ئەوان هەڵوێستی دیکەیان وەرنەدەگرت؟**

- با، کاتی وا هەبووە لەسەر سنوور پێشمەرگەیان گرتووین، کاتی وا هەبووە کێشەی جۆراوجۆریان بۆ دروستکردوین، بەڵام برسیەتیمان هەڵبژاردووە، ئەوەمان نەکردووە.

**- ئەی باشە بۆ واهاتووە کە تۆ پەیوەندیت لەگەڵ دەزگاکانی ئێران هەیە، بەڵام ناوی سەرکردەکانی حزبەکانی دیکە نایێت؟**

- بۆ ئەوە دوو سێ حالەت هەیە، کاتێ ئێمە شەڕمان لەگەڵ عێراق کـردووە، هەندێ لە حـزبەکـان لەوانەیە نەیانتـوانیـبێ لەسـەر سنوورەکـانیش سەیری عـێـراق بکەن. بۆ نموونە ئێـمـە تۆپخـانەمـان گـرتووە، مـەعـەسکەرمـان گـرتووە، ئێـران پشـتـیـوانی لێکردووین و یارمـەتی داوین، ئەمـانە وایکردووە ئەوان وا بزانن ئێـمـە سـەر بە ئێـرانین، بەڵام ئێـران دەوڵەتێکی گەورەیە لە ناوچەکـە، ئێـمـە وەکو حزبێکی سیاسی مامەڵەمـان لەگەڵدا کردوون و پەیوەندیمان لەگەڵدا بەستوون، لەگەڵ تورکیاو سووریاش هەروابووە، ئێمە لەسەر P.K.K لە تورکیا بارەگامان پێداخرا، تا ئێستاش بارەگامان لە سوریا هەیە،

لەگەڵ ئێرانیش وەک گوتم پەیوەندییەکەمان رۆژانەیی بووە، زۆرکەس هەوڵیداوە بەرهەڵستکارانی ئێرانی بگرێ و تەسلیمی ئێرانی بکا، بەڵام بە پێچەوانەوە ئێمە بەرهەڵستکارمان لەبەر دەستی ئێران رزگارکردووە.

**-تۆ، چ لە ساڵانی ٧٩ بەدواوەو چ لەبەرەی جودو کاتی شەڕی ناوخۆدا لە شاخ و لە دوای راپەڕینیش، زیاتر لای یەکێتیت گرتووە؟ ئایا نەدەکرا وەکو حزبی شیوعی هاوسەنگییەک لەو نێوانە دروست بکەیت و هەردوولا لە خۆت رازی بکەیت؟**

- ئێمە لەکاتی بەرەی جوددا کە جودو یەکێتی شەڕیان بوو، هەوڵماندا بگەڕێینەوە ناوچەکان، لایەنەکانی دیکە نەیاندەکرد، پارتی و یەکێتیش ئامادەنەبوون هێزەکانیان بێننەوە سەر سنوور، تەنها هێزێکیش رۆژانە تووشی شەڕدەبوو، ئێمە بووین، ئەگەر نامەکانی مام جەلال و یەکێتیت لە کتێبەکانی مندا ببینیی کە چۆن داوای ئاشتبوونەوەمان لێدەکەن، خۆ کاتی خۆی داوایان لە پارتی و شیوعیش کرد، لە ساڵی ١٩٨٤ دوو سێ جار چوونە بارزان کۆبوونەوە کرا، نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک، سەرەتا ئێمە لەگەڵ یەکێتی تەنسیقمان کرد. مەسەلەی کەوتنە بەرەی شەڕ، ئێمە شەڕمان نەکرد، پارتی کە هاتەوە هەولێر یەکەمجار بارەگاکەی ئێمەی گرت و تەلەفزیۆنەکەی ئێمەی لەسەر قەڵای هەولێر داگرت.

**-رەنگە بارودۆخەکە ئیستثنا بێت، ئەوکات ماڵی ئەندامانی**

**مەکتەبی سیاسی پارتیش تالانکران....**

- نا لەبەر ئەوەنەبوو، چونکە دوای ئەوە من هاتمەوە چوومــە لای کاک مەسعود و ئەوم بینی، دوایی هاتن بارەگای سلێمانیشیان گرتین، دوایی بۆ گرتنی بارەگای دیکەشمان هاتن، ئیتر قابیلە ئینسان بەرگری لەخۆی نەکات؟!

**ئێوە کە لەگەڵ پارتی گەل و پاسۆک یەکگرتنتان راگەیاند وەک بڵێی قۆناغێکی گواستنەوە بێ بۆ چوونە نێو حزبێکی دیکە، ئەوەبوو دوایی چوونە ناو پارتی، ئایا لە سەرکردایەتی خۆتان دیراسەی ئەو یەکگرتنەتان کردبوو؟**

- ئەو یەکگرتنە بە سروشتی نەبوو، یەکگرتنی ئێمەو پاسۆک پێش هەڵبژاردنی گشتی بوو کە کاک رەسول مامەند لە دژی د. مەحمود عوسمان کردی، یەکگرتنەکەی پارتی گەل و پاسۆکیش د. مەحمود لە دژی کاک رەسول کردی، واتا هەردوولا لە دژی یەک هەوڵیاندەدا خەڵک بێنن.

**- ئێوە وەکو سەرکردایەتی هەڵوێستتان بەرامبەر هەڵسوکەوتی ئەو دوو کەسە چی بوو، ئایا لە راکێشانی خەڵک بۆ خۆیان پێویستیان بە دەنگی زۆرینە نەدەبوو؟**

- لە راستیدا ئێمە بۆ خۆمان لەگەڵ یەکگرتنەکان بووین. پێمان باشبوو یەکگرتن هەبێ، بەڵام بۆ ئەوە بێ تا هێزی سێیەم دروست بێ، ئەو هێزی سێیەمە بتوانێ یارمەتی یەکێتی و پارتی بداو پشتیوانیان لێ بکا.

**- پێتانوابوو بە پاسۆک هێزی سێیەم دروست بێ؟**

- مەوزوع ژمارە نەبوو، مەوزوع لایەنە مەعنەوی و ئیعلامی و سیاسیەکە بوو، ئەگینا خۆتان دەزانن سۆسیالیست پێویستی بە ژمارە نەبوو، ئێمە هەوڵماندا هێزی سێیەم دروست بێ، بەڵام بەپێچەوانەوە برادەرانی پاسۆک ئاراستەیەکی تایبەتی خۆیان هەبوو. هەندێکیان دەیانگوت گرنگ ئەوەیە ئەو حزبە بگەیەنینە ناو حزبێکی دیکەو ئەگەر ئێمە نەشیکەین گرنگ نییە. هەروەها هەندێک لە برادەرانی (پارتی گەل)یش ئاوا بیریان دەکردەوە، ئەمانە وایانکرد یەکگرتنەکە هەر لە سەرەتاوە یەکگرتنێکی ناکامل بێ. لەگەڵ ئەوانەشدا فشاری یەکێتی نیشتمانی کوردستانیشمان لەسەر بوو.

**- فشاری ئەوان چۆن بوو؟**

- ئەوکات ئێمە لە حکومەتی هەرێم بودجەمان ٢ملیۆن دینار بوو، وەزیری دارایی یەکێتی بوو، سەرفیان نەدەکرد، دەیانگوت جارێ نییە، سێ مانگ جارێک بۆیان سەرف دەکردین. لەو سێ مانگە برادەرانی خۆمان دەهاتن دەیانگوت ئەوا یەکێتی فشارمان دەخاتەسەر، جا ئەوەی حەزی لێ بوو بچێتە ناو پارتی، دەیگوت بابچینە ناو پارتی، ئەوەشی حەزی لەناو یەکێتی بووایە، دەیگوت بابچینە ناو یەکێتی، بەراستی ئەوکات لەگەڵ یەکێتی زۆر هەوڵمدا گوتم هەندێک بڕیار دەدەین خۆشمان باوەڕمان پێی نەبێ، کەچی وازیان لێ نەهێناین، فشاریان خستەسەرمان، کێشەیان بۆ

دروستکردین، ئەوەبوو گەیشتینە ئەو بڕیارانە.

**- ئەوکـات بڕوات بە یەکگرتنەکـە هەبوو، یان بۆچی چوویە ناو پارتی و پاش ماوەیەکی کەم جیابوویەوە، لە کاتێکدا دکتۆر مەحمود یەکسەر ڕۆیشت و نەهاتە ناو پارتی؟**

- دکـتـۆر مـەحـمـود بەمنی گـوت، منیش دێمـە ناو پارتی، بە فاکسێک پیرۆزبایشی لێکردین. لەگەڵ چوونە ناو پارتی دابوو.

**- ئەی بۆ وا زوو هاتیە دەرەوە؟**

- پێش ئەوەی بچـینە نـاو پارتی تێـبـینی خـۆم هەبـوو، لە یەکـەم کۆبوونەوەش وتم تەحەفوزم لەسـەر ئەو بابەتە هەیە، من لـەسـەر ناو و ڕەنگی ئاڵای حـیـزب ڕازی نەبووم، پارتـی دەیگوت نـاوەکـە ببێ بە پارتی دیموکراتی کوردستان یەکگرتوو، منیش گوتم (پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان) بێ، لەسەر ئەوە نەگەیشتینە ئەنجام، لە یەکەم بەیانیشدا من قسەی خۆم کردو گوتم من تێبینیم هەیە، لە ڕاستیشدا من حـەزم لـەو یەکگرتنە نەدەکـرد، لەو مـاوەیەدا ئامـادە نەبووم یەک فـیشـەکیش وەربگرم، هەتا مـوچەی پاسەوانەکانی خۆشم وەرنەگرت. زۆر لە برادەران دەیانگوت ئەوەی هەیە با وەریبگرین و ئیشی خۆمانی پێ بکەین، بەڵام بڕوام بەوە نەبوو، پێم باشـبـوو دۆسـتی پارتی بم باشترە لەوەی لەناو پارتی ئیشی بکەم.

**- کە هاتیە ناو پارتی لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی قسەت نەکرد کە تۆ داواکاریت چییە...؟**

- له یه‌کـه‌م کـۆنگره‌و له کـۆبوونه‌وه‌کـانی دوای کـۆنگره‌ش، په‌شیمـانیـه‌ک هه‌بوو له‌وشتـانه‌ی که له کۆبوونه‌وه‌کـانی پێشـوو باسکرابوون.

**- په‌شیمان بوونه‌وه‌که له‌لایه‌ن پارتی بوو؟**

- به‌ڵێ، کـه من ئه‌وه‌م بینی گـوتم با مـانه‌وه‌م درێژه‌نه‌کێـشی و حه‌زیشم نه‌کرد ببمه زه‌ره‌رێک، دواتر ئه‌وان هه‌ست به‌وه بکه‌ن که من فێڵم له‌وان کردووه.

**- که ویستت جیاببیه‌وه له‌گه‌ڵ سه‌رکردایه‌تی پارتی. باستکرد که من جیا ده‌بمه‌وه؟**

- به‌ڵێ، من کاغه‌زم بۆ جه‌نابی کاک مه‌سعود نووسی، چونکه ئه‌و گـوتبـووی کـۆبوونه‌وه‌مـان هه‌یه، منیش گـوتم ناتوانم له‌و کۆبـوونه‌وه‌یه به‌شداری بکه‌م، چونکه نـاتوانم ئیش بکه‌م، بۆ ئه‌وه‌ی ده‌ستی ئێـوه‌ش نه‌برم.

**- هیچ وه‌لامیان نه‌بوو؟**

- با، سه‌ردانیانکردم.. گوتم ناتوانم ئیش بکه‌م.

**- ئه‌وکات ده‌گوترا جیابوونه‌وه‌ت له‌ژێر پاڵه‌په‌ستۆی ئێرانه، ئه‌مه چۆن بوو؟**

- به‌پێـچه‌وانه‌وه، باوه‌ڕ بکه‌ن ئه‌وکـاته‌ی ده‌مـویست جـیاببـمـه‌وه زۆربه‌ی به‌رپرسـانی ئیـتلاعـاتی ئێـران بۆ مـاوه‌ی ١١ رۆژ له مـاڵمـان بوون، تکاو رجـایان لێکردم له‌گه‌ڵ پارتی بمێنمه‌وه، ده‌یانگوت ئه‌گه‌ر

لەگەڵ پارتی نەمێنییەوە خۆت تووشی شەڕو گێچەڵ دەکەی، گوتم خوای دەکرد تێدەچووم. ئەمە بڕیارێکەو داومە، هەموو ئێران هەوڵی لەگەڵمدا، گوتم نەء. مام جەلالیش گوتی لەگەڵ پارتی بمێنەوە، گوتم ناتوانم.

**- باسی ئەوەت کرد کە پارتی هاتەوە هەولێر دەستی بەسەر بارەگای ئێوەدا گرتووە، بەڵام ئێوە پێشتر لەگەڵ یەکێتی دۆست بوون و نەیاری پارتیش بوون...**

- نا بەپێچەوانەوە، ئێمە لەگەڵ پارتی دۆست بووین، کە یەکەکە هێرشی کردە سەر پارتی، زۆرم هەوڵدا ئەو هێرشە رابگرم. هەتا یەکێتیش نیازی هەبوو لەو شەڕە بەشداری بکا، من سەبەب بووم نەمهێشت یەکێتی داخلی شەڕەکە ببێت.

**- ماوەیەک دەنگۆیەکی زۆر هەبوو کە ئێوە لەگەڵ حزبی زەحمەتکێشان یەکدەگرن و قادر عەزیز دەبێتە سکرتێری حزب، بەڵام دەگوترا ئێوە پێداگیری لەسەر مانەوەی ناوی حزب دەکەن، بۆچی رازی بووی قادر عەزیز ببێتە سکرتێری حزب؟**

- لای من ناوی حزب (حزبی سۆسیالیست)زۆر گرنگترە لەوەی من سکرتێری بم، یان نەبم، سکرتێر زۆر زۆر (٣) ساڵە ...(٦) ساڵە، با (١٢) ساڵ بێت، گرنگ نییە. ئێستاش ئەگەر بزانم حزبێک بە بڕواوە دەیەوێ بێتە ناو حزب، سکرتێرییەکەی دەدەمێ، بەمەرجێک ناوی حزب وەکو خۆی بمێنێتەوە.

**- ئێوه كه رازی بوون سكرتێرییه‌كه بۆ ئه‌وان بێ، ئه‌ی بۆچی یه‌كتان نه‌گرت؟**

- له‌سه‌ر ماوه‌ی سكرتێریی بوو، ئێمه گوتمان (٣) ساڵ سكرتێری قادر عه‌زیز ده‌یگوت (٦) ساڵ، ئێمه‌ش گوتمان زه‌مانه‌تی (٦) ساڵ ناده‌ین، پێمگوت تۆ (٣) ساڵ ته‌واو بكه، وه‌عدت ده‌ده‌مێ خۆم هه‌ڵنابژێرم، هه‌روه‌ها ئه‌وان كۆمه‌ڵێ مه‌رجیان دانا، هه‌موومان لێ قبوڵكردن. هه‌موو شتێكمان ته‌واو كردبوو، هیچ كێشه‌یه‌كمان نه‌مابوو، ته‌نها ماوه‌ی سكرتێریی نه‌بێ.

**- بۆچی ناوی سوسیالیست لای ئێوه قودسیه‌تی وه‌رگرتووه، له كاتێكدا زۆر حزبی دیكه شه‌هیدی داوه‌و مێژوویه‌كی زۆر له هی ئێوه درێژتریشی هه‌بووه، به‌ڵام ناوی خۆی گۆڕیوه‌و به‌رده‌وامیشی به تێكۆشانی خۆی داوه؟**

- دوو سێ حاڵه‌ت هه‌یه، ئێستا ئێمه حزبێكی سۆسیال-دیموكراتین، خۆت ده‌زانی زۆربه‌ی وڵاتانی ئه‌وروپا له‌لایه‌ن حیزبه سۆسیال دیموكراته‌كانه‌وه سه‌ركردایه‌تی ده‌كرێن، یان حزبی یه‌كه‌من، یان دووه‌من له ده‌سته‌ڵاتدا. سۆسیال دیموكرات بۆ ناوچه‌كه‌ی ئێمه‌ش شتێكی نوێیه‌و ئێستاش ده‌بینی هه‌ندێ له حیزبه‌كان زیاتر به ئاراسته‌ی سۆسیال دیموكراتدا ده‌ڕۆن.

جگه له‌وه‌ش ئه‌و حزبه قاعیده‌كه‌ی واده‌خوازێ، بۆ نموونه بڕۆ هه‌ر كوێره گوندێك بڵێ حزبی سۆسیالیست، خه‌ڵكه‌كه ده‌یناسن، به‌ڵام

ئەگەر ناوەکەی بگۆڕین، دەبێ ماڵ بە ماڵ بگەڕێین و پێیان بڵێین ناوەکەمان گۆڕیوەو ئێستا شەهیدەکەی ئێوە بەو ناوەوەیە.

ئێستا ئێمە زیاتر لە ١٥٠٠ شەهیدمان لە حکومەتی هەرێم بەناوی سوسیالیستەوە کراون، سبەی ئەگەر ناومان بگۆڕین هەر ئەو حکومەتە دەڵێ سوسیالیست نەماوەو ناوەکەی بخەنەسەر خۆمان.

**- کۆمەڵەی ڕەنجدەران وەک ڕێکخراوێکی مارکسی لینینی سەربەخۆ قاعیدەیەکی زۆر فراوانی هەبوو، بەڵام کە لە ساڵی ١٩٨٨ خۆی هەڵوەشاندەوەو چووە ناو یەکێتی هیچ کاریگەرییەکی لەسەر دروست نەکردو یەکێتیش ئێستا حزبێکی دەسەڵاتدارە..**

- ئەوە جیایە، کۆمەڵە خۆی لەناو یەکێتی بوو.. شتێکی دیکە لێرەدا دەمەوێ بیڵێم، ئێمە حزبێکی نەتەوەیی و نیشتمانین، زۆرجار دەڵێن حزبی ئیسلامی، یان عەلمانی، ئێمە نە حزبێکی ئیسلامیین، نەعەلمانین، بەڵکو نەتەوەیی و نیشتمانین، باوەڕمان بەوە هەیە کە ناوی حزب لەگەڵ هەلومەرجی ئێستا ناکۆک نییە.

**- تاچەند پەیوەندیتان لەگەڵ حزبە سۆسیال دیموکراتەکانی ئەورووپا هەیە کە لە دەسەڵات بەشدارن؟ ئایا ئەوان دەزانن ئێوە وەک حزبێکی سۆسیال دیموکرات کاردەکەن؟**

- بەڵێ.. لەگەڵ سۆسیال دیموکراتی نێودەوڵەتی پەیوەندیمان هەیە، پەیوەندیمان لەگەڵ زۆربەی حزبە سۆسیال دیموکراتەکانی فەرەنسا، چین، هۆڵەنداو ئەڵمانیا هەیە، بەڵام پەیوەندییەکانمان نەچوونەتە ئاستێکی

وا كە لێی رازی بین.

**- حیزبە سوسیال دیموکراتەکانی ئەوروپا هەمیشە خەڵکی رۆشنبیرو بیرمەندەکان لەگەڵیاندان، بەڵام لە حزبی ئێوە هەستدەکرێ لەو بوارەدا هەژارن و خەڵکی رۆشنبیر لەناو ئێوە زۆرکەمن، ئەمە بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

- بە دڵنیاییەوە حزبی ئێمە لە خەڵکی رۆشنبیر بێبەش نییە، خەڵکی رۆشنبیر لە بواری جۆربەجۆر لەناو حزبی ئێمەدا هەن، لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی سیاسی و ئیداری و ئابووری کاریگەری لەسەر زۆری و کەمی ئەو توێژە لەناو حزب هەیە.

**- وەک لە رۆژنامەکان باسکرا، ماوەیەک لەمەوپێش مەڵبەندی کەرکوکی حزبتان لێتان جیابوونەوە، هۆی چی بوو؟**

- هۆیەکیان ئابوورییە، چونکە ئابووری لە دەست حزبە دەستەڵاتدارەکانە،ئەو کەسانەی ئەوێ رەنگە سەیری هاورێکانیان کردبێ کە پێکەوە پێشمەرگە بوون و ئێستا ئەوان خاوەن خانووی چەند قات و ئۆتۆمبێلی دوا مۆدێلن بیر لەوە دەکاتەوە بۆچی ژیان لەو هاورێیەی خراپترە، لەوانەیە فشاریشیان لەسەر هەبووبێ.

**- لەکاتی باس و خواسی یەکگرتنتان لەگەڵ زەحمەتکێشان باس لەوە دەکرا کە تەکلیفی د. مەحمودتان کردبێ بۆ وەرگرتنی پۆستی سکرتێری حزب، ئەوە چۆن بوو؟**

- من و کاک قادر عەزیز لە سلێمانی پالاس لەگەڵ کاک د.

مەحمود دانیشتین، لە بەغداش لەگەڵی دانیشتین، پێمان گوت ئێمە هەردوولا یەکدەگرین، حەز دەکەین تۆش ببیتە سکرتێر.

**- قادر عەزیزیش بەوە رازی بوو؟**

- ئەی ئەگەر رازی نەبێ بۆ دەیڵێ.

**- چی گوت؟**

- گوتی ئێستا پێمناکرێ و ئیمکانیات لەبەردەست نییە، حزبیش ئیمکانیاتی دەوێ، گوتی من دەمەوێ حزبێکی عێراقی دروست بکەم، پێمانگوت باوەڕ ناکەین پێت دروستبکرێ.

**- دکتۆر مەحمود کاتی خۆی دەیگوت سێ شتمان پێویستە کوردایەتی.. کوردایەتی.. کوردایەتی، ئێستا بۆ بیر لە حزبێکی عیراقی دەکاتەوە.**

- چاو لە حزبەکانی دیکە دەکاتەوە، بارەگا لە کوت دادەنێ، لە بەسرە دادەنێ...

**- بەڵام ئەوانە حیزبی کوردین؟**

- قەیناکە حزبی کوردین، بەڵام کێ بەڕێوەیان دەبا؟ عەرەب بەڕێوەی دەبەن و ئەو عەرەبانە بانگهێشت دەکەن و دەیانهێنن لە کوردستان زەوییان دەدەنێ.

**- بەڵام دەکرا دکتۆر مەحمود بیری لە دروستکردنی حیزبی کوردی بکردایەوە بنکەی جەماوەریش لە باشور دروستبکا؟**

- من چیبکەم.. دەتوانی لە دکتۆر مەحمود بپرسی.

**- بۆچی زۆربەی حیزبە بچووکەکان، سکرتێرەکانیان دەبێتە ئەندام پەرلەمان، یان وەزیر، کەچی کەسێک لە مەکتەبی سیاسی یا لە سەرکردایەتی بۆ ئەو پۆستانە تەرخان ناکەن؟**

- بەنسبەت ئێمە...

**- حزبەکانی دیکەش ئاوان نەک هەر ئێوە...**

- هی ئێمە بەشەرتی چەقۆیە!

**- چۆن ؟**

- لە بەغدا ئەندامی پەرلەمانمان هەیەو کەسێکمان داناوە. بەراستی من نەمویست ببمە پەرلەمانتار، بەڵام سێ چوار ناومان رەوانەکرد، لە ناوەکان دووانیان وەرگرت. کاتی خۆی گوتم بابە پێنج شەش ناوی تریان بۆ بنووسن، لەبەر ئەوەی ئەگەر یەکێکمان نەبوو، یەکێکی دیکە بخەینە شوێنەکەی.. ئێستا دوو ناو ماوین، ئەگەر من وازی لێبێنم، یان یەکێتی، یان پارتی، یان یەکگرتوو، یەکێ لەو حیزبانە دێتە شوێنەکەم.. بۆیە مەسەلەکە ئەوە بووە نەک خۆم ئەو پۆستەم لازۆر گرنگ بووبێ. لەگەڵ ئەوانەشدا من بۆ پەرلەمانی عێراقی نەرۆیشتم، لەبەر ئەوەی پەرلەمانی کوردستانم لاگرنگتربوو، وتم هیچ نەبێ پاڵێکی پێوە بنێین بۆ ئەوەی ئیش بکاو ببێتە پەرلەمانی خەڵکی کوردستان.. من لەو رۆژانەش باسمکرد گوتم ئەگەر دەکرێ بگۆردرێ یەکێکی دیکە لە جێی خۆم دادەنێم.

**- بۆ خۆتان ناتوانن ئەو گۆڕانکاریە بکەن؟**

- دەڵێن گوایە کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردن بڕیارێکی داوە کە کەس ناتوانێ ناوەکەی خۆی رەش کاتەوەو ناوێکی دیکە دابنێ...
ئەگەر ئەوە بکرێ سبەینێ ناوی خۆم دەگۆڕم و یەکێکی دیکە دادەنێم.

**- لە کۆتایی ئەمساڵ یان سەرەتای ساڵی داهاتوو بڕیارێک هەیە لە عێراق هەڵبژاردن بکرێتەوە، پێتوایە لە کوردستانیش هەڵبژاردن بکرێتەوە؟ چونکە سەرۆک و جێگری سەرۆکی پەرلەمانی کوردستانی گوتیان ماوەی پەرلەمانی کوردستان ٤ ساڵەو پەیوەندیمان بە پەرلەمانی عێراقەوە نییە!**

- قەناعەتم وایە ئەمرۆ لە عێراقدا هیچ کەسێک بڕیاری لە دەست نییە، لەو عێراقە گەورەیە بڕیار لە دەست ئەو باڵیۆزخانە بچکۆڵەیەیە کە لە بەغدایە ئەویش باڵیۆزخانەی ئەمریکایە.. لیستی برایەتی کەرکوک بڕیاریاندا کارەکان لە نێوان خۆیان دابەش بکەن، وەفدێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکی هاتن و تەدەخولیان کردو گوتیان ئێمە وا لە دیموکراتیەت گەیشتووین کە زۆرینە رێزی کەمینە بگرێ. من لەگەڵ ئەو دیموکراتیەتەی ئەمریکام، چونکە ئەگەر بڕوات بە دیموکراتیەکەی ئەمریکا نەبێ، دەبێ لە بەغدا عەرەب بەسەرماندا زاڵ بێ. پێموایە ئەمریکا هات پێیگوتن کە ئەو ئەنجومەنە هیچ ئیشی نییە، هەتا لە کەرکوک پێک نێن، ئەوە بڕیار لە دەستی ئەوانە. بۆ نموونە کاتی هەڵبژاردنەکان یەکێتی و پارتی هەوڵیاندا هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان ٤ مانگ لەوادەی خۆی دوای بخەن، کۆمسیۆنی باڵای

هەڵبژاردن و ئەمریکا پێیگوتن عێراق یەک عێراقەو دەبێ هەڵبژاردن بکەن، ئەوانیش کردیان. لەم ماوەیەش گوێبیست بووین (بۆش) گوتی: دەبێ ڕێزی مەوعیدی هەڵبژاردن بگیرێ، واتا دەبێ لەکاتی خۆی بکرێ، بۆیە پێموایە بڕیار لە دەستی ئەمریکایە، نەک عێراق و کوردستان. ئەگەر ئەمریکا گەیشتە ئەو بڕوایەی کوردستان لەگەڵ عێراق هەڵبژاردن نەکاتەوە، ئەوا نایکاتەوە.

هەڵبەت ئێمە لەسەرەتادا بڕوامان وابوو ئەم پەرلەمانە بۆ ٤-٥ مانگە، ئەو ڕۆژەی کاک کەمال و برادەران گوتیان بۆ ٤ ساڵی دیکەیە، ئێمە لەنێو پەرلەماندا سەیری یەکترمان دەکردو پێمان خۆشبوو، ئەمانگوت بۆ خۆمان تا چوار ساڵی دیکە دەمێنینەوە «بەپێکەنینەوە»، بەڵام باوەڕ بکە بڕیارەکە لە دەستی ئەمریکایە، لە دەست هیچ کەس نییە.

**- ئێوە بۆ پێتان خۆشبوو، خۆ ئەگەر لە ساڵی ئایندەش هەڵبژاردن بکرابایەوە، ئێوە هەر دەبوونەوە ئەندام پەرلەمان؟**

- کاکە هی وا هەیە بە ڕێکەوت بووەتە ئەندامی پەرلەمان، بەخەونیش نەیدیوە، کە گوتیان بۆ ٤ ساڵی دیکەیە، سەیری یەکیان دەکردو پێیخۆشحاڵ بوون، بەڵام بۆ من گرفتێک نییە ئەندام پەرلەمان بم، یان نەبم، گرنگ ئەوەیە کورد چی بۆ خۆی دەکا. خۆ پەرلەمانی بەغدا هەموو ئیمتیازاتەکانی لێرە زیاترە، بەڵام من ئێرەم لاگرنگتربوو.. لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بڕیارەکان لە دەست خەڵکی

عێراق و کوردستان نییه، ئەوەی کە دەڵێن سەروەری عێراق بۆ عێراقیەکان گەڕاوەتەوە، ئەسڵ و ئەساسی نییە.

**- زۆر مەسەلە هەیە پێویست دەکا پەرلەمان هەڵوێستی هەبێ، ئێوە وەکو ئەندامانی پەرلەمان بۆچی راتان لەسەر ئەو شتانە نییە؟**

- من خۆم قسە دەکەم.

**- مەبەستم تەنها تۆ نییە...**

- کاکە من چی بکەم؟ پەرلەمانی کوردستان نوێنەری خەڵکی کوردستان نییە، نوێنەری حزبەکانە، تۆ ناوی یەک ئەندام پەرلەمانم بدەیێ کە لە بەرژەوەندی حزب قسە نەکا. تەنها یەک کەسمان هەیە کاک دکتۆر نوری تاڵەبانی جاربەجار هەڵدەستێتەوە دەڵێ من بێ لایەنم، بەڵام خۆ ئەویش لەسەر لیستی یەکێتیە.

میللەت دەنگی نەداوەتە ئێمە وەکو تاک، بۆ نموونە کەسێک لە شوێنێک خۆی هەڵدەبژێرێ، ماڵ بە ماڵ دەگەڕێ دەڵێ من خۆم هەڵدەبژێرم، دەنگم بدەنێ ئەو شتانەتان بۆ دەکەم، سبەی خەڵکی ئەو شوێنە دەچێتە بەردەم پەرلەمان و داوای بینینی نوێنەرەکەی خۆیان دەکەن و کێشەی خۆبانیان بۆ باس دەکەن، بەڵام خەڵکی کوردستان دەنگی بە یەکێتی و پارتی و یەکگرتوو و کۆمەڵ و سۆسیالیست و هەموو حزبەکان داوەو حیزبەکانیش خەڵکیان هێناوە دایانناوە، واتا ئەگەر خەڵکی کوردستان داوای شتێک لە پەرلەمانی کوردستان بکا، دەبێ لە رێگای حزبەکانەوە داوایەکە بکەن، ئەندامێکی پەرلەمانیش

ئەگەر بیەوێ ئیشێک بکا ، دەبێ بڵێتە حزبەکەی دەمەوێ بچم لە فلان ناوچە کاربکەم، واتا حیزبەکان ئەلقەی پەیوەندی نێوان خەڵک و پەرلەمانن، بڕیار لە حزبەکان دەردەچێ، بۆیە پێویستە نە ئێمە لێمان تێکبچێ وابزانین نوێنەری راستەقینەی میللەتین، نەمیللەتیش لێی تێکبچێ و وابزانن ئێمە راستەوخۆ نوێنەری ئەوانین و بێن گلەییمان لێ بکەن، دەبێ میللەت بچێ گلەیی لە حزبەکان بکات، هەروەها ئێمەش بەهەمان شێوە.

**- بیرتان لەوە نەکردۆتەوە لە هەڵبژاردنی داهاتوودا لەگەڵ حزبێکی گەورە تەحالوف بکەن، یان هەروەکو جاران کورسیەک، دوو کورسیتان دەبێ؟**

- ئێمە پێمانوایە لە هەڵبژاردنی ئاییندە گۆڕان دەبێ. ئەو هەڵبژاردنەی پار ساڵ دیموکراتیەتێکی تەواو نەبوو، دەنگێکی یەکجار زۆر درا، هەندێ بەناوی پاسەوانی سندوق بەبێ حیساب دەنگی دا، لەشکرو هێزی چەکداری دوو حیزبەکە بەبێ سنور دەنگیاندا. لەلایەکی دیکەوە لەبەر ئەوەی ئەمریکا لە خوارووی عێراق کێشەی هەبوو، بە ئێرەی گوت برۆن بۆ خۆتان چی دەکەن، بیکەن.

لە هەڵبژاردنی ساڵی ۱۹۹۲ یەکێتی و پارتی یەکە ٤٤٪ی دەنگەکانیان هێنا ، پاشان دەنگی حیزبەکانی دیکەشیان بەسەر خۆیاندا دابەشکردو بوونە (٥٠ بە ٥٠) لە هەڵبژاردنی ئەمجارە هەریەکەو ۳۹٪ یان هێناوە، ئێستا زیاتر لە ۳۰ کەس بەرەنگ و روو

نە یەکێتیەو نە پارتی «نازانم لە بنەوەش چین»، ئەگەر ئەو ٣٠ کەسە هیچ قسەش نەکەن و بەبێ دەنگی دانیشن، مانای وایە گۆڕان لەناو پەرلەمان هەیە، گۆڕان لەرای خەڵکی کوردستان بووە، بۆ هەمووی دەنگی بە یەکێتی و پارتی نەداوە؟

لەبەر ئەوە بڕوام وایە لە هەڵبژاردنی داهاتوو ئەو ٣٠ کەسە ئەگەر بۆ ٤٠ کەس زیاتر بەرز نەبێتەوە، لە ٤٠ کەمتر نابێ.

**- ئەوە بەشێوە گشتیەکە بوو، مەبەستم ئێوەیە؟**

- بەدڵنیاییەوە، ئێمەش بەشێکین لەو خەڵکە، لە پەرلەمانی پێشوودا یەک کورسیمان نەبوو، ئێستا دوو کورسیمان هەیە، ئەمجارە دەیکەین بە سێ چوارێک. لەلایەکی دیکەوە پێکهێنانی لیستی هاوبەش لە نێوان حزبەکان کارێکی ماقول نەبوو، من لایەنگری ئەوە نەبووم. ئێمە پێشتر دەمانگوت یەکێتی و پارتی بۆ ڕێکناکەون، بۆیە باش نەبوو ئێمە دژی ئەوە بین، بەراستی ئەگەر بیانگوتایە هیچیشتان نادەینێ و نوێنەریشتان نابێ، هیچ قسەیەکم نەدەکرد، کاتێکیش هاتن لەگەڵ ئێمە قسەیان کرد، گوتمان مادەم ئێوە گەیشتوونەتە ئەنجام، هیچیشی بۆ ئێمە تێدا نەبێ، ئێمە لەگەڵ ئەو ڕێککەوتنەی ئێوەداین. ئێستاش ئەگەر بەرژەوەندی کورد لەوەدابێ لیستی حیزبەکان پێکەوەبێ، ئێمە لاریمان نابێ، ئەگەر واش نەبوو، بەدڵنیاییەوە دەچینە هەڵبژاردن و هاوپەیمانێتی دروست دەکەین.

**- تائێستا لەگەڵ ئەو حزبانەی لە قەبارەی خۆتان نزیکن، پرس و**

**راتان نەکردووە کە بۆ هەڵبژاردنی ئایندە لیستی هاوبەش دروست بکەن؟**

- بەڵێ. دوای هەفتەیەک کۆبوونەوەیەکی دیکەمان کرد. هەندێ لە حیزبەکان گوتیان هەر کەس بۆخۆی هەوڵبدا، تومەز دواتر بانگیان کردبووین، ئێمەو حیزبی شیوعی دانیشتین کۆنگرەی رۆژنامەگەری بگرین و رایبگەیەنین کە پێکەوە بەیەک لیست دادەبەزین، لە ناو قسەکردندا بووین، ئەوان یەکسەر تەلەفۆنێکیان بۆ کرا، ئیتر پەشیمان بوونەوەو نەیانکرد، دیارە پێیانگوتبوون وەرن ئێمە ۳ کورسیتان دەدەینێ، واز لە حزبی سوسیالیست بێنن، ئەوانیش وازیان هێنا.

**- هیچ جارێک داوای لەو شێوەیان لە ئێوە نەکردووە؟**

- نەخێر..ئێمە لەگەڵ حزبی شیوعی دانیشتین بۆ ئەوەی بەجدی قسە بکەین، هەموو راگەیاندنەکانی حیزبی شیوعی و حیزبەکانی دیکەیان کۆکردەوە، بە منیان گوت بە پەلە وەرە بارەگای حیزبی شیوعی، منیش چووم و گوتیان با رایبگەیەنین، لەپڕ زەنگی تەلەفۆنێک هات و چوونە دەرەوەو هاتنەوە گوتیان چۆنە بیخەینە سبەینێ، واتا نایکەین. من وتم نایکەین، مەبەستم ئەوەیە بڵێم وەزعی حیزبەکان بەو ئاقارەدا دەڕوات، هەموویان بە دوای ئیمتیازاتدا دەگەڕێن.. بۆ پارتی و یەکێتیش، ئەگەر لەگەڵ یەکێکیان یەکبگری، ئەوەی دیکە وا دەزانێ لە دژی ئەوە، ئێستا نێوانیان باشە، هاوپەیمانی کردن لەگەڵ هەر یەکێکیان بەستراوە بە هەلومەرجی ئەوکاتەوە، بە دڵنیاییەوە ئێمە پێمان خۆشە. هەرچەندە لە بەغدا ئەوان هەڵوێستیان بەرامبەر حیزبەکانی هاوپەیمانی خۆیان لە لیستی هاوبەشدا باش نەبووە، لیستی هاوپەیمانی کوردی لە ٦ حیزبی

کوردی پێکهاتووه، لیستی شیعەش لە ٢٦ حیزب و ڕێکخراو پێکهاتووه، ئەوان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ حیزبەکانی دیکە ٢٦ کەسیان دیاری کردبوو، بەڵام لە لیستی ئێمە تەنها دووکەسی پارتی و دووکەسی یەکێتی دیاری کرابوو، بێ ئەوەی ئێمە ئاگاداربین.. لە ٩ وەزیرو ئەو هەمووە جێگر وەزیرو پۆستانە، تەنانەت یەک فەرمانبەریشیان بە حیزبە هاوپەیمانەکانی خۆیان نەداوە، جا چۆن جارێکی دیکە لەگەڵیان بڕۆم، بە پێچەوانەوە لیستی شیعەکان وانەبوون، ئێستا مەرج دادەنێن فلان وەزارەتتان بۆ دادەنێین، بەڵام وەزیرەکە دەبێ فلان بێ. ئێ بۆ؟ ئەگەر ئەو وەزارەتە بۆ حیزبەکەیە تۆ چ حەقت هەیە ئەو حزبە کێ دەکاتە وەزیر.. لێرە کارکردن بەو نەفەسەیە. ئێستا لە بەغدا دیموکراتیەتی پتر هەیە، لە پەرلەمان خەڵک هەڵدەستێ قسە دەکا، ڕەخنە لە وەزیرەکان دەگرێ، ئێمە لە پەرلەمانی کوردستان حەزدەکەی ڕۆژێ شەرعیەت دەدەینە ١٠ وەزیر، بەڵام فەرمانبەرێکمان پێ لانادرێ، لەبەر ئەوەی ئێستا پەرلەمانی کوردستان چاوەڕێی کەرەمی خواو هەردوو مەکتەبی سیاسیە بەڵکو بگەنە ڕێککەوتن بۆ یەکگرتنەوەی ئیدارەکان.. ئێستا پەرلەمان هەقە بڕیارێک دەربکا بڵێ هەردوو حکومەت شەرعیەتیان نەما، پێویستە حکومەتی نوێ رابگەیەندرێ، بەڵام ناتوانێ ئەو شتە بکا.

**- بەڵێنی هیچ وەزارەتێ، یان وەزیرێکی هەرێمیان پێنەداون؟**

- لە بەغدا هەر هیچیان بە هیچ حزبێک نەدا. لە کوردستانیش هاتوون ژمارەی وەزارەتەکانیان دوو ئەوەندە زیاد کردووەو هەرچی وەزارەتە گرنگەکانیشن، خۆشیان رازی نین تێکەڵیان بکەنەوە، هەرچی وەزارەتە مومتازو زۆرباش و باشەکانە بۆخۆیان دابەشیان کردووە،

گەڕاون کام وەزارەتی کە تلّپی تەڕایی تێدا نییە دەیا ەرێ بیدەنە حیزبەکان، هێشتا لەسەر ئەوەش ڕێک نین. بە رەسمی بە ئێمەیان گوتووە وەزیرێکی هەرێم بە ئێوە دەدرێ، بەلاّم ئێمە گوتوومانە گرنگ بەشداریکردنە، ئەگەرنا وەزیرێک هەبێ و نەبێ گرنگ نییە.

**- زۆرجار کە راشکاوانە قسە دەکەی، لەلایەن پارتی و یەکێتییەوە رەخنەت لێ نەگیراوە؟**

- نەوەللا... رەخنەم لێ ناگیرێ، بۆچی رەخنەم لێبگرن؟ ئەوان هەموو شتێکیان بۆ خۆیان بردووە، لە زاخۆوە تا دەگاتە خانەقین هەرچی شتی باشە بۆ خۆیان بردووە. ئێمە تەنها قسەمان بۆ ماوەتەوە، نەیەڵن قسەکەش بکەین!؟ ئێمە لە پێناوی هاتنەدی ئەو بارودۆخەدا هەزاران کەسمان شەهید بووە، بێ دەست و قاچ ماونەتەوە، من خۆم ٦ جار بریندار بوومەو دوایین جار لە کەرکوک برینداربووم. لە پێناوی ئازادیدا خەباتمان کردووە، کە رەخنە دەگرم بۆ چاککردنە، ئەوەی من دەیڵێم لە ناخی دڵی خۆشیاندایە، بەلاّم ئەوان ناتوانن بیلێن لەبەر ئیلتزاماتیان بە حکومەتەکانی ناوچەکەو بە وەزعی سیاسی.. دواتر ئێمە نە لە دوای شەڕی عێراق- ئێران دروستبووین و نە لە دوای راپەڕین و رزگارکردنی عێراق دروستبووینە، لە شاخ پێشمەرگە بووین، ئێستاش کە گەورەترین قوربانی و فیداکاریمان بەرکەوتووە، بچووکترین ئیمتیازاتی ئەو ولاّتەمان بەرنەکەوتووە، هەردوولاش وابیر دەکەنەوە کە ئیمتیازاتە زۆرەکەی خۆیان پێ کەمەو کەمەکەی ئێمەیان پێ زۆرە.

**- باشە وەک خۆت دەڵێی ئەوەندە ساڵە خەباتتان هەیەو پێشمەرگە بوونە، ئێستا خۆت لە کوێدادەبینیەوە، ئایا بەوەی ئێستا تێیدایت**

رازیت؟

– من لەیەک شت مورتاحم، ئەو خەباتەی کردوومانە درێژەپێدەری تێکۆشەرەکانی پێشوومانە کە بە نائومێدی سەریان نایەوە. ئێستا گرنگ نییە خۆم، یان حزبەکەم لە پەراوێزداین، گرنگ سەرکەوتنی میللەتەکەیە، من پێشتر کە لە پەرلەمانی عێراق بووم هەندێک کەسی تێدابوو، دەیانگوت پێشتریش لە پەرلەمانی عێراق بووینە تا رووخانی سەردەم، وێنەم گرتوون کە لەم دیوو لەودیو دانیشتبوون و لەمن زیاتر قسەیان دەکرد. پێموایە ئەوە بۆ قیەمی سیاسی دەگەڕێتەوە، بۆ یەکێتی و پارتی دەگەڕێتەوە کە تا چ رادەیەک ئەو خەڵکە تێکۆشەرو ماندووەی سالانی خەبات بە کۆنە مستەشارێک ناگۆڕنەوە، لەوانەیە زۆرکەس بەمنی گوتووە تۆ بۆچی چوویتە ناو پەرلەمان، بەلام من پەرلەمان بە شوێنێکی پیرۆز دەزانم، جا کەسەرەکەی پەرلەمان چۆن بێ و چۆن نەبێ گرنگ نییە، قسەی خۆشمی تێدادهکەم، جا پێیان خۆشبێ، یان ناخۆشبێ، لە کۆبوونەوەی ئەو رۆژە کاک عەدنان بەمنی گوت تۆ لە پێشدا قسە مەکە، لەبەر ئەوەی من دەزانم ئەو و کاک دکتۆر کەمال هەردووکیان ئەندامی مەکتەبی سیاسین و لە کۆبوونەوەکان بەشداردەبن و رێک دەکەون، دێنەوە هەریەکەیان لیستەکەی خۆیان بانگ دەکەنە ژوورێک وەکو مەڵبەندو لق قسەیان بۆ دەکەن و دەڵێن لەسەر فلان مەسەلە موناقەشەی یەکتر مەکەن، هێندێکی وەک ئێمە بەپێی پەتی تێدەکەوین و موناقەشە دەکەین، دەڵێن کاکە خاڵە سەرەکییەکانمان پێ بلێن کە خۆتان لەسەری رێک کەوتوون، با دەنگتان بدەینێ، بۆ ٤ سەعات ئێمەی پێ هیلاک دەکەن، سەیرەکە لەوەیە ئەوان لەسەری

رێککەوتوونەو دێن ئێمەی پێ هیلاک دەکەن، جا ئێمە ئەوشتانە دەزانین، بەڵام هەندێک پەرلەمانتار ئاگای لە هیچ نییەو دێ موناقەشە دەکا.. شتێکی دیکە دەمەوێ باسی بکەم، ئێستا ئێمە وەکو حزبێکی سیاسی لە بڕیارەکانی عێراق و کوردستان بەشدارین و پەیوەندیمان لەگەڵ هەموو وڵاتانی دونیا هەیە بە ئەمریکاشەوە.

**- پەیوەندییەکە لە چ ئاستێکدایە؟**

- وەکو یەکێتی و پارتی نییە، بەڵام پەیوەندییەکی دۆستانەمان هەیەو دەمانناسن، خەڵکمان داوەت دەکەن، بۆ نموونە لەو ڕۆژانە ڕۆژنامەکەی ئێمەیان بۆ ئیمارات داوەتکردووە.

**ئەمریکا رای لەسەر کۆنترۆڵکردنی وەزعی سیاسی کوردستان لەلایەن ئەو دوو حیزبەوە چۆنە؟**

- ئەمریکا گیرۆدەی گروپە تیرۆریستیەکان بووە، ئەگینا خۆتان دەزانن لە سەرەتا هاتە عێراق هەموو بازگەکانی پێچایەوە، هەتا ژمارەی پاسەوانانی کاک مەسعودو مام جەلالی دیاریکرد کە دەبێ یەکەو ٤٠ پاسەوانیان هەبێ. بەڵام پێمـوایە ئەو کێشەو گرفتانەی عێراق لە قازانجی کورد بوو، بەتایبەتی یەکێتی و پارتی، دەبێ ئەوان لە خوا بپاڕێنەوە کە وەزعی ناوەڕاستی عێراق هەروا بەردەوام بێ بۆ ئەوەی ئەمریکا نەپەرژێتە سەریان.

**بەڵام ئەگەر ئەمە بەردەوام بێ ناپەڕێتەوە ناو کوردستانیش، وەک دەبینن ئەوا ئیرهاب گەیشتە ناو شارو ماڵەکانی کوردستانیش؟**

- راستە گەیشتە کوردستان، بەڵام لەبەر کەمتەرخەمی دەزگاکانی

ئاسایش گەیشتووە، خۆ لە دەرەوە نەهاتووە، لێرە ئاسایش کەمتەرخەم بووە. ئەو هەموو تەقینەوەیە روویدا رۆژێک کەس نەبوو بڵێ ئەرێ کاکە حکومەت تۆ چیت کردووە؟ وەزیری ناوخۆ یا بەڕێوەبەری ئاسایش دەست لەکار بکێشەوە، لە هەولێر ژوورەکەی وەزیری ناوخۆیان تەقاندەوە، لە سلێمانیش چوونە ماڵی کاک بەرهەم و چوونە ژوورەکەی، کەس گوتی وەزیری ناوخۆ دەست لە کار بکێشەوە؟!.

**- لە قسەکانت باست لەوەکرد کە پارتی و یەکێتی لە هەڵبژاردنی ١٩٩٢ یەکەو ٤٤٪ یان هێناو لە هەڵبژاردنی ئەو دووایییەش ٣٩٪ یان هێناو گوتیشت ئەمجارە کەمتر دێنن، لەسەر چ بنەمایەک وا دەڵێیت؟**

- داواکاری خەڵک جێبەجێ ناکرێ، بۆ نموونە سەرەتاییترین پێداویستی خەڵک کارەبایە، کەچی تائێستا چارەسەرنەکراوە.

**بەڵام کێشەی کارەبا کێشەی هەموو عێراقە...؟**

- ئێمە پەیوەندیمان بە هەموو عێراقەوە چییە؟ ناڵێین ئێمە ١٣ ساڵە کێشەمان نییە.. دوای کارەبا، ئاو نییە، لە سلێمانی ماڵی واهەبووە ٧ رۆژ ئاوی نەبووە، یا مەعقولە دەبەی بەنزین بگاتە ١٥٠٠٠ دینار؟! بۆ کەس قسە ناکا؟ خەڵک لە دڵی خۆی نارازییە، بەڵام قسە ناکا، ئەوەش هەموو بۆ نەبوونی دەستوور دەگەڕێتەوە.. لە سلێمانی گوتوویانە ئەو تەکسیانەی ژمارەی مووسڵ و بەغدایان بەستاوە، نابێ کار بکەن، ئەی باشە ئەو شارانە شاری عێراق نین، ئەگەر تۆخۆت بە عێراقی دەزانی، بۆ لە نێوان ئێرەو سلێمانی تەلەفۆن کار ناکا، لەبەر بەرژەوەندی دوو کۆمپانیایە، باشە بەرژەوەندی میللەت گرنگترە یا هی دووکەس و دوو ئیدارە.

**دکتۆر مەحمود عوسمان:**

## راستە من زۆر لە دەرەوە بوومە، بەڵام لێرە براکوژی هەبووە، بێم چیبکەم؟! نەشەڕە تفەنگم زانیوە، نە بڕواشم پێی هەبووە...



د. مەحمود عوسمان کەسایەتییەکی دیارو ناسراوی ناو بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانییەو هەر لە شۆڕشی ئەیلولەوە، رۆڵێکی کارای هەبووە، بەڵام زیاتر رۆڵی ئەو مرۆڤە خزمەتکردنی پێشمەرگە بریندارەکان بووە. دوای نسکۆی ١٩٧٥ د. مەحموود رێکخراوێکی بچووکی راگەیاند، کە لەگەڵ چەندین سەرکردەو هەڤاڵی ئەوکاتی بوو، دواتر پێکەوە لەگەڵ ئەو هەڤاڵانە چوونەتە نێو بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان. بەڵام د. مەحموود لە کۆنگرەی ١٩٨١ ئیدی سەرکردایەتیی لە دەستداو تا ئێستا ئەندامی سەرکردایەتی هیچ حزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە. هەرچەندە زۆر لە کادیرانی سۆشیالیست، نەیاندەزانی د. مەحموود لە سەرکردایەتی نییە، چونکە وەک کەسی دووەمی سۆشیالیست دادەنرا.

بە هەرحاڵ د. مەحموود کەسێکە وەک خۆی دەڵێ، چۆلەکەیەک بە دەستی ئەو یان بە فەرمانی ئەو نەکوژراوە، لەنێو ئەم هەموو شەڕی ناوخۆییەشدا، سەرکردایەتی هیچ بەرەیەکی شەڕی نەکردووە، هەندێ جاریش کە بێ ئومێد بووە، حزبی بەجێ هێشتووەو پەنای بردۆتەبەر هەندەران، ئەمەش بۆ ئەوانەی کاری سیاسەت دەکەن زۆر ناگونجێ، چونکە سەرکردە ئەوکاتە سەرکردەی سەرکەوتوو دەبێت، کە بەرگەی رۆژە تەنگەکان بگرێ و لە گەرمەی شکستەکاندا، بەرنامەی سەرکەوتن دابرێژێتەوە.

**د. مەحموود حەزدەکا ڕۆڵی پیاوچاکانەو ریش سپییانە ببینێ، هەمیشەش لەبەردەم راگەیاندنەکانی بێگانەو کوردی وجودی هەیە، حەز بە راگەیاندن دەکات و نایەوێ بوونی ئەو لە هەر لیژنەو ڕووداوێکدا کە هەیبێت، پەراوێز بکرێت، بۆیە لە رێگای راگەیاندنەکانەوە لە پەراوێزبوون خۆی قورتار دەکات.**

**سەرەتای هاتنت بۆ ناو شۆڕشی ئەیلول بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

- من لە ساڵی ١٩٥٤ هاتمە ناو پارتی، ئەوکات پۆلی چواری دواناوەندی بووم، لە مانگی ئاداری (١٩٦٣)ش هاتوومەتە ناو شۆڕشی ئەیلول.

**هەمزە عەبدوڵڵا لە دامەزراندنی پارتییەوە تا ساڵی ١٩٥٨ ڕۆڵێکی کارای هەبوو لە ناو پارتیدا، بەڵام دوای گەڕانەوەی بارزانی نەمر لە سۆڤیەت، هەمزە لادرا، ئەوەندەی ئاگاداربیت، هەمزە بۆچی لادرا؟**

- ئەو ماوەیەی کە خوالێخۆشبوو سەرۆک بارزانی لە سۆڤیەت بوو، ئیبراهیم ئەحمەدو هەمزە عەبدوڵڵا ڕۆڵی سەرەکیان لەناو پارتیدا هەبوو، جارێک ئەو سکرتێر بوو، جارێک ئەویدیکە، جیاوازیشیان لە نێواندا هەبوو، ئەوکاتەی بارزانی لە سۆڤیەت بوو، هەرچەندە سەرۆکی حیزب بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوانەی ئێرە زۆر ئاگایان لەیەک نەبوو، چونکە پەیوەندیکردن بەیەکدییەوە ئەستەم بوو، ئەو ناکۆکییەی نێوانیان هەرمابوو، کە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا لە ساڵی ١٩٥٨

له سۆڤیەت هاتەوە، لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد ڕێک نەبوو، هەتا پێش ئەوەی بچێتە سۆڤیەتیش لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد زۆر ڕێک نەبوو، لەبەر ئەوە کە هاتەوە، ناکۆکی یەکەم لە نێوان بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەد دەستی پێکرد، پێی باش نەبوو ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێر بێ، یەکەمجار ئەوی لاداو هەمزە عەبدوڵلا بوو بە سکرتێر. واتا کە بارزانی هاتەوە ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێر بوو، لە پێشدا ئیبراهیم ئەحمەد لادرا، بارزانی پشتگیری هەمزە عەبدوڵلای کرد تا بۆ سکرتێری پارتی هەڵبژێردرێ، ئەوەبوو بوو بە سکرتێر، بەڵام ماوەی سکرتێریاتیەکەی لە ساڵێک کەمتر بوو، مەکتەبی سیاسی تازە دانرا، هەمزە عەبدوڵلا بوو بە سکرتێر، ئەوەبوو هەمزە عەبدوڵلاو مەکتەبی سیاسی لە رادەبەدەر بەرەو حیزبی شیوعی چوون و پشتگیری و پشتیوانی حیزبی شیوعی بوون.

**ئەوە لە چ ساڵێک؟**

- لە کۆتایی ساڵی ۱۹۵۸و سەرەتای ساڵی ۱۹۵۹ بوو، کە زیاد لە رادە رۆیشتن، لە هاوینی ۱۹۵۹، بیرم دێتەوە، هەڵبەت بەهۆی حیزبی شیوعیەوە لەگەڵ کەریم قاسم تووشی کێشەبوون، مەلا مستەفاش لێیان رازی نەبوو، چونکە ئەو رازی نەبوو کە ئاراستەکە بەرەو حیزبی شیوعی و ئەوانە بڕوا، لەبەر ئەوە ئەو هەنگاوێکی دیکەی هاوێشت، هەمزە عەبدوڵلاو جەماعەتی لابرد، بەو ئیعتبارەی ئەوانە لە جیاتی ئەوەی پارتی بن، مەیلەو حیزبی شیوعین و بەرەو

حیزبی شیوعی دەڕۆن، ئینجا جارێکی دیکە ئیبراهیم ئەحمەد بووەوە سکرتێر... هەڵبەت هەمزە کە لادرا، لابردنەکەی وادانا کە بەشێوەیەکی نیزامی نەبووە، مەکتەبی سیاسیەکەش کەسیان هیچیان نەکرد.

**ئەوانەی مەکتەبی سیاسی کێ بوون؟**

- خوایان لێخۆشبێ خەسرەو تۆفیق و نەژادی ئەحمەد عەزیز ئاغاو حەمید عوسمان و ساڵح حەیدەری بوون، هیچیان نەکرد بڵێن حیزب دروست بکەن، یا رێکخستنێک دروست بکەن، ئیبراهیم ئەحمەدو ئەوانی هاتنەوە سەرکارو ئیبراهیم بووە سکرتێر.

**تۆ لە ساڵانی شەستەکان تا هەفتا پەیوەندیت لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد چۆن بوو؟**

- ئێمە کە لە ساڵی ١٩٦٣ هاتینە ناو شۆڕش، زیاتر وەکو دکتۆرێک رۆڵی خۆمان زۆر دیت، چونکە ئەوکات لەناو هەموو شۆڕشدا دوو دکتۆر هەبوون، من و دکتۆر ئەحمەد کەمال ساڵح، ئەو لەلای ناوچەی مەکتەبی سیاسی بوو، منیشیان بۆ لای بارزانی نارد لە ناوچەی بارزان، ئەو ساڵە شەڕی قورس لەسەر ناوچەی بارزان بوو، بە مەسەلەی برینداراو خەستەخانە سەرقاڵ بووین، نە دەپەرژاینە سەر هیچی دیکە. بەو هۆیەشەوە پەیوەندییەکی زۆرمان لەگەڵ مەلا مستەفاو شێخ ئەحمەدو ئەوانەی لە بارزان بوون، پەیداکردبوو، لەو ماوەیە پەیوەندییەکی ئاساییمان لەگەڵ مەکتەبی سیاسی هەبوو، لەبەر ئەوەی دووربووین لە مەکتەبی سیاسی، وەک گوتم ئێمە لە ناوچەی

بارزان بووین، ئەوە لە ساڵی ١٩٦٣، کە هاتینە ناو ساڵی ١٩٦٤ ئینشقاقەکە دروست بوو...

**لەو ئاخیرەدا، هەردووکتان لە لەندەن بوون، پەیوەندی نێوانتان چۆن بوو؟**

- ئاسایی بوو.

**لەکاتی گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٧٠، تۆ لەناو پارتی لە ئاستێکی بەرزدابوویت، ئەوکات هەڵوێستت چی بوو لە بەرامبەر گفتوگۆکردن لەگەڵ بەعس؟**

- من سەرۆکی وەفدی کوردی بووم لەو گفتوگۆیانەدا، هەڵبەت گفتوگۆکان لە ١٩٦٩ دەستی پێکرد، بەڵام لە ١٩٧٠ ڕێککەوتنەکە کرا کە بە ڕێککەوتنی ١١ی ئادار بەناوبانگە.

**ئەی لە لێخۆشبوون لە باڵی مام جەلال، ڕۆڵت هەبوو؟**

- بەڵێ پێمباشبوو.

**پێشنیارەکە لەلایەن کێ کرا؟**

- وەڵڵا، مەلا مستەفا بۆ خۆی لە هەمووان زیاتر پێی باشتر بوو، ئێمە زۆربەی هەرە زۆرمان رامان وابوو، لەجیاتی ئەوەی ئەوان لە بەغدا بمێننەوەو کە ئێمە لەگەڵ بەعس تێکچووینەوە، بەعس لە دژی ئێمە بەکاریان بێنێتەوە، بێنەوە ناو شۆڕش باشترە ئەوانیش پێیان باش بوو کە یەکبگرینەوە بۆ ئەوەی ئەو وەرەقەیە لە دەست ڕژێمی بەعس لابەرین، چونکە بڕوامان وابوو کە ڕێککەوتن ڕەنگە ئاسان

نەبێ، لەبەر ئەوە لە کۆمیتەی ناوەندی بڕیاردرا، ئەوانیش وەڵامیان باش بوو، گفتوگۆیان لەگەڵ کراو هاتنەوە، یەکگرتنەوەکەش یەکێک بوو لە بەرهەمەکانی ١١ی ئادار.

**لە ساڵی ١٩٧٤ پارتی ٧ ئەندامی مەکتەبی سیاسی هەبوو، بەڵام مام جەلال و ئیبراهیم ئەحمەد لەو مەکتەبی سیاسیە نەبوون، ئایا لەبەر هەڵوێستی پێشتریان بوو، یان هۆکارێکی دیکە هەبوو کە ئەوانە نەبنە ئەندامی مەکتەبی سیاسی؟**

- خۆی لە تەمموزی ساڵی ١٩٧٠ کۆنگرەی (٨) گیرا، لەو کۆنگرەیە ئێمە لەگەڵیان ڕێک نەبووین، ئەوان لە بەغدا بوون، هەتا بیرم دێتەوە لە کۆنگرە، باسی خیانە عوزماکرا، پاش کۆنگرەکە ئەوان هاتنەوە، لەو وەختەی کە ئەوان هاتنەوە تا شۆڕش تێکچوو، کۆنگرەی دیکە نەبەسترا، کۆنگرەی ٩ کەوتە ساڵی ١٩٧٩، لەبەر ئەوەی هیچ کۆنگرە نەکرا، عادەتیش وایە کە یەکێک دوورکەوتۆتەوەو دێتەوە، دەبێ کۆنگرە بڕیاربدا، ئێمە هاوکاریمان دەکردن، بەڵام نەهاتنە سەرکردایەتی، چونکە لەدوای هاتنەوەیان هیچ کۆنگرەیەک نەبەسترا کە سەر لەنوێ سەرکردایەتی حیزب هەڵبژێرێتەوە.

**هەڵوێستی تۆ لە بەرامبەر نسکۆی ١٩٧٥ چۆن بوو؟ ئێستا دوای ٣٠ ساڵ لەو نسکۆیە دەتەوێ بڵێی چی؟**

- لەکاتی خۆی دەربارەی نسکۆی ١٩٧٥، کوراسێکمان نووسی، شەرحمان کردووە، من رام وابوو؛ ریککەوتنی جەزائیر رۆڵێکی

سـەرەکی هەبووە لەو نسکۆیەدا، چونکە ئەسـاسـەن سـەدام ئەو ڕێککەوتنەی بۆ لەناوبردنی شـۆڕش کـردبوو، سـەدام پێش ئەوە بە ئێمەی گوتبوو: من ساڵێک شەڕتان لەگەڵ دەکەم ئەگەر نەمتوانی بە شەڕ کۆتاییتـان پێ بێنم، ئەوا تەنازول بۆ هەر لایەنێک بێ دەیکەم، بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشەی کورد کۆتایی پێبێت.

**بە ئاشکرا ئەوەی گوت؟**

- نا، خەبەری بۆمـان ناردبوو، بەڵام پێمـان نەگەیشـتبوو، هەندێ جار، بەهۆی هەندێ ئیـعـتـیـبـارات، هەواڵ بە نهـێنی دەمـێنێـتـەوە، ئەوکاتەی ئەو نسکۆیە دروست بوو، واقیعێک بۆ ئێمە دروست بوو، ئێران یارمەتیمان لێ دەبڕێ، سەرکردایەتیش کۆبووەوەو بڕیاریدا شەڕ نەکات، بەڵام ئەوکاتە من رایەکی دیکەم هەبوو، پێموابوو ئەگەر وەکو شەڕی پارتیـزانیش بێ، هەندێ شت بکرێ، لەوانە بوو ببێـتە هۆی تێکچوونی ڕێککەوتنی جەزائیـر، چونکە سەدام ڕێککەوتنەکەی بۆ کۆتایی پێـهێنانی شۆڕش کردبوو، کە ببینێ شۆڕش کۆتایی نایێت، ئەویش ئەو تەنازولە بۆ ئێـران ناکـات، هەڵبـەت ئەوە رایەک بوو، رای دیکەش هەبوو دەیگوت ئەمە ناکرێ، چونکە ئەگەر شەڕ بکرێ، عێراق و ئێران و هەموویان پەلامارمان دەدەن، ئەوە رای زۆرینەبوو، ئێمە کە پێمان وابوو شەڕی پارتیزانی بکەین، چونکە خەڵک تەئیدمان دەکاو پارەمان هەیەو چەکمان هەیە، کەمینەیەک بووین.

**دوای نسکۆ بۆ کوێ چوویت؟**

- دوای نسکۆ من ساڵ و نیوێک لە ئێران بووم، لە نەخۆشخانەی کەرەج وەک دکتۆر کارم دەکرد، بۆ ئەوەی پارە پەیداکەم و پێی بژیم، لە دواییدا چوومە سوریا، لەوێ ماوەیەک مامەوە، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٧ هاتمەوە کوردستان. لە پاشان چوومە دەرەوەو هاتمەوەو بەم شێوەیە.

**ئەوکاتی ئەو نامیلکەیەتان نووسی ئەوەی لیژنەی تەحزیری پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئێران بوویت؟**

- من لە ئێران بووم، هەندێکمان لە ئێران بووین، هەندێکیش سوریا، چونکە نامیلکەکە لە سوریا دەرچوو.

**ئەوکاتەی کە ئەو نامیلکەیەتان نووسی، سەرکردایەتی کاتی دامەزرابوو؟**

- با، دامەزرابوو، یەکێتیش هەبوو، هەردووکیان دروست بووبوون، یەکێتی لە ١٩٧٥/٦/١ دروست بوو، سەرکردایەتی کاتی وابزانم دوو هەفتەیەک پێشتر دروست ببوو.

**ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵ سەرکردایەتی کاتی نەبوو؟**

- نەخێر.

**هەردووکیشتان خۆتان بە مەرجەعی پارتی دەزانی؟**

- ئەوان خۆیان بە مەرجەعی پارتی دەزانی، لەبەر ئەوەی بنەماڵەی بارزانییان لەگەڵ بوو، هەرچەندە ئەو سەرکردایەتیە رەخنەیەکی زۆریان لە کاک ئیدریس هەبوو، دەیانویست وا خۆیان نیشان دەن، کە لەگەڵ

کاک مەسعودن، بەڵام نەیانتوانی جیاوازی (تەفریقە) بخەنە نێوان ئەو دووەوە، چونکە ئەوانە یەکن، ئەوان (سەرکردایەتی کاتی) لە ناوچەیەکی دوور بوون، لە سنوری تورکیا بوون، سەدی سەد لەژێر ئەوامری ماڵی مەلا مستەفا نەبوون، بەڵام پەیوەندیان هەبوو، کە لە ساڵی ١٩٧٩ کۆنگرەی نۆیەم کرا پارتی بە تەواوی کەوتەوە ژێر دەسەلاتی ماڵی بارزانی و بە رەسمی کاک مەسعود وەکو سەرۆک دانرا، کاک ئیدریسیش لە مەکتەبی سیاسی مایەوە، ئەوانی سەرکردایەتی کاتی بوون لادران و نەمان، هەرچی ئێمەین، خۆمان وەکو لیژنەیەکی تەحزیری دانابوو، نەک مەرجەعیەت.

**هەر بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو؟**

- بەڵێ، وەکو لیژنەی تەحزیری پارتی دیموکراتی کوردستان، نامیلکەیەکمان دەرکرد، رای خۆمان بڵاوکردەوەو هەندێ بەیاناتمان دەرکرد، پاشان هاتینەوە کوردستان، بینیمان نزیکترین لایەن لە ئێمەو، بزووتنەوەی سوسیالیستی کوردستانە، لەگەڵ ئەوان تێکەڵ بووین و وەکو لیژنەی تەحزیری زۆر نەماینەوە.

**بیرۆکەی سەرکردایەتی کاتی کێ داینا؟**

- خۆی مەبەست لە سەرکردایەتی کاتی چ بوو؟ مەبەستیان ئەوەبوو بەردەوامی بە خەباتی پارتی بدەن، کاک مەسعودو کاک سامی دەوریان لە دروستکردنی ئەو سەرکردایەتییە هەبوو.

**بۆچی ناویان نابوو سەرکردایەتی کاتی؟**

- چونکە سەرکردایەتیەکە لە کۆنگرەیەکدا هەڵنەبژێردرابوو، تا کۆنگرەی نوێیەم بەسترا، ئەم سەرکردایەتییە مایەوە.

**ئەی فیکرەی لیژنەی تەحزیری هی کێ بوو؟**

- وەڵڵا کۆمەڵێک بووین، من و کاک شەمسەدین موفتی و عەدنان موفتی و قادر جەباری بووین.

**تۆ ئەوکات و ئێستاش بیری سۆشیالیستیت نییە، زیاتر بە کەسێکی نیشتمانی و نەتەوەیی ناسراوی، چۆن سۆشیالیستت وابینی کە لە ئێوەوە نزیکە؟**

- خۆی زۆر فیکرەو شت لەناو کورددا بڵاودەبێتەوە، بەڵام ئێمە هەموومان نەتەوەیین، ئەگەر بێیتەسەر راستی، پارتی و یەکێتی و سۆشیالیست و هەمووی هەر نەتەوەیی بوونە، بەس ناویان جیاواز بووە.

**بەلام سوشیالیست باسی سوشیالیزمی** زانستی **دەکرد!!**

- بەڵێ بەڵێ.. باسی مارکس و دواتر کاڵ بووەوە بۆ سۆشیالیزمی زانستی و وردە وردە لەمەش کاڵتر بووەوە، بەڵام بەرای من ئێمە سۆشیالیستی دیموکراتی بووین، نەک زانستی، چونکە ئەگەر وتت سۆشیالیزمی زانستی واتا شیوعیەت، کەچی وانییە. ئەو برادەرانەی لە بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان بوون، دوو جۆر بوون، بەشێکیان کۆنە جەلالی بوون، بەشێکیشیان کۆنە مەلایی بوون، پاشتر جیابوونەوە، کاک رەسول و کاک عەلی والی و ئەوانەی پێشتر

له شۆڕشی ئەیلول بوون لەوانی دیکە جیابوونەوە، ئێمەش پێشتر لە شۆڕشی ئەیلول بەفیکر لێک نزیک بووین، ئەو سۆشیالیستی زانستیەشیان کەمتر ببووەوە، ئێمەو ئەوان دوو جەماعەت بووین لە لایەنەکانی دیکە لێکنزیکتر بووین و هەردوولامان پەروەردەی شۆڕشی ئەیلول بووین و یەکترمان گرت، یەکەمجار حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتوومان دروستکرد، پاشان بوو بە حیزبی سۆسیالیست. مەسەلەی فیکریش، زۆر حیزب شتی فیکری دەنووسن، بۆ نموونە لە زەمانی مەلەکی پارتی لەسەر مارکس و لینین شەڕی لەگەڵ شیوعی دەکرد، بەڵام بەکردار نەتەوەیی بوو، ئەوشتانە هەبوو، ئێستا بزووتنەوەی کوردی واقیعبینترە.

**ئێوە لە ٨/٨ لەگەڵ سۆسیالیست یەکتانگرت؟**

- ئێمە پێشتر یەکمان گرتبوو، بەڵام لە ٨/٨ بە رەسمی یەکمان گرت و لە کۆنفرانسێکدا سەرکردایەتیەکی یەکگرتوومان دروستکرد، پاشان بوو بە حیزب.

**لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٨١ خۆت هەڵنەبژارد، بۆچی؟**

- بەراستی لەو کۆنگرەیەدا تەیاری چەپ هێزی زۆر بوو، مەوزوعی ئیشتراکی زانستی تۆخ بوو، بەڵام من بڕوام پێ نەبوو، وام دەبینی کە لەگەڵ واقیعەکە ناگونجێ، ئەوان وایان دەبینی رەنگە ئێمە کار لە چەپیەکە بکەین، بەو ئیعتیبارەی ئێمە لە شۆڕشی ئەیلول بووینەو هەندێک راستڕەووین، بۆیە خۆم نەپالاوت، گوتم هەر

ئیشـێکتـان هەبێ، لە دەرەوەبم یا لە ناوەوە، بۆتان دەکەم، بەڵام من نامەوێ لە سەرکردایەتی بم.

**بەڵام تا ساڵی ۱۹۹۲ کە بووە یەکگرتن تۆ لە هیچ کۆنگرەیەکی دیکە خۆت هەڵنەبژارد؟**

- ئاخـر هەریەک کـۆنگرەیان بەسـتـا، سـاڵی ۱۹۹۲ کـە لە کۆنفراسێکدا خۆی هەڵوەشاندەوەو بووە یەکگرتن، من نەچوومە ناو یەکگرتن.

**ئەگەر بیرت بێ یەکەم کەس کە بزووتنەوەی سۆشیالیستی دامەزراند کێ بوو؟**

- کـاک رەسـول و تایەر عـەلی والی و عـومـەر دەبابەو عـەلی عەسکەری و دکتـۆر خالیدو سەید کاکەو سەعدی گچکەو ئەوانە بوون، ساڵح یوسفیش رۆڵی هەبوو، بەڵام ئەو سەرپەرشتی دەکردن، وەکـو برا گـەورەیەک وابوو، لە بەغـداش بوو، بەڵام بڕوای بە سوشیالیزمی زانستی و شتی وا نەبوو، ئەو رای وابوو و دەیگوت ئێوە ئیشتراکی دیموکراتی بن، ئەگەر هەر دەڵێن سوشیالیزمی زانستی ئەوە بڕۆنە ناو حیزبی شیوعی، زۆر لەگەڵ چەپێتی دانەبوو، بەڵام ئەوان زیاتر چەپ بوون، لەبەر ئەوە هاتن بوونە ئەندام لە یەکێتی، لەناو یەکێتیش هەندێک ناکۆکی پەیدابوو، لەسەر جەلالی و مەلایی، زۆربەی ئەوانەی کە کۆن لە شۆڕشی ئەیلول بوون جیابوونەوە، کە جیابوونەوە لەگەڵ ئێمە تێکەڵکێش بوون.

**هەندێک دەڵێن کە ساڵح یوسفی شەهیدکرا سکرتێری حیزب نەبوو لە کۆنگرە لادرابوو، رەسول مامەند سکرتێر بوو...**

- لە راستیدا لە کۆنگرە هەر ساڵح یوسفییان بە سکرتێری گشتی حیزبەکە دانا، بەڵام هەڵەش بوو، پێشمانگوتن کە ئەو کابرایە لە بەغدایە، بەغداش خەتەرەو پێویست ناکا باسی بکەین، یان بێتەدەرەوە. بەغداش خەتەرەو پێویست ناکا باسی بکەین، یان دای نەنێین یان بێتە دەرێ.

ساڵح یوسفی بڕیاربوو بێتەدەرەوە، بەڵام دواکەوت و تا شەهیدیان کرد، ئەوکات حیزبی سۆشیالیست رازی بوون کە ساڵح یوسفی سکرتێریان بێت، بەڵام فیعلیەن کاک رەسولیان بۆ سکرتێری حیزب هەڵبژارد، پێش ئەوەش ئەو حیزبە لەلایەن من و کاک رەسول و کاک تایەر عەلی والی بەڕێوەدەبرا، کاک رەسولیش کە بووە سکرتێر هەر لەژێر تەوجیهاتی کاک ساڵحدا کاری دەکرد، بەڵام کێشەکە لەوەدابوو، کاک ساڵح لە بەغدابوو، نەشیدەتوانی دەنگی خۆی بگەیەنێ، ئەوەبوو ئاشکرابووو تیرۆریان کرد.

**رەسول مامەند کە بۆ سکرتێری هەڵبژێردرا رکابەری هەبوو؟**

- نا، شتێکی وانەبوو.

**دکتۆر خالید و عەلی عەسکەری تائێستا یەکێتی بە شەهیدی خۆی دادەنێ و سۆشیالیستیش بە شەهیدی خۆی دادەنێ... ئەوە شەهیدی کام لایە؟**

هی هەردوو لایە، چونکە بە راستی ئەوانە لەناو بزووتنەوەی سۆشیالیست بوون، بەڵام بزووتنەوەی سۆسیالیستیش بەشێک بوو لە یەکێتی، لە راستیشدا شەهیدی هەموو کوردن، بەڵام لەوانەیە یەکێتی زیاتر حیسابیان بۆ بکات.

**لە ساڵی ١٩٧٧ کە بزووتنەوە بووە باڵێکی یەکێتی، ئەوکاتەی مام جەلال کردبوویە مەرج کە دەبێ ئەو سکرتێری گشتی یەکێتی بێت، ئینجا لە سوریا دەگەڕێتەوە، دەڵێن لە بزووتنەوەی سۆسیالیست تەنها سەید کاکە رازی نەبوو، ئەوانی دیکە هەموو رازی بوون، ئەمە چۆن بوو؟**

- خۆی هەندێک شت هەیە، گرنگە خەڵک بیزانێ، بۆ ئەوەی هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی لێکینەداتەوە، ئەوانەی پەیوەندیان بەو مەوزوعەوە هەیە، ماون، وەکو سەید کاکەو ئەوانە دەزانن راستیەکە چۆن بوو.

**- سەید کاکە دەڵێ بەس من دژی بووم..**

- بەڵێ، کاتی خۆی کە کۆمەڵە دروست بوو لە کوردستان دروست بوو، بزووتنەوەی سۆشیالیستیش لە کوردستان دروست بوو، یەکێتی نیشتمانیش سەرکردایەتیەکەی لە سوریا دروست بوو، مام جەلال دروستیکرد، بەڵام ئەو سێ لایەنە پەیوەندیشیان لەگەڵ یەک هەبوو، لەناو کۆمەڵەو لەناو بزووتنەوەش هەندێک هەبوون بۆ نموونە شەهید ئارام و سەید کاکەو هی تریش هەبوون، تەقدیری رۆڵی مام جەلالیان

دەکرد کە لە هەموویان گەورەتربوو، چەک و ئیمکانیاتی لە سوریا بۆ پەیداکردبوون، بەڵام حیسابی یەک شتیان دەکرد، دەیانگوت ئەگەر مام جەلال سکرتێری گشتی بێت، ماڵی بارزانیش لەو بەرەوەن، دیسان بەزمی جەلالی و مەلایی زیندوو دەبێتەوەو دەمانخاتە ناو شەڕێکی دیکەی براکوژی و لەبەر ئەوە پێیان ناخۆش بوو، بەکرداریش ئەگەر تەماشای بارودۆخەکان بکەین، مام جەلال پارەو چەکی پەیدادەکرد، پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتان هەبوو، لە راستیدا بێ ئەو نەیاندەتوانی شتێکی گەورە بکەن، بۆیە قبوڵکرا.

**دەڵێن ناکۆکی لە نێوان تۆو رەسول مامەند هەبووە، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی تۆ لە کۆنگرە خۆت هەڵنەبژێری؟**

- جارێ من ماوەیەکی کەم لە سەرکردایەتی مامەوە، چەند مانگێک بوو، پاش ئەوە خۆم بۆ سەرکردایەتی هەڵنەبژارد.

**بەڵام قورساییت هەر هەبوو؟**

- قورسایی جیاوازی بیروڕا هەبوو، ئەوان خۆیان بە ئیشتراکی عیلمی دەزانی، من بڕوام پێ نەبوو، بەڵام هیچ ململانێیەکم لەگەڵ کەس نەبووە، بەو بەڵگەیەی نەخۆم هەڵبژارد، نەداوام کرد ببم بە سکرتێر، یەکێتیش ململانێی دەبێ کە بە تەمای مەسئولیەت بێ، من خۆم لە مەسئولیەت دوورخستۆتەوە.

**خۆ هەڵنەبژاردنەکەت لە رقان نەبوو؟**

- نەخێر، لەبەر ئەوە بوو من بڕوام وانەبوو ئەو بزووتنەوەیە،

ئیشتراکی عیلمیەو پێویستیشی بەو ناوە نەبوو، لەبەر ئەوە خۆم هەڵنەبژارد. قەت ململانێم لەگەڵ کەس نەبووە، کەسیش لەبەر من خوێنی لە لووتی نەهاتووە، ململانێی چیم هەبووە!؟

**تۆ خۆت بە ئینسانێکی نەتەوەیی و نیشتمانی دادەنێی، بەڵام لە دوای هەفتاو پێنجەوە زۆربەی کاتەکانت لە دەرەوە بەسەر بردووە، نەک ناوەوە...**

– ئەوەندەی پێویست بێ ئامادەییم هەبووە. هەر کاتێ پێویست بێت، هاتوومەتەوە. لە دەرەوەش کوردایەتی و نەتەوە پەرستی دەکرێ.

**بەڵام سەرکردەی مەیدانی زیاتر دەبێ لە ناوەوە بێ...**

– کە تۆ مەسئولیەتت نەبێ، پێی چی بکەی، ئێستا من کارم لە بەغدایە، زۆرتر لە بەغدام، ئەگەر بۆ کارێکی ئێرە راسپێردرام، ئەوکات دەبێ لێرە بم، ئەوە زۆر گرنگ نییە، کوردایەتی لە هەر شوێنێ بتەوێ دەکرێ. دوایی راستە من زۆر لە دەرەوە بوومە، بەڵام لێرە براکوژی هەبووە، بێم چی بکەم؟ قەت نەمویستووە لەو شەڕەدا تەرەف بم، نەشەڕ تفەنگم زانیوە، نەبڕواشم پێی هەبووە، کە هاتوومەتەوەش ناو بژێم کردووە، کە بەرەی کوردستانی دروستبوو هاتوومەتە ناوی، هەر شتێک بۆنی یەکگرتوویی و تەبایی تیابێ، هاتوومەتە ناوی.

**هەڵگیرسێنەری سەرەکی شەڕی هەکاری کێ بوو؟ چونکە تائێستا هەر لایەنێک ئەویدیکە تاوانبار دەکات؟**

- شەڕی هەکاریش حیکایەتێکە بۆ خۆی، ئێمە ئەوکات لە کوردستان بووین، لیژنەی تەحزیری بووین، هەڵبەت شەڕ لە نێوان سەرکردایەتی کاتی و یەکێتی هەبوو، لەهەر شوێنێ یەکتریان بدیتبا، لێکیان دەدا، لەبەر ئەوە لەو کاتە یەکێتی ویستی هێزێکی زۆر بنێرێ بۆ ناوچەی بادینان، لە ناوچەی سۆرانیش یەکێتی هەندێک هێزی سەرکردایەتی کاتی پاکتاوکردبوو، زیاتر هێزەکانی یەکێتی ڕۆڵیان هەبوو، کە ناردنی بۆ بادینان ٨٠٠ کەس بوون، ٤٠٠ کەس چەکی پێ بوو، ٤٠٠ کەسیش بێ چەک بوون، گوایە ئەوانەی بێ چەکن کە دەچن چەک لە سوریا وەربگرن، چەکیان دەدرێتێ.

چونکە لە کەشێکی براکوژیدا بوو، کاتێک بوو بەفرێکی زۆر باری بوو، کەڵکی چوونی نەبوو، نیوەیان لەناو بەفرداو لە سەرماو لە بێ نانی تێچوون. یەکێتی دەیگوت دەچم بۆ چەک، نەک بۆ شەڕ، عەلی عەسکەریش کە سەرکردایەتی هێزەکەی دەکرد، کاغەزی بۆ کاک ئیدریس نووسیبوو کە ئێمە ناچین بۆ شەڕ، دەچین چەک دەهێنین، بەڵام ئەوکاتە سەرکردایەتی کاتی زۆر بە قسەی کاک ئیدریسیان نەدەکرد، بەپێچەوانەوە کاک ئیدریسیان پێ خراپ بوو، کاک مەسعودیش لەلای باوکی بوو لە ئەمریکا، باوکی نەخۆش بوو، دووربوو لە ڕووداوەکان، بەڵام تۆ دەڵێی بۆ شەڕ ناچم، بەڵام ئەو حیسابی ئەوە دەکا ٨٠٠ کەس بۆ چی دێت، ڕەنگە وای لێکبداتەوە بۆ گێچەڵ چوون، بۆیە لە بەرامبەردا خۆی ئامادە دەکا، واتا هەریەکە حیسابێک دەکا، لێی

نەدەم، ئەو لێم دەدا ، هەردووکیشیان دژی یەک بوون، لەبەر ئەوە ئەمانە کە بەو شێوەیە چوون و گوتیان دەچین چەک دێنین و لە بادینان بارەگا دادەنێین، ئێ سروشتیە کە تۆ ناوچەی سۆرانت تەسفیە کردووە، سەرکردایەتی کاتیش نایەڵێ تۆ بارەگا لەوێ دابنێیی، بۆیە کە ئەو هێزە زۆرە تێپەڕی، کاک سامی و جەماعەت لەوێ خۆیان بۆیان ئامادە دەکەن و دەوریان دەگرن و شەڕەکە دروست دەبێ. ئێمە لەگەڵ ئەو هێزە ٨٠٠ کەسیە بووین لە حاجی ئۆمەران، لەوێ کۆبوونەوەکراو من یەکێ بووم لەوانەی قسەم بۆکردن، رایان وەرگرتم، گوتم رای من وایە، یەکەم: لە رووی بەفرو سۆڵەوە زووە، دووەم: ئێوە دەڵێن بۆ شەڕ ناچین، بەڵام لە راستیدا بتەوێ و نەتەوێ هەر تووشی شەڕ دەبن، لەبەر ئەوە من تەوەقوع دەکەم شەڕ ببێ، بۆیە نەچن باشە، دوای بخەن تا بارودۆخێکی دیکە دێتە پێش، یا گرەنتیەک لە پارتی وەربگرن...
ئێمە لە حاجی ئۆمەران گەڕاینەوە لەگەڵیان نەرۆیشتین، (مام جەلال و نەوشیروان)یش گەڕانەوە، ئەوان رۆیشتن، جارێ تاگەیشتبوونە سنووری تورکیا لەبەر بەفرو بێ خواردنی یەک لەسێیان پەرتەوازەبوون، هێندێک چووبوونە ئێران، چونکە ئەو ناوچانە زۆر کوێستانە، کە گەیشتبوونە ئەوێ ماندوو هیلاک ببوون، سەرکردایەتی کاتیش خۆی بۆ ئامادەکردبوون، دەوری گرتبوون، ئیتر شەڕەکە دروست بوو، ئەوەی لێکەوتەوە کە هەموومان دەیزانین، پێموایە ئەوەی کوژرا، کوژرا، بەڵام ئەوانەی دیل بوون، وەکو عەلی عەسکەری و د. خالیدو

ئەوانە دەبوایە کاک سامی و جەماعەت نەیانکوژن.

**ئەو کاتەی کە تۆ پێت گوتن، نەچن باشە، کێ زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی بچن؟**

- ئەوکات د. خالید لە سنووری تورکیا بوو، چاوەڕوانی هێزەکەی کاک عەلی عەسکەری دەکرد، بروسکەی دەکرد کە بچن، لەناو کوردیشدا لە حاڵەتێکی وەهادا، ئەگە هەر کەسێک بێ، نەچی بەدەم داواکەیەوە، دەڵێن دەترسێ، بۆیە سووربوون لەسەر ئەوەی بچن و گوتیان بڕیارێکە داومانە، بەڵام ئەوەندەی من بزانم کاک عەلی عەسکەری نیازی شەڕی نەبوو، چونکە چەند جار دەیگوت، من ئەو هەموو شەڕەی لە شۆڕشی ئەیلولدا کردم، نامەوێ بە هیچ شێوەیەک شەڕ بێتەوە، بەڵام تۆ هەر وابڵێ، لایەنەکەی دیکە بڕوات پێ ناکا، دەڵێ چۆن ۸۰۰ کەس بۆ چەک هاتووە، حیساب دەکا دەڵێ لێی نەدەم، لێم دەدات.

**ئەو شەڕانەی دەکران، بە فەرمانی سەرکردایەتی حیزبەکان بوو، یا لەبەر زۆری هێزەکان بوو، یان هەریەکەیان لە ناوچەیەک خۆی بە حاکم دەزانی و قبوڵی ئەوی بەرامبەری نەدەکردو ئیدی شەڕی دەکرد؟**

- هەردوو شێوەبوو، فەرمان بوو لەبەر ئەوەی ئەوان لە شەڕدابوون هەرلایەو دەیویست لایەکەی دیکە تەسفیە بکات، یەکێتی لەو ناوچەیە (سۆران) سەرکردایەتی کاتی دەردەکردو دەیکوشتن، ئەوانیش

له ناوچەی خۆیان بەهەمان شێوە، بەڵام مەرجیش نییە هەموو ئەو شەڕانەی کراون بە فەرمانی سەرکردایەتی بووبێ، جاری واهەبووە دوو مەفرەزە تووشی یەکبوونەو پەلاماری یەکیان داوە، لەوانەیە سەرکردایەتیەکانیان هەر ئاگاشیان لێ نەبێ، ئەو کەشە ناخۆشە لە ١٩٧٦تا ١٩٨٦ مایەوە، تاپارتی و یەکێتی لە ئێران ئاشتبوونەوە، لەو ١٠ ساڵە هەموو لایەک تووشی شەڕبوون، جوقد پەیدابوو، جوود پەیدابوو، هەردووکیشیان دژی یەک بوون، شەڕ لە نێوان کوردی ئێران و کوردی عێراق دروستبوو، بەداخەوە جۆرەها شەڕ دروستبوو، هۆکارەکەش ئەوە بوو، کۆمەڵەیەکی سیاسی وانەبوو هەموویان بەیەکەوە بن، دەوڵەتانی دەوروبەریش دەستیان لەو شتانە هەبوو.

**نەوشیروان لە یادداشتەکانی خۆیدا دەڵێ، دکتۆر مەحموود لە ساڵی ١٩٧٧ بە تەلەفۆن لە ئێران قسەی لەگەڵ مام جەلال کرد، بەڵێنی دابوو ببێتە یەکێتی، بەڵام دوایی نەهات...**

- راست نییە، من هیچ بەڵێنێکم نەداوە، ئەگەر بەڵێنمدابا دەچووم، بەڵام ئینکار ناکەم کە چووینە سوریا، مام جەلال زۆر هاوکاری ئێمەی کردو ماودیەکیش دۆستایەتی یەکترمان کرد، بەڵام ئێمە رێکخستنێکی جیاوازبووین.

**حیزبی سوسیالیست حیزبێکی جەماوەری و خاوەن بنکەیەکی بەرفراوانی جەماوەریی بوو، بەڵام سەرکردایەتیەکەی زۆر رێکخەر (منظم) نەبوو، وەک سەرکردایەتی حیزبەکانی دیکە، هەریەک لە ناوچەیەک دەسەڵاتی خۆی هەبوو، هیچ حیسابێکی بۆ**

**سەرکردایەتی نەدەکرد.. ئەمانە وای لە تۆ کرد بێئومێد بیت لەوەی لە سەرکردایەتی ئەو حیزبە بیت؟**

جیاوازی نێوان سۆشیالیست و یەکێتی و پارتی ئەوە بوو، یەکێتی و پارتی سەرکردایەتیەکی توندوتۆڵیان هەبوو، دیسپلینیان زیاتربوو، ئیمکانیاتیشیان زیاتر بوو، هەرچی سۆشیالیست بوو راستە خەڵکی زۆر بوو، بنکەی فراوانبوو، بەڵام لە ئاستی سەرکردایەتیدا لاوازبوو، ئەوەش کاریگەری هەبوو لەوەی حیزب نەیتوانی رۆڵی خۆی بەباشی ببینێ.

**تۆ لە ١٩٧٩/١٠/١ بۆ گفتوگۆ لەگەڵ رژێم چوویە بەغدا، بەبێ ئەوەی پرس بە حیزبەکان بکەی، دوای مانگێک لە ١٩٧٩/١١/١، لەگەڵ یەکێتی بەیاننامەیەکت دەرکردو ئیدانەی گفتوگۆکردنت کرد، ئەمە بۆچی و چۆن بوو؟**

- من ئەوەی (١١/١)م لەبیر نییە، بەڵام با ئەوەی ١٠/١ بۆتان روون بێ، کە خومەینی هاتە سەر حوکم، وەزعی ئێران گۆڕا، هەڵبەت لەهەمان کاتیشدا سەدام هاتە سەر حوکم، ئەو دوو بەڵایە لە ساڵی ١٩٧٩ هاتن، هەموو دنیایان تێکدا، لەو کاتەدا پارتی سەرکردایەتیەکەی لە راژان بوو، هەڵبەت لەگەڵ ئێران هاوکاری یەکتریشیان دەکرد، یەکێتیش زۆر هەوڵیدەدا لەگەڵ ئێران پەیوەندی دروستبکەن و ئێران پشتیان پێ ببەستێ، ئەوکات ئێمە وەکو حیزبی سوشیالیست وەزعمان تابڵێی خراپ بوو، لەگەڵ یەکێتی شەڕە دەنووکیشمان هەبوو، کێشەمان زۆر بوو، ژیانمان تابڵێی خراپ بوو،

پێشمەرگە یەک یەکە دەرۆیشتنەوە، بۆیە یادەبوو لەگەڵ خومەینی خەریک بین، کە من هیچ بڕوام پێی نەبوو، دەمزانی ئێران هەر ئێرانە، خومەینی بێ، شابێ، جیاوازییان نییە، من ئەزموونم لەگەڵ ئێران هەیە، حەزدەکەی حوکمێکی شیوعی لە ئێران هەبێ، فەرق ناکا، چونکە ئەو وڵاتە بەرژەوەندی و حیسابی خۆی هەیە، زۆر بڕوامان پێی نەبوو، لەگەڵ یەکێتیش دژی یەک بووین، لەگەڵ پارتیش پەیوەندییەکی وەهامان نەبوو، ئەوکات سەدام وەک گوتم تازە هاتبووە سەر حوکم، جەولەیەکیشی بە کوردستاندا کرد، وابزانم جلی کوردیشی لەبەر کردبوو، حەپسی بەرداو خەڵکەک وای دەبینی کە ئەوە رەنگە شتێکی تازەی پێ بێت و چارەسەرییەک بدۆزێتەوە، زۆرکەس دەهاتنە لای ئێمە دەیانگوت بۆ وتوویژی لەگەڵ ناکەن، بەڵکو گۆڕابێ، وەفدێکی قەڵادزێ هاتە لامان، گوتیان ئامیر لیوای قەڵادزە کە ناوی خەیری بوو لە شەڕی عێراق و ئێران کوژرا، دەیەوێ بۆ مەسەلەی وتووێژ بتانبینێ، ئێمەش وەڵامان داوەو گوتمان ئێمە وتوێژ لەگەڵ ئامیر لیوا ناکەین، ئەگەر دەکرێ لەگەڵ سەدام بێ، بۆ سبەی بروسکەیەکمان بۆ هات گوتیان ئەوا سەدام لە بەغدا چاوەڕوانتان دەکات، ئێمەش ئەوکات بیرمان لێکردەوە کە ئایا بکرێ، یان نەکرێ، لەبەر ئەو وەزعانەی حیزبیش کە پێشتر باسمکرد، گوتمان باشە گفتوگۆی لەگەڵ دەکەین، بزانین ئەو کابرایە چی پێیە.

بەڵام قەت بەنیاز نەبووین خۆمان بە تەنها گفتوگۆ بکەین، گوتمان ئەگەر شتێکی باش هەبوو، دێینەوە لەگەڵ هەموو حیزبەکان بەیەکەوە

قسە دەکەین، ئەگەر هەموومان پێمان باشبوو، دەیکەین، ئەگەرنا هیچ. چووین و سێ رۆژ لە بەغدا بووین، من و کاک عەدنان موفتی و مولازم کامیل کە ئەویش لە شەڕو شۆڕی نێوان کورددا شەهید بوو، لەوێ ٣شەو ماینەوە، سەدامم بینی و هەندێک مەسئولی دیکەمان بینی و قسەمان لەگەڵ کردن و زۆرمان موناقەشە لەگەڵ کردن، هەستمانکرد زۆر مەغرور بوون.

**ئەی بۆچی داوای وتووێژی کرد؟**

- چونکە ئەوکاتی بڕیاریدابوو شەڕی ئێران بکات، لەبەر ئەوە رەنگە گوتبی کوردەکە بۆ خۆم رابکێشم بۆ ئەوەی لای ئێران نەبێ، بەڵام غرورێکی سەیریان هەبوو، بەکر نەمابوو، سەدام تازە ببووە سەرۆکی عێراق، قسەمان زۆرکرد، نەماندی وتووێژەکە سودێکی هەبێ، بەڵام ئەودندەی گوت ئەگەر ئێوە هەموولایەکتان بەیەکەوە بتانەوێ لەگەڵ ئێمە گفتوگۆ بکەن، لەوانەیە هەوڵ بدەین شتێکتان بۆ بکەین، بەڵام ئێوە لەگەڵتان چاک بین هەر لەگەڵ ئێرانن، لەگەڵتان خراپ بین هەر لەگەڵ ئێرانن، ئەوەبوو ئێمە گەڕاینەوە، کە گەڕاینەوە من یەکسەر چووم مام جەلالم بینی، حیزبی شیوعیم بینی، کاغەزم بۆ برادەرانی پارتی نارد، گوتم بابە حاڵ و حیسابەکە ئاوهایە، ئەگەر ئامادەن، وەرن بابە هەموومان هەوڵبدەین و شتێک بکەین، بەڕای ئێمە ئێران هیچی بۆ کورد پێ نییە، راستە ئەوەش (سەدام) کابرایەکە کەس بڕوای بە قسەکەی نییە، بەڵام بەشەرە!! ئەگەر ئێوە هەمووتان بێن، ئێمە بەیەکەوە بەردەوام دەبین، ئەگەر نایێن ئێمەش وازی لێ دەهێنین،

یەکێتی و شیوعی نەک هەر نەهاتن، بەڵکو موزایەدەشیان لەسەر کردین و گوتیان ئەوانە چوونەتە بەغداو ئیتر کۆمەڵێک پلارو توانجیان هاویشت. پارتیش وەڵامی نەبوو، ئیتر ئێمەش وازمان لێ هێنا، کە بینیمان وەڵام لەولانییەو بە تەنهاشین، وەک گوتم ئێمە بڕیارمان بوو بە تەنها نەیکەین، بۆیە وازمان لێ هێنا.

**دەڵێن بەرەی (جوقد) تۆ داتمەزراند، سوریاش دەوری زۆری هەبوو لە دروستبوونی، لە بەرامبەر ئەوەدا رەسوڵ مەمەند لەرقی تۆ بەرەی (جود)ی دامەزراند، ئەو کاتیش تۆ لە سوریا رەخنەت لە دروستکردنی بەرەی (جود) گرتبوو...**

- نا نا.. راست نییە. هەڵبەت یەکەم جار وتوێژی دروستکردنی جوقد هەبوو، مەسەلەی جود لە گۆڕێ نەبوو، بەرەی جوقد جگە لە پارتی هەمووەمانی تێدابوو، بەڵام بەشێوەی سەرەکی حیزبی بەعس (سوریا) و یەکێتی دەوریان هەبوو، ئەوکات یەکێتی لە سوریا دەوری زۆربوو. یەکێتی ڤیتۆی لەسەر پارتی هەبوو، حیزبی بەعسی سوریاش لەبەر یەکێتی جۆرێک لە ڤیتۆیان هەبوو، لەبەر ئەوە پارتی لە کارەکە دووربوو، پارتی خۆیشی کارەکەی زۆر لاگرنگ نەبوو، چونکە پەیوەندییەکە خراپ بوو، لەوێ بەرە دەکرا، بەڵام لە ناوەوە براکوژی بوو، ئێمەش وەکو حیزبی سوسیالیست لەو بەرەیە بووین، هەڵبەت ئەوکاتە دژی ئێمەش بوون، لەسەر سەفەرەکەمان بۆ بەغدا، دەیانگوت دەبێ ئیدانەی خۆتان بکەن، ئینجا بێنە ناو بەرە، ئێمەش ئەوەمان نەکرد، چونکە چیمان کردووە، ئیدانەی چی بکەین، هەڵلایەکی

زۆریان لەسەر دروستکردین کە ئێمە چووینەتە بەغدا، هەمووی سێ شەویش بوو، ئەوەی کە بۆم باسکردی. نە پارەمان وەرگرتووەو نەهیچ. لەبەر ئەوە کە دیبیان ئێمە ئیدانەی ئەو کارە ناکەین، رازیبوون. جوقد گەیشتە ئەنجام، ئەوکاتە لە سوریا بووم، بەموافەقەتی برادەرانی خۆمان ئیمزام لەسەر جوقد کرد، بەڵام لە هەمانکات چونکە پارتی لە کارەکە دوورخرابووەوە، وەک گوتم پارتی خۆیشی مەیلی نەبوو، چونکە لەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ کرد کە هەڵەبوون، بۆیە ئەویش لێرە بەهاوکاری حیزبی شیوعی، کە لەو کاتەدا پارتی و شیوعی هاوکارییان باشبوو، ئەوانیش ویستیان بەرەیەک دروستبکەن، برادەرانی ئێمەشی تێکەوت، ئەگینا لە بنچینەدا جود بریتی بوو لە هاوکاری نێوان پارتی و شیوعی، برادەرانی ئێمەش چووبوون، لەسەر ئەو ئەساسەی چ قەیدیە لێرەش هەمانبێ ، لەوێش هەمانە، کە هی ئێرە دروستبوو، لەوێ ئێمەیان (تەجمید) کرد، ئێمە کە لەوێ ئیمزامان کرد، ئاگامان لەوەی ئێرە نەبوو، لە رادیۆ گوێمان لێ بوو، هەڵەکە لێرەدابوو.

برادەرانی ناوەوە پێیان باش بوو لە جودبن، جودییان پێ لە جوقد باشتربوو، من بەشبەحاڵی خۆم ئەوکات بروام وابوو جوقد ببێ و هەوڵبدەین برادەرانی پارتیش بێن، باشترە لەوەی دوو جەبهە دروستکەین.

**واتە مەسەلەیەکی فیکری بوو، کە رەئیت لەسەر جود نەبوو؟**

- نەخێر، فیکر کوا هەبوو!؟ فیکری چی!؟ هەموو حیزبەکان وەک

یەک بوون، فیکری چی؟ فکرەکە ئەوەبوو ئەوان لەویّ سەر بە سوریا بوون، یەکێتی سەرکردایەتی کارەکەی دەکرد، لەملاشەوە پارتی سەرکردایەتی دەکرد، پارتی و یەکێتیش دژی یەکبوون، ئیتر کە بووە دووبەرە، لە هیچیان سودمان نەبینی. ئیتر دوای ئەوانە شەڕوشۆڕو کێشە دروست بوو، ئەوە بەردەوام بوو، تاساڵی ١٩٨٥ کە یەکێتی چووە بەغداو موفاوەزاتی کردو سەرکەوتوونەبوو هاتەوەو گەیشتنە ئەوەی لەگەڵ یەک ڕێک بکەون.

**ڕاستە پەیوەندی ڕەسول مامەند بەهێزتربووە لەگەڵ حیزبی شیوعی، لە پەیوەندی تۆ بەو حیزبەوە؟**

- بەڵێ، ئاخر ئەوان ئیشتراکی عیلمی بوون.

**بەڵام ڕەسول مامەند کابرایەکی عەشایەر بوو...**

- خۆی لای ئێمە، فیکرە نووسینە، من کە خۆم نەپاڵاوت بۆ سەرکردایەتی، لەبەر ئەوە بوو، بڕوام نەبوو کە ئەو حیزبەی ئێمە ئیشتراکی عیلمە بێ، ڕاستیش نەبوو، بنوسریّ سوسیالیستی زانستی بێ، بەڵام ئەوان ڕەئیان وابوو، لەبەر ئەوەش لە حیزبی شیوعی نزیکتر بوون، حیزبی شیوعیش ئیستغلالی دەکردن.

**دەڵێن ئەو کاتەی بزووتنەوەی سوسیالیست لە یەکێتی جیابووەوە، حازم ئەمین سری سەرکردایەتی هەرێمی حیزبی بەعسی سوریا بوو، لێپرسراوی مەکتەبی حیزبی بەعسی ئێرەش بوو، داوای لە تۆ کردبوو هەر چۆنێک بێ، بزووتنەوە لە یەکێتی جیانەبێتەوە..**

- ئەوە پەیوەندی بەمنەوە نەبوو، چونکە من بزووتنەوە نەبووم، ئەوکاتە لیژنەی تەحزیری بووم، پاش ئەوەی جیابوونەوە، ئینجا پەیوەندیمان دروستکرد، بەڵام حازم چونکە لەگەڵ یەکێتی بوو، رەنگە بەبرادەرانی بزووتنەوەی گوتبێ، بەڵام من ئاگام لەوەنەبووە، چونکە ئێمە جیاوازبووین. ئەوان لە ئازاری ١٩٧٩ جیابوونەوە.

**کە رەسول مەمەند لە یەکێتی جیابۆوەو بارەگای لە گۆڕەشێردانا، پێشتر راوێژی بەتۆ نەکردبوو؟**

- ئەوەیان نا، بەڵام باسیان دەکرد کەچی بکەین، دەمانگوت خۆتان بڕیاربدەن.

**ئەی چۆن دوای جیابوونەوە، زۆری پێ نەچوو تۆش لە ناوزەنگ بوویت و چوویتە گۆڕەشێر؟!**

- ئاخر، پێمگوتی هەتا ئەوکاتەی لەناو یەکێتیش بوون، ئێمەو ئەوان لێک نزیک بووین، بەس لەگەڵ کۆمەڵە لێکنزیک نەبووین.

**لە گرتنی نەوشیروان هەڵوێستت چی بوو؟**

- پێم باشبوو بەربدرێ...

**بەرەسمی داوات کرد بەربدرێ؟**

- بەڵێ، بەرەسمی داوام کرد، وابزانم کاکە حەمەو ئەوان لەوێ مەسئول بوون.

**دەڵێن قادر عزیز ئەگەر برای سەعدی گچکە نەبوایە، نەدەبووە ئەندامی سەرکردایەتی، ئایا ئەوە راستە؟**

- نا، پێموانییە، کاک قادر توانای خۆی هەبوو.

**که قادر عەزیز له ۱۹۸۵/۸/۱۵ له سۆسیالیست جیابۆوه، ئەوکاتە هەڵوێستت چۆن بوو، چونکە حیزبی سۆسیالیست لە وەزعێکی باشدا نەبوو، سەرکردەکانی لە ململانێدابوون؟**

– ئەوکات من لە دەرەوە بووم، بەڵام کە هاتینەوە کوردستان هەوڵماندا بیانکەینەوە یەک، بەڵام ئەنجامێکی وای نەبوو، خراپیش نەبوو، وردەوردە لێک نزیک بوونەوە.

**تۆ دەڵێی کوا فکر لە کوردستان هەبووە، پێتوایە شتەکان مەبدەئی نین، بە نووسین شتێکەو بە عەمەلی شتێکی دیکەیە، بەڵام کە قادر عەزیز لە سۆسیالیست جیابووەوە، بانگەشەی مارکسی-لینینی دەکرد، هەتا سەرەتا حیزبەکەی ناولێنا نیتیجاهی دیموکراتی شۆڕشگێڕ، دواتر بووە زەحمەتکێشان، ئایا پێتوایە جیابوونەوەی قادر عەزیز هۆیەکی فیکری نەبوو؟**

– رەنگە فیکری تێدابێ، بێگومان جیابوونەوەو پەیوەندییەکانی ناو بزووتنەوەی کوردی، شتی فیکری تێدابوو، بەڵام زیاتر سیاسی بوو، ئەگەر تەماشای بارودۆخەکە بکەین، دەبینین فکری هەموو لایەک لێک نزیک بوون، هەر هەمووشی نەتەوەیی بوون، بەڵام لەوانەیە هەندێ شتی فیکریشی تێدابێ.

**بەڵام پاش ماوەیەک شتێک روویدات، لەوانەیە ئەو فکرمیە هەر فرێ بدات...**

– جا مانای وایە فیکرەکە لاوازەو ئەساسێکی وەهای نییە. ئێستا جیاوازییەک لە نێوان شیوعی و ئیسلامی هەبێت، مەعلومە

جیاوازی فکره، یان شیوعی لەگەڵ قەومی بە هەمان شێوە. بەڵام ئەگەر هەمووی هەر نەتەوەیی بن، رەنگە لە بیروڕا هەندێک لێک جیاوازبن، بەڵام وا قووڵ نییە کە بڵێی لێکجیابوونەوەو ئیتر یەکنەگرنەوە، جیاوازیە فیکرییەکان ئەوەندە بەهێزنین، ئەگەر مەسەلە سیاسی و ئیدارییەکان چارەسەر بکرێن، فکر نابێتە کۆسپ. زۆر شتی وامان دیوە.

**دەنگۆی ئەوە هەبوو، زیاتر فاکتەرەکی دەرەکی رۆڵی بینیوە لە جیابوونەوەی قادر عەزیز، بەتایبەتی ئێران و حیزبی شیوعی.. ئەوە راستە؟**

- وەڵڵاهی نازانم. بڕواناکەم وابێ، بەپێچەوانەوە، ئینشقاقاتی ناو بزووتنەوەی کوردی هەمووی بە دەستی کورد خۆی بووە، هەمووی شتی زاتی بوو، بەڵام کە دروستبووە فاکتەری دەرەکی ئیستغلالی کردووە. بۆ نموونە شەڕی براکوژی خۆیان کردیان، کەس پێینەگوتبوون، بەڵام کە شەڕ دەکرێ، ئێران دێتە ناوەوە، تورک دێتە ناوەوە، چەکت دەدەنێ، چونکە پێیانخۆشە کێشە دروست ببێ.

**ئەگەر ئاوڕێک لە رابردوو بدەینەوە، راستە لە مەکتەبی سیاسی یا سەرکردایەتی حیزبی سۆسیالیست نەبوویت، بەڵام قورساییت هەبوو، خەڵکێکیش لەناو حیزبەکە تۆیان بە رەمز دەزانی، خەڵکێکی زۆریش شەهیدو برینداروو پەرتەوازە بوون، پاش هەموو ئەمانە، هەستناکەی سەرکردایەتی ئەو حیزبە گوناهبارە بەرامبەر خەڵکەکەی کە نەیتوانی خەڵکەکە کۆبکاتەوەو رێکیبخا؟**

- بە دڵنیاییەوە سەرکردایەتی هەموو حیزبەکان هەریەکەیان مەسئولیەتی هەیە، بۆ سەرکردایەتی پارتی یەکێتی کەم خەڵکیان بە کوشت داوە، هەموو حیزبەکان ئەو هەڵانەیان هەبووە، شەڕو کوشتار لە نێوان زۆربەی لایەنەکان هەبووە، لەنێوان کوردی ئێران و عێراق، کوردی عێراق و تورکیا هەبووە، هەموویشی هەڵە بووە، خەڵکێکی زۆر لەو شەڕانەدا تێچوون، جێی داخەو دەبێ دەرسی لێ وەربگرین.

**کە راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ کرا، تۆ لە کوێ بووی؟**

- من لە بەیروت بووم، کۆنگرەی ئەپۆزسیۆن هەبوو، دواتر چووینە سوید کۆنگرەیەکی گەورە بۆ پشتیوانی کورد لە ١٩٩١/٣/١٥ ڕێکخرا، لە پاشان چوومە پاریس و لەندەن و ئەمریکاو رووسیا، نوێنەری بەرەی کوردستانی بووم لە دەرەوە.

**لە کۆچڕەوەکەش نەهاتیەوە کوردستان؟**

- نەخێر، ئەوکاتەش لە دەرەوە بووم، وەک گوتم ئێمە وەفدی بەرەی کوردستانی بووین، لە وڵاتان دەگەڕاین بۆ پەیداکردنی پشتیوانی لە کورد. ئەوکاتە بەرەی کوردستانی لە دەرەوە لقی هەبوو، سەرکردایەتیەکەی لێرەبوو، هەر حیزبەو دوو کەسی لە سەرکردایەتی بەرەدابوو، لە حیزبی سۆشیالیست من و کاک رەسول بووین، ئەوکاتەی لە سوریاش بووم، سەرپەرشتی بەرەی کوردستانیم لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی دەکرد، پاشان کە بووین بە وەفدی بەرە، لێرە راپەڕین دروستبوو، وەختێ کە وتوێژ لەگەڵ حکومەت کرا، ئێمەش هاتینەوەو بەشداری وتوێژیشمان کرد.

**حیزبەکان بەپێی قەبارەیان لە سەرکردایەتی بەرەدا بوون؟**

- نا، بەپێی قەبارەنەبوو، هەریەکە دوو کەس لە سەرکردایەتی بوو.

**گەل و زەحمەتکێشانیش دوو کەسیان هەبوو؟**

- یەکەمجار ئەوان ئەندام نەبوون، کە بوونە ئەندام وەکو ئەوانی دیکە حیسابیان بۆ کرا، وابزانم وابوو، باش بیرم نایێتەوە. سەرەتا ٦ حیزب بووین، دوای زیادکردنی زەحمەتکێشان و پارتی گەل بووینە ٨ حیزب.

**لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢دا خۆت بۆ رابەرایەتی هەڵبژارد، تەسەوری ئەوەت نەبوو کە رەنگە تۆ نەتوانی لەگەڵ ئەوان لە ململانێی دەنگداندا دەنگ بێنی، ئایا بۆچی خۆت هەڵبژارد؟**

- وەڵڵا حیزبی سۆشیالیست پێیکردم، ئەوان نە یەکێتی بوون، نە پارتی، خەتی سێ بوون، وتیان خەتی سێ دەبێ نوێنەرێکی هەبێ، بریاری لیژنەی مەرکەزی بە کۆی دەنگ سەپاندی، ئەگینا من لەگەڵ نەبووم، دەمزانی دەرناچم، دەشمزانی ململانێیەکە لە نێوان پارتی و یەکێتییە، یا لە نێوان بارزانی و تاڵەبانییە، چ پەیوەندی بە ئێمە نەبوو تا خۆمانی تێوە گلێنین، ئەنجامەکەش زانرابوو، کە ململانێیەکە لەنێوان دوو لایەندایە، بەڵام حیزب بریاریدا.

**ئەوکاتەی گەرمەی هەڵبژاردن بوو، تۆ خۆت بۆ رابەری هەڵبژاردبوو، حیزبی سۆسیالیست خۆی بەهێزی سێیەم دادەنا، کەچی رەسول مامەند لە دەرەوە بوو، دوو سێ رۆژ پێش**

**هەڵبـــژاردن هاتەوە، ئەوە دەوری نەبوو لەســـەر ئەنجــامی هەڵبژاردنەکە؟**

- لەوانەیە، ئەوەش دەوری نەبوو، وەک گـوتم شـەڕەکـە لەنێـوان پارتی و یەکێتی بوو، هەتا خەڵک هەبوو سۆسیالیست بوو، دەنگیان بۆ ئەوان دابوو، خەڵکی تر هەبوون حیزبی دیکە بوون، بەڵام دەنگیان پێدابوون، چونکە ململانێی دوولایەن بوو، خۆشت دەزانی ئەنجامەکە چۆن بوو، هەر ڕێکیش نەکەوت.

**پاش هەڵبژاردنەکان کە ئێوەو حیزبی شیوعی و حیزبەکانی دیکە جگە لە پارتی و یەکـێتی تووشی شکست بوون، دەڵێن بۆ راستکردنەوەی شکستەکە رەسول مامەند هەوڵیداوە پاسۆک بێنێ و تۆش بۆ راکرتنی هاوسەنگی ناو سۆشیالیست هەوڵت داوە لەگەڵ پارتی گەل یەکبگرن، ئەوە راستە؟**

- نەخێر.. سۆسیالیست و پاسۆک بەیەک لیست بەشداری هەڵبژاردنیان کرد، واتا لەکاتی هەڵبژاردن پاسۆک و سۆسیالیست یەکبوون و سەرکردایەتیەکی هاویەشیان هەبوو، کە هەڵبژاردن کراو پارتی گەلیش هیچی نەهێنا، ئیتر هەرسێکیان بوون بە یەکگرتوو.

**لە یەکگرتن لەگەڵ پارتی گەل دەورت نەبوو؟**

- نەخێر، ئەوکاتەی کە بڕیاریاندا ببنە یەککگرتوو، من تێکەڵاو نەبووم و نەشبوومە یەککگرتوو.

**بۆچی تەمەنی یەککگرتن ئەوەندە کورت بوو، ئێوە یەککگرتنتان بۆ ئەوە دروستنەکرد تا ببێتە هێزی سێیەم؟**

- ئاخر بناغەکەی هەڵەبوو، سێ حیزب بیروباوەڕیان جیایە، لەگەڵ یەک ناکۆکیان هەبووە، هەر لەبەر ئەوەی لە هەڵبژاردن دەرنەچوونە ببنە یەک، ئەوە بناغەی نابێ، بۆیەش زۆر دەوامی نەکرد، هەر لەبەر ئەو بێ بناغەیەش بوو، لەگەڵ دروستبوونی، کۆمەڵێک کێشەی تێکەوت، بۆ نموونە کاک رەسول دواتر هەستی کرد کە لە کۆنگرە سۆسیالیست غەدری لێکراوە، بۆیە رازی نەبوو و جیابووەوەو هەر زوو کۆنگرەی سۆسیالیستیان کردەوەو چوونە ناو یەکێتی، ئەوەی دیکە چووە ناو پارتی و پاشان حەمە لەناو پارتی هاتەوە دەرو سۆشیالیستی دروستکردەوە، گەلیش هەندێکیان لەگەڵ کاک سامی نەچوون ئیتر شتەکان نارێک بوون، بەڵام من پەیوەندیم بەو مەسەلانە نەبوو.

**لەبەرچی نەچوویە یەکگرتن، بڕوات پێ نەبوو؟**

-بەڵێ بڕوام پێ نەبوو.

**ئێوە پێشتر کۆبوونەوەتان نەکرد لەبارەی یەکگرتنەکە؟**

- با، لە سلێمانی کۆبوونەوەمان کرد، پێمگوتن من بەشداری لەو یەکگرتنە ناکەم.

**دیارە رەئیت کەمینەبووە؟**

- مەسەلە رەئی نەبوو، دەمزانی ئەساسەکەی لاوازە، وەک گوتم سێ لایەنی لێکجیاواز تەنها لەبەر ئەوەی دەنگیان نەهێنا یەکبگرن، هەروەها لە بیرت نەچێ ئاسان نییە تۆ لە نێوان پارتی و یەکێتی شتێک بکەی، ئەوان مەجالت نادەن بە کەیفی خۆت کار بکەی.

**له دیمانەیەکی گۆڤاری هەرێمدا، حەمەی حاجی مەحمود دەڵێ من کە چوومە ناو پارتی، دکتۆر مەحمود بە فاکسێک پیرۆزبایی لێکردم و گوتی منیش دێمە ناو پارتی؟**

-وەڵڵا ئەوە ئەسڵی نییە، ئەوە درۆیەکی زۆر گەورەیە، بەداخەوە نەمدەزانی حەمە قسەی ئاوا دەکات، بەڵام ئەگەر فاکسەکەی لایە با بڵاوی بکاتەوە، خۆ ئەو زیرەکە لە هەڵگرتنی شتەکان و دواتر بڵاوکردنەوەیان، ئەگەر راست دەکا با ئەو فاکسە بڵاوبکاتەوە، بەڵام من هیچ فاکسێکم بۆی نەکردووە. لە بیرم دێ ئەوکات لە لەندەن بووم، تەلەفۆنیان بۆ دەکردم، کە شتێکی وا هەیەو تۆ رات چییە، من پێمدەگوتن کاکە ئێوە خۆتان لەوێن و بڕیار دەن، من هیچ پەیوەندییەکم بەو یەکگرتنەوە نییە. بەڵام من رام وابوو کە ئەگەر چوونە ناو حیزبێک، تەواو، بانێنە دەرەوە، ئاخر حیزبی سۆسیالیستی فەقیر ٤ جار نەماو ٤ جار دروستکرایەوە، ئاخر ئەوە چییە!؟ لەگەڵ ئەوەش بە کەسم نەگوتووە، بڕۆنە ناو فلان حیزب. حەمەو جەماعەت پرسیاریان کرد، گوتیان دەچینە ناو پارتی، رات چییە، گوتم باشە بچن، کە هاتنەدەر، گوتم بابە دەچیە ناوو دێیەدەرو ئەوە نابێ، یان بچۆ، یان مەچۆ، ئەگەر نا فاکسم نەکردووە، عەیبیشە ئەو قسەیەی کردووە. شتێکی دیکە هەیە کە ئێستاش پێمواية، کەسێکی وەکو حەمە یا هەر کەسێکی دیکە رەنگە لەناو پارتی زیاتر دەور ببینێ، لەوەی بە تەنیا بێ، ئێستاش دەتوانن ئەوە بکەن، ئەو هەموو حیزبە چییە لە کوردستان،!؟ چ پێویست دەکات هەبن!؟ حیزبی وا هەیە

ئەوەندە بچووکە ناتوانێ دەور ببینێ، تائێستا بیست ئینشقاقی تێدا کراوە، ئەوە چییە!؟ بەناو حیزبە.! بەڕای من دوو حزبی گەورە لە کوردستان دەور دەبینن، لەگەڵ ئەوانەش شیوعی هەیە کە حزبەو مەوجودە، ئیسلامی هەن کە حیزبن، ئەوەی دیکە لێرەو لەوێ ئەگەر بچنە ناو حیزبە گەورەکان ڕەنگە باشتر بێ، ئەوە ڕای منە نەک ئەوەی حەمە باسی کردووە، ئەگەر فاکسیشی لایە با بڵاوی بکاتەوە، خۆ ئەو کاغەز و شت هەڵدەگرێ، تۆ کتێبەکانی ئەوت دیوە!؟ ئێ دەبێ فاکسەکەی منیشی دەبێ لابێ.

**تەکلیفیشی لێ نەکردی کە بێیتە ناو پارتی؟**

- نەخێر، هیچ پەیوەندی بە من نەبوو، چونکە ئەگەر من بچمە ناو پارتی بەهۆی کاک مەسعودەوە دەچم، حەمەی بۆ چییە؟ قابیلە لەسەر ئەوە پەکم کەوتبێ!؟ مەعقولە من بەهۆی حەمەوە بچمە ناو پارتی!؟ ئەوە کاک مەسعود هەیەو برادەرین و بە یەکەوە ئیش دەکەین، هەر کاتێک بمەوێ پێی دەڵێم و دەچمە ناو پارتی، حیزبی خۆم بووە لە کۆندا، مەعقولە بەهۆی حەمەوە بچم، کەس بە شتی وا بڕوا دەکات!؟

**تۆ بە کەسایەتیەکی سەربەخۆ ناسراوی، لەو مەسەلانەی رابردووش هەوڵت هەبووە لە نێوانکردنی ئەو دوو حیزبەدا، تۆ دۆستایەتی زیاتر لەگەڵ کام لەو حیزبانەیە؟**

- بە ڕاستی من دۆستایەتیم لەگەڵ کورد بەهێزە، دەمەوێ بۆ کورد کار بکەم، بەڵام دۆستایەتیش بەپێی سیاسەتە. بۆ نموونە من ئێستا هەموو هاوکارییەکی کاک مەسعود دەکەم، چونکە دەبێ سەرۆکی

هەرێم سەرکەوێ، من هاوکاری دەکەم وەک سەرۆکی هەرێم، نەک وەک سەرۆکی پارتی، کە سەرۆکی پارتیش بوو، دۆستم بوو، ٣٠ ساڵ زیاترە دەیناسم و پەیوەندیمان هەبووە، بەڵام لەوەو پێش لەگەڵ مام جەلال ئیشم نەکردووە، مەبەستمە ئەو دوو برادەرە رێک بن، چونکە چارەنووسی کورد بەو دوو کەسەوە بەندە، ئەوان چەند رێک بن، بۆ ئێمە سەرکەوتن و پێشکەوتنە، لەبەر ئەوە زۆر هەوڵمداوە ئەو دووە رێک بن، هەوڵ زۆر دراوەو منیش دەورم تێیدا هەبووە، ئێستا وا یەکیان سەرۆک کۆمارەو یەکێکیشیان سەرۆک هەرێمە، هەر کارێکیشیان هەبێ و بەمن بکرێ، من ئامادەم بیکەم.

**ئەوکاتەی تۆو فەخری کەریم کەوتنە نێوانیان، محەمەدی مەلا قادرو هەندێکی دیکە گوتیان پێویستیمان بەناوبژی نییە، خۆ ئێمە پەیوەندیمان نەپچڕاوە.... تۆ رات چی بوو؟!**

- ئێ باشە پێویستیان پێ نییە با رێک بکەون، تائێستا ئیدارەکانیان بکردبایەوە یەک، مەمنونین ئەگەر پێویستیان بە ئێمە نەبێ، بەڵام وابزانم رای مەلا محەمەد خۆی بوو، رای پارتی وا نییە، من لێم پرسی، ئەو گوتی مەبەستی من وانەبووە، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە کە دەبووایە وا بین، ئیتر وای بە من گوت، نازانم.

**تۆ زۆرجار دەوری سەرکردەت بینیوە، بەڵام دەڵێن حاسم نەبوویت لە کێشەکان، واتا کێشەکانت یەکلانەکردۆتەوەو بە کراوەیی بەجێت هێشتووە، بەڵام سەرکردە ئەگەر سەرکردە بێ دەبێت حاسم بێت وانییە؟!**

- ئاخر عاسم، خەڵک بکوژێ، چی بکا؟ ئێمە هەمیشە مامناوەندی بووین و لایەنگری ئاشتی بووینە، سوپاس بۆ خوا لە ژیانمدا تەیرێک لەسەر من نەکوژراوە، قەت تەقەم نەکردووە، ئەگەر ئەو شتانە حاسمە، من حاسم نەبووم، هەوڵمداوە هەموولایەک تەبابن و پەیوەندیشم لەگەڵ هەموو لایەک باشە.

**پەیوەندیت لەگەڵ حیزبی شیوعی چۆنە؟**

- باشە، دۆستی یەکین.

**لەو دواییە لە راگەیاندنەکان بڵاویووەوەو حەمەی حاجی مەحمودیش لە دیمانەکەی لەگەڵ هەرێمدا باس دەکا کە هەردوو حیزبی سۆسیالیست و زەحمەتکێش کە بە نیازبوون یەکبگرن، داوایان لە تۆ کردووە کە ببیە سەرۆکی حزبە نوێیەکە، بەڵام تۆ رازی نەبوویت؟**

- ئەوە راستە، گوتیان ئێمە یەکدەگرین تۆ برا گەورەبە، منیش گوتم سوپاستان دەکەم، هاوکاریتان دەکەم، بەڵام مەسئولیەتم ناوێ.

**بەڵام ئەوەش بڵاوبووەوە کە تۆ بۆیە رازی نەبوویت، چونکە گوتووتە حیزبێکی عێراقی دادەمەزرێنم؟**

- ئەوە راست نییە، ئێستا وەزعی کورد ناسکە، ئەگەر هەر شتێک بکەم، راوێژ بە یەکێتی و پارتی و برادەران دەکەم دەبێ لە خۆمانەوە ئیش نەکەین، ئەگەر هەموومان قەناعەتمان هات بەوەی کە حیزبێکی گەورەی عێراقی دروستبکەین، بۆ نەیکەین.

**پێتوایە لە ناوەڕاستی مانگی ١٢ی ئەمساڵ هەڵبژاردن دەکرێتەوە؟**

- بڕیارە لە ٢٠٠٥/١٢/١٥ هەڵبژاردنی عێراق بکرێ، بەڵام شەرت نییە هی کوردستانیش لەو کاتی بکرێ، هەرچەندە هێشتا ئەوە روون نەبۆتەوە، بەڵام بەپێی دەستووری هەمیشەیی هەر هەرێمێک بەپێی دەستووری خۆی هەڵبژاردن دەکات، پارتی و یەکێتی لە کۆبوونەوەی دوکان بڕیاریانداوە کە نایانەوێ تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ هەڵبژاردن بکەن ئەگەر لە سەریان فەرز نەکرێ، دەیانەوێ مادەی (٥٨) جێبەجێ بکرێ، ئینجا هەڵبژاردن بکەن، باشیشە ئەو هەموو هەڵبژاردنە بۆچییە؟ ئەمریکا زۆر پەلەیەتی هەڵبژاردنی عێراق بکرێ، چونکە دەیەوێ ستراتیژیەتی خۆی دانێ.

**ئەگەر لە ٢٠٠٥/١٢/١٥ هەڵبژاردنی کوردستانیش کرا پێتوایە پارتی و یەکێتی بە لیستێک دادەبەزن؟**

- هەر دەبێ بەیەک لیست دابەزن، چونکە ئەگەر وانەبێ کێشە لە نێوانیان دروست دەبێ، رەنگە بۆ پارێزگاکان لیستی جودایان هەبێ، لەوەش دەتوانن بەیەک لیست دابەزن، ئەگەر هەڵبژاردنەکە وا زوو بکرێ.

**پێتوانییە کوردستان لە عێراق ترازابێ، بەوەی کورد کولتوورو بیرکردنەوەی تەواو لە بەشەکانی دیکە جیاوازە، بەمەش جارێکی دیکە پێکەوە لکاندنی بە عێراق زەحمەت بێ؟**

- بێگومان عێراق کە دروست بووە هەمووی پێکەوە لکێنراوە،

چونکە دەوڵەتی دیموکراسیشی نەبووە، زەمانی مەلیک ماوەیەک خەریک بوو قانون هەبێ، بەڵام زۆر نەبوو، پاش ئەوە بووە ئینقلابات. بەعسیش هات، بە جارێ شتەکەی هەڵوەشاندەوەو وڵاتەکەی بە زۆر بەیەکەوە نووساند، شەڕی هەموو لایەکی کرد، وەکو بڵێی شتێک بێ بە دەستیەوە گرتبێ، کە سەدام نەما شتەکە پچڕا، وەزعێکی تازە دروست بوو، هەر ناوچەیەک لە عێراق تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەو تایبەتمەندییانە زۆریش لەیەک جیاوازن، هەڵبەت سیاسەتی ئەمریکا وایە ئەو وڵاتە بەیەکەوە گرێ بدرێ، وەک وڵاتێکی فیدراڵی یا شتێکی وابێ، بەڵام ئەو پێکەوە گرێدانەش زەحمەتە، هەر لە ئەمریکاوە تا ئێمەمانان پرسیار دەکا کە ئەگەر ئەو گرێدانە کراو بەپێی دەستوورەکەش سوننە هاتنە ناوی و رێککەوتن و هەر کەسەو هەرێمی خۆی حکومەتی فیدراڵیان دروستکرد، ئەوا حکومەتێکی فیدرالی دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر وانەبوو، ئەوا عێراق دەبێتە ٣بەش، بەڵام هێشتا ئەو مەسەلانە روون نین، چونکە هەر ناوچەیەک تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەگەر ئەمریکا کشایەوە ئایا چی دەبێ؟ هێشتا وەڵامی ئەو پرسیارانە روون نییە.

**لە کۆبوونەوەی دوکان باس کرا کە بەو زووانە هەردوو ئیدارەکە یەکدەگرێتەوە، ئایا پێتوایە ئەمجارە یەکبگرنەوە، یا وەک جارەکانی دیکە هەر قسەیە؟**

- وەڵڵا هەموو جارێ باسی دەکەن، بیرم دێتەوە کاک مەسعود بووە سەرۆکی هەرێم، وتارێکی درێژی خوێندەوەو گوتی رۆژانی ئاییندە

یەکدەگرینەوە، لە پاشان مام جەلالیش هەر وای گوت، بەڵام دیارە کۆسپ ماوەو ئەگەر چارەسەر نەکرێن، رەنگە یەکگرتنەوەکە ئاسان نەبێ.

**کۆسپە ئەساسییەکان چین؟**

- ئەوەیە کە یەکێتی دەیەوێ سەرۆک وەزیران بە نۆبەت بێ، هەر ساڵی یەکێکیان بێت، تێکەڵکردنەوەی دەزگا ئەمنییەکانیش کێشەیەکی دیکەیە.

**واتا بەو زووانە تەواو نابێ؟**

- ئەگەر ئەو کۆسپانە لانەچن، وەختی دەوێ.

**پێتوانییە پەرلەمانی عێراق لە پەرلەمانی کوردستان ئەکتیڤترە، رەخنە دەگرێ و قسە دەکاو لێپێچینەوەی هەیە، بەڵام پەرلەمانی ئێرە، یەک پەرلەمانتار نوقەی لێوە نایەت..؟**

- بێ گومان پەرلەمانی عێراق چالاکترە، شەفافیەتی زیاترە، ئومێدەوارم پەرلەمانی کوردستانیش وایلێبێ، شەفافیەتی زۆربێ و لێپرسراوان بانگ بکا بۆ لێکۆڵینەوە.

**پێتوایە وایلێبێ؟**

- ئینشاڵڵا.. هەوڵدەدەین. دەبێ وای لێ بێ، ئەگینا سوودی کەم دەبێ.

**پێش ئەوەی بێیتەوە بۆ کوردستان، ئەوکاتەی لە لەندەن بوویت BBC زۆر گرنگی پێدەدای، لەم ساڵانەی دواییش راگەیاندنی جیهانی گرنگی زۆرت پێدەدا لە چاو سەرکردەکانی دیکە، ئەوە**

**بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

- خۆی ڕاگەیاندنی دونیا بۆ ڕاشکاوی و شەفافیەت و باسکردنی هەندێ خاڵی نهێنی کە خەڵک باسی ناکات دەگەڕێت. من گرنگترنیم لە کەس، بەڵام یەکەم پەیوەندیم زۆر لەگەڵیان هەیە، دووەم هەرچی بزانم، دەیڵێم، هیچ ناشارمەوە، ئێ ئەوانیش بۆ ئەو شتانە دەگەڕێن. زۆرجاریش کەسی دوو حیزبەکەیان دەستناکەوێ، چونکە هەندێ لە برادەرانی دوو حیزبەکە کەمتر قسە دەکەن، بۆیە دێنە لای من.

**تۆ زۆر ڕەخنە لە ئەمریکا دەگری، بەڵام کەمتر ڕەخنە لە پارتی و یەکێتی دەگری، زیاتر ڕەخنە لە ئەمریکاو شیعەو سوننە دەگری؟ ئەمە بۆچی؟**

- ڕەخنەم لەوانیش گرتووە، بەڵام دەزانی چۆن، من لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا ڕەخنە لە ئەمریکا دەگرم، لەناو ڕۆژنامە عەرەبییەکان ڕەخنە لە شیعەو سوننە دەگرم، لە ڕۆژنامەکانی ئێرەش ڕەخنە لە پارتی و یەکێتی دەگرم، بەڵام نامەوێ کێشەو ململانێکانی کورد بخەمە ناو ڕۆژنامەکانی دونیاو بچێتە دەرەوە، یا بچێتە ناو ڕۆژنامە عەرەبییەکان، بەڵام ئەوەی پێویست بێ، ڕەخنەمان گرتووە، ڕەنگە ڕەخنەکان نەگەیشتبن، چونکە لەناو کورددا زۆرجار ڕەخنە لێگیراو تووڕە دەبێ، بەڵام کە بە پێویستیم زانیبێ بە خۆیانم گوتووەو هەوڵمداوە چاکی بکەن، ئەگەر چاک نەبووبێ، ئینجا قسەم کردووە.

**لێت زویر نابن؟**

- وەڵڵاهی وابزانم لەگەڵ یەک راهاتووین، قسە دەکەین و دۆستیشین.

**بە نیازنیت لە هەڵبژاردنی داهاتوو خۆت هەڵبژێری و بێیتەوە ناو سیاسەت؟**

- ئێ ئەوە نییە وا لەناو سیاسەتم.

**مەبەستم لەشێوەی رێکخستنە!**

- ئێستا من ئەندامی پەرلەمانی عێراقم، ئەندامی لیژنەی نووسینەوەی دەستوورم، هەرچی لە کوردستان بووە، بەشدارم.

**ئەوە وەکو کەسایەتییەکی سەربەخۆ بووە**

ئێ خۆ بە تەنیا نەمکردووە، بەهاوکاری ئەمریکایە. ئیتر سیاسەت چییە. لەوانەیە ئەگەر هەڵبژاردنی داهاتوو نزیک بێتەوە، بەپێی بەرژەوەندی، ئەگەر زانیمان بەرژەوەندی ئەوەیە لێرە دەورمان هەبێ ئەوە دەیکیەن، لە بەغدا پێویست بکا لەوێ دەیکەین، بۆ مەسەلەی حیزبیش ئەوە بارودۆخ دەزانێ، تائێستا نازانم هیچ بڵێم لە ئایندە دەردەکەوێ.

**پاش ئەو هەموو تەجروبەیە، یاداشتەکانی خۆت نووسیوەتەوە؟**

- بەڵێ هەمە. ئەو شتانەی لە ژیانمدا روویانداوەو بە گرنگم زانیون، هەموویم نووسیونەتەوە، خوایاربێ رۆژێک بڵاوی دەکەمەوە، چونکە موڵکی خەڵکە بە ئەرکی دەزانم، هەمووی رووداوە، شتی شەخسی تێدایە، بەڵام، پێویستە خەڵک بزانێ ئێمە چیمان کردووەو چیمان نەکردووە، هەندێک شت نەزانراوە پێویستە خەڵک بیزانێ.

سەلاحەدین بەهائەدین :

# ئێمە گوتومانە حکومەتی ئاینیمان ناوێ، حکومەتی ئاینی لە ئیسلام مەرفوزە



بزاڤی ئیسلامی لە کوردستاندا، تا راپەرینی بەهاری ١٩٩١، رۆڵێکی ئەوەندە بەرچاوی نەبووە، رەنگە ئەگەر هەڵەبجە کیمیاباران نەکرابوایە، رۆڵی ئیسلامی سیاسی لاوازتریش بوایە، مامۆستا سەلاحەدین بەهائەدینیش تەمەنێکی درێژی لەناو بزاڤی ئیسلامیدا نەبووە، بەڵام لەبەر هەر هۆیەکەوە بووبێت، لە ماوەیەکی کورتدا لەناو ئیخوان موسلمینی عێراقدا جێگەی خۆی کردۆتەوەو، هەر بەماوەیەکی کورتیش لە ئێران کراوە بە ئەمینداری گشتی ئیخوان موسلمینی عێراق، دوای راپەرینیش وەک کەسی دووەمی ناو ئیخوان ماوەتەوە، تا لە ١٩٩٤ یەککگرتووی ئیسلامی راگەیاندو دایەزراند، کە درێژەبووەوەی ئیخوانی عێراقە.

مامۆستا سەلاحەدین، بەهۆی ئەوەی ئەمینداری ئیخوان و دواتریش ئەمینداری یەککگرتووبوو، ئەزموونێکی دەوڵەمەندی چ لەگەڵ حزبە ئیسلامی سیاسیەکانی کوردستان و عێراق هەیە، چ لەگەڵ ئەو وڵاتانەیش کە بزاڤی ئیسلامیان تێدا بڵاوە، وەک لەو دیمانەشدا دەردەکەوێ، راستە ئیستغلالی ناوی ئیسلامیان کردووە، بەڵام ئەوان وەک یەککگرتوو لە بنەڕەتدا کار بۆ گەیشتنە دەسەڵات دەکەن، تارادەیەکیش هەوڵیان داوە خۆیان لەگەڵ واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان بگونجێنن، لەناو سەرکردایەتیشیاندا نزیکەی (٥) ئافرەتیان هەیە، کە ئەو رێژەیە لە هیچ کام لە حزبەکانی دیکەی کوردستان بەدی ناکرێ، بەڵام گرفتی یەککگرتوو ئەوەیە، چونکە درێژ

**بووەوەی ئیخوان موسلمینە، ئیخوان موسلمینیش هەلقولاوی ناو میسرەو هەموو ئیخوانەکانی دونیا، تەوجیهات لە مەکتەبی ئیرشادی میسر وەردەگرن، تا ئەمە وایکردووە، یەکگرتوو مۆرکە کوردییەکەی کاڵ و لاواز بێت و نەتوانێ پێ بە پێی رووداوەکانی کوردستان کە زۆر ئاڵۆزن هەڵوەستە وەربگرێت.**

**دەکرێ باسی یەکەم ئینتیمات بۆ هەر بزووتنەوەیەکی ئیسلامی، یا سیاسی بکەیت، ئایا یەکەمجار چوویە ناو ئیخوان، یان پێش ئەوە لە گروپی دیکە کارت کردووە؟**

- یەکەمجار لە ساڵی ١٩٦٥ چوومە ناو کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین.

**بۆچی ئیخوانت هەڵبژارد، لەکاتێکدا ئیخوان هەڵقولاوی واقیعی ناو میسر بوو،تارادەیەک بە عێراق نامۆبوو، وەک چۆن حیزبی شیوعی سۆڤیەتی لق و پۆپی بۆ هەموو وڵاتەکانی دیکە کێشابوو، ئیخوانیش وابوو، لە میسرەوە لەسەردەمی حەسەن بەنناوە، ئیتر دواتر لە وڵاتی عەرەبی بڵاوبووەوە؟**

- ئیخوان لە عێراقدا، دەتوانم بڵێم عێراقیندراو بوو، چونکە ئیخوان لە چلەکانەوە لە رێگەی محەمەد مەحمود سەواف و ئەمجەد زەهاوی کە کورد بوو هاتبووە عێراق، بەرگێکی عێراقیشی بەسەردا هاتبوو. هەڵبەتە ئیخوانیش قوتابخانەیەکە، نەک بزووتنەوەیەکی سیاسی، راستە ئێستا جموجۆڵی سیاسیش دەکەن، لە میسردا

دەیانەوێ حزبیـان هەبێ و لە ئوردن حـزبیـان هەیە، بەڵام لە بنچـینەدا قوتابخانەیەکی فـیکری، پەروەردەیی و دەعـاوییـە. ئینجـا لـەسـەر ئەو ئەساسەشدا لە چلەکاندا لە عێراق جەمعیەیەکیـان دانابوو، بەناوی (جمعیه القوه الاسلامیه). ئیتر لەو کاتەوە تەوژمەکە هاتبووە عێراق و بڵاوببـووەوە. من چونکە لە بنەمـاڵەیەکی ئاییني بووم، باوکـم و باپیـرم و بەتایەفـە مـەلا بووین. هەرچەندە خـوێندنی شـەرعـیم نەخوێندووەو فەقێ نەبوومە، بەڵام هەر لە خزمەت باوکم بووم. واتا لە رووی دینی و خێزانیەوە نزیک بووم بەو ئاراستەیە.

**بە پێی هەندێک سەرچاوە ئیخوان یەکەمجار لە موسڵ دروست بووە؟**

- نا، بەڵام محەمەد سەواف خەڵکی موسڵە.

**بەڵام هەیئەتەکە لە ٥-٦ کەس پێکهاتبوو، محەمەد سەواف سەرۆک نەبوو، دوای دروستبوونی حکومەتی کۆماری ئینجا بووە سەرۆک...**

- ئەگەر ئەو سەرۆک نەبووبێ، ئەمجەد زەهاوی سەرۆک بووە.

**ئێوە دەتانزانی ئیخوان هەڵقوڵاوی میسرە، لە میسریش ئیخوان باروددۆخێکی سەلیمی بۆ دروست نەبوو، لەگەڵ حیزبە نیشتمانییەکان لە گێرمەو کێشەدابوو، بۆ نموونە حیزبی وەفد، کە ئەو کاتە حیزبی شەقام بوو لە میسر، بەڵام تاکە هێزێک کە بەرامبەری دەچەقی، ئیخوان بوو، حیزبی وەفد بە نیشتمانی**

**دادەنرا، ئیخوان بەربەرەکانێی کرد، ئێوە ئەوکاتە کە دەچوونە ناو ئیخوان، دەتانزانی ئیخوان لە میسر وەزعەکەی بەو شێوەیە؟**

- نا، ئێمە بەو شێوەیە ئاگامان لە میسر نەبوو، ئێمە پێمان وابوو، ئەوە تەوژمێکی ئیسلامییەو چوونە ناوی کارێکی ئیسلامی بوو. جگە لەوە ئەو ماوەیە، ماوەی ئەزیەتدان و گرتن و کوشتنی ئیخوانەکان بوو لە میسر، جەمال عەبدولناسر دەیگرتن و بەریدەدان و ئیعدامی دەکردن، ئەوەش جۆرێک لە سۆزی دروستکردبوو لەگەڵ میسرییەکان.

**ئیخوان لە میسر تاحوکمی مەلەکی هەبوو هیچ گرفتێکیان لەگەڵ حکومەتی پادشایەتی نەبوو، بەڵام لەگەڵ هاتنی کۆماری تووشی گرفت بوون، لە عێراقیش بەهەمان شێوە، لەگەڵ حکومەتی پاشایەتی هیچ کێشەیەکی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام کە حکومەتی کۆماری لە عێراق دامەزرا، سەواف چووە سوریاو نامەیەکی بۆ جەمال عەبدولناسر ناردو داوای رووخانی حکومەتی کۆماری کرد...**

- نا، ئەوە دەقیق نییە. لە میسر لە زەمانی فاروق ئیخوان هەڵوەشێنرایەوە، لە (١٩٤٨)ەوە تائەمڕۆ ئیخوان هەڵوەشێنرایەوە، واتە لە میسردا بەرەسمی قەدەغەیە. لە شوباتی ١٩٤٩، واتا چەند مانگێک دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیخوان، حەسەن بەنناشیان شەهیدکرد، لەسەر جادە تیرۆریان کردو ئاشکراش بوو کە کۆشکی

مەلیکی لە دوای کوشتنی بوو. لەبەر ئەوە ئەوەی دەربارەی میسر گوتت دەقیق نییە. لەویٚ ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لەگەڵ ئیخوان بوون، جەمال عەبدولناسر خۆی مەیلی ئیخوانی هەبوو، بەڵام دوایی لێیان هەڵگەڕایەوە.

هەرچی دەربارەی عێراق، عێراق وەزعێکی تایبەتتری هەبوو، چونکە لە عێراق دەستەڵاتی مەلەکی هەبوو، جاریٚ باواز لەوە بێنین کە تەوژمی کۆمۆنیستی لە عێراقدا دژ بە مەلەکی بوو، ئەویش زۆر دژی ئەو تەوژمە بوو، بەڵام مەلەفەکانی دیکە لە زەمانی مەلەکی حاڵیان باش بوو، هەتا مەسەلەکانی ئازادی و پەرلەمان و نەواب و ئەعیان ئەوانە شت بوون لە زەمانی مەلەکیدا. مەسەلەی کورد حالی خراپ نەبوو، وەکو ئێستا کە عەزاب و خراپەکارییەکانی دژ بە کورد بووبێتە قانون. وەزیری ناوخۆ کورد بوو، جاری واهەبووە سەرۆک وەزیران کورد بووە، واتە حاڵی کورد لە زەمانی مەلەکیدا باشتربوو، چونکە مەلیکی عێراق شتێک بوون، هێنرابوون، هەر بۆیەش هێنرابوون کە زۆر تەرەف نەبن لە کێشەکانی عێراق، بەیەک چاو سەیری خەڵکەکە بکەن، دیارە بەهۆی ئەوەی ئینگلیز خۆی لە مەیدانەکەدا بوو، دەبوو مەرامی ئینگلیزیش جێبەجیٚ بکەن. ئینجا لەو قۆناغەدا وا دەردەکەویٚ بۆ هاوسەنگی لە گۆڕەپانی سیاسی، ڕێگا درابیٚ بە تەوژمی ئیسلامی، مادام کۆمۆنیستی لێیدەدریٚ، لە بەرامبەردا تەوژمی ئیسلامی ڕێی پێدرابیٚ و حیسابیان بۆ کردبیٚ،

چونکە ئەوانەی تەوژمەکەیان دەگێڕا، کەسایەتی بوون، رموزی عێراقی بوون، وەکو سەواف، ئەمجەد زەهاوی، بۆیە رێگە پێدانیان بە رێگەپێدانێکی سیاسیی حیساب نەدەکرا، بەڵێ بە پلانێکی سیاسی بوو، بەڵام رێگەپێدانی پیاوان و زانایانی ئایینی عێراقی بوو. کە ساڵی ١٩٥٨ هات، هەڵبەت ئەو ساڵە هەڵگەڕانەوە بوو لەسەر هەموو شتەکان، بەتایبەتی کە حیزبی شیوعی هاتە پێش و ئیستغلالی بارودۆخەکەی کرد، ئیتر بەرووحێکی تۆڵە سەندنەوە بۆ ئەو مەوزوعە دەگەڕا، یەکێ لەوانەی کە تووشی زەحمەتی هات و نەیدەتوانی دابنیشێ، سەواف بوو، سەواف لە ساڵی ١٩٥٩ رایکردو چووە سوریاو دوایی چووە سعودیە. ئیتر دوای ئەوە کەم کەم دامرکایەوەو ئارام بووەوە. عەبدولکەریم لەگەڵ حیزبی شیوعی بەینیان تێکچوو، شتەکە چووە قالبێکی دیکە،تا حیزبی ئیسلامی کە واجیهەیەکی ئیخوانی بوو، لە ساڵی ١٩٦٠ مۆڵەتی پێدراو دامەزرا.

**راستە لە ١٩٤٧-١٩٥٢ ئیخوان لە میسر هەندێک تەنگەتاوکرا، بەڵام پێشتر وەزعی زۆر باش بوو، بنکەیەکی فراوانی جەماوەریشی هەبوو، لە عێراقیش حیزبی شیوعی لەسەردەمی پاشایەتی وەزعی باش نەبوو، بۆ نموونە فەهدو حازم و صارم لەسەردەمی پاشایەتی شەهیدبوون. هەروەها حیزبی شیوعی مۆڵەتی پێنەدرا، حیزبی ئەحراریان دروستکرد بۆ ئەوەی وەکو واجیهەیەک بەکاری بێنن، پرسیار ئەوەیە، لە ساڵی ١٩٦٠**

**ئیـــخــوان نــاوی خــۆی گــۆڕی، بـەڵام لە ســاڵی ١٩٧١ خــۆیان سڕ(تجمید) کرد، بۆچی خۆیان سڕ (تەجمید) کرد؟**

- هۆیەکـە زۆر روونە، بەعس لە ١٩٦٨هاتە سـەر حـوکم، دەبێ ئەوە بزانین بەعس لە سوریەو لە عێراق زۆر دژی ئیخوان بوو، چونکە بەعس بیروبۆچوونی وایە کە عەرەب بەخۆی و بەئیسلامیەوە، بکاتە هی خـۆی، عـەفلەق قـسـەیەکی هەبوو، دەیگوت (کـان مـحـمـد کل العرب، فلیکن کل العرب محمدا). مەبەستی وابوو کە عەرەب واتە ئیسلام، ئیسلام واتە عەرەب، لەبەر ئەوە هەر تەوژمێکی ئیسلامی بە دژی خۆی حیساب دەکرد.

**بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە حیزبی شیوعی ئەوەندە خەڵکەی لێ شەهیدبوو، ئەوەندە جەربەزەی دیت، کەچی قەت خۆی تەجمید نەکرد...**

- ئینـجـا باسـەکـە لێرەیە، ١٩٦٨ ئەوەی ئێـمـە بینیـمـان بەعس سـەرکـردایەتی ئیــخـوانی بانگ کـرد کـە دەبێ وابکەن و وانەکـەن، هەندێکی لێ ئیعدام کردن بەناوی شتی دیکەوە، بیانوویەکی گرت، مەوزوعێک بوو لە ساڵی ١٩٧٠ کۆمەڵێکی ئیعدام کرد، هەندێک لەوانیـشی تێـدابوو، لە ١٩٧١دا وادەردەکـەوێ کـە جـارێکی دیکە ئاگـاداری کـردوون کـە دەبێ یا خـۆتان هەڵوەشـێننەوە، یا هەمـووتان دەگـرین، واتا هەر هەڵوەشـاندنەوەیە بەمـانـایەکی دیکە. ئەوکـاتە زەمانی دکتۆر عەبدولکەریم زێدان بوو، کە کەسایەتییەکی جامعییەو

ئێستاش ماوەو لە یەمەن دادەنیشێ. ئەو فتوای وابووە کە ئەمە شەڕێکەو بەعس بەجیدیەتی و جاری دووەمیشیەتی، تەواو، ئێمە ناتوانین بمێنین، یان دەبێ هەموومان بمرین، یادەبێ بووەستین، ئیتر دیارە بڕیاریانداوە بوەستن واتە خۆیان تەجمید بکەن.

**لەو کاتەوە چالاکی راگیراوە؟**

- چالاکی وەکو رێکخستن راگیراوە.

**لە زۆر سەرچاوە باس لەوە دەکرێ ئیخوان لە ساڵی ١٩٧٩ دەستیپێکردووە، ئەویش لەسەردەستی مەلا سدیق عەبدولعەزیز کە دەستی بە چالاکی کردووەو بابڵێین لە ئێرانەوە هاتەوە، بەڵام ئەو دژی تەوەجوهاتی ئیخوانیش بووە...**

- مەلا سدیق و غەیری مەلا سدیق ئەوانەی کە لە ناوچەی کوردی بووین، زۆر کاریگەری ئەو وەستانەی ئیخوانمان لەسەر نەبوو، ئێمە هەر جموجۆڵ و چالاکی خۆمان هەبوو، بەڵام بەو شێوە مونەزەمەی ئەوسانەبوو، مامۆستا مەلا سدیقیش یەکێ بوو لەو خەڵکانەی کە لە هەڵەبجە بوو، بەڵام لە ماوەی شۆڕشی ساڵی ١٩٧٤ کە خەڵک چوونەدەرەوە، هەموو شارەکانی کوردستان خەڵکی لێنەما، کە هاتینەوە وەکو ئەوان پێیاندەگوتین عائیدون، هەربەکە بەشێوەیەک تەفروتونا بووین، هەندێک بۆ باشووری عێراق گواسترداینەوە، هەندێک مانەوە، بەگشتی فشارێکی زۆری بەعس لەسەر ئێمەش وەکو ناوچەی کوردی، دروستبوو. مامۆستا سدیقیش لەوکاتە وەک

هەر کەسێکی دیکە لەوانەبوو کە هەموو ئاواتمان ئەوەبوو نەمانکەنە بەعسی و وازمان لێبێنن، چونکە فشار هەبوو، ئەو مامۆستا (موعەلیم) بوو، منیش مامۆستا (موعەلیم) بووم. ئەو وەختە نەبوونە بەعسی پاڵەوانییەک بوو، چونکە زەحمەت بوو، تەعلیمیشیان هەموو کردبووە بەعسی، بەڵام سوپاس بۆ خودا لەوەدا سەرکەوتین- مامۆستا سدیقیش بەو شێوەیە دەمانبینی، بەڵام لە ۱۹۷۹و پێش ئەو ساڵەش، ماوە ماوە کە دیدارمان دەکرد، هەستماندەکرد مەلاسدیق عەبدولعەزیز گلەیی لە وەستاندنی ئیخوان هەیە، ئێمە بەگشتی گلەییمان هەبوو، بەڵام ئەو زۆرتر. دیارە گلەییەکەی گەیاندە ئەوە کە هەندێ گەنجی لە خۆی کۆکردەوەو تەشکیلاتێکی هەر بەناوی ئیخوانەوە دروستکرد، وادەردەکەوت، ئێمە نەمانزانی، بەڵام وا ناسرابوو.

**بەڵام دەڵێن ئەو کاتەی ئەو تەشکیلاتەی دروستکرد، زۆر رای لە سیاسەتی ئیخوان نەبوو؟**

- رەنگە.. هەموومان رەخنەمان هەبوو لەوەی ئەو وەستانەی ئیخوان بۆچی؟

**دەڵێن ئیخوان ئەوکاتەی چالاکی خۆی راگرت و خۆی تەجمیدکرد، هەندێک لەسەرکردایەتی ئیخوان گرنگیان بە خەتی نوور داو گەشەیان پێکرد، ئەو (خەتی نوور)ە چی بوو؟**

ئەوە پەنابردن بوو بۆ خۆ رزگارکردن لەو گێچەڵەی بەعس وەک گوتم فشاری دروستکردبوو، رەسائلی نوور هەیە، ئەوەی لە تورکیا

هەیە، ئەو خەتە بریتییە لە هەندێ پەیام، (رەسائل نور)ی پێدەڵێن، هەندێ شتی رووحانی و ئیمانی، زیاتر لە بەغداو کەرکوک و ناوچەکانی خۆشمان بوو، ئەو کتێبانە کەوتە ناو ئەوان، پێی سەرقاڵ دەبوون، شتێکی سیاسی تێدا نییە، وەکو بڵێی کتێبی گەیلانیی و غەزالی، کە زیاتر شتی ئیمانی و تەسەوفییە. زۆریش بە کەڵک بوو، هەمووما‌نیش پێی سەرقاڵ بووین، ئەوە خەت نەبوو، بە مانای خەت، خۆ خەریککردن بوو بۆ قەرەبووی ئەو فەراغەی کە دروست ببوو.

**لە ساڵی چەند چوویە ئێران؟**

- لە کۆتایی ١٩٨١.

**لەو ساڵەوە هیچ چالاکیەکتان لە ئێران نەبوو، وەکو رێکخراوێکی ئیسلامی سیاسی؟**

- بە نیازی ئەوە چووین کە چالاکیمان هەبێ....

**بەڵام لە هەشتاکاندا لە چیا کۆمەڵێک حزبی سیاسی هەبوون...**

- ئاخر ئێمە بڕوامان بەچەک نەبوو، ئێمە جەماعەتی بێ چەک بووین.

**دەڵێن شێخ عوسمان ئەندامێکی باڵای ئیخوان بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو بڕوای بە خەباتی چەکداری هەبوو دژی بەعس، لەناو ئیخوان دەرکرا..**

- نا، مەسەلەکە بەعس نییە، چونکە بەعس لای ئیخوان

مەعلومە، مەسەلەکە ئەوەبوو، ئەو وەختە ئێمە لە ئێران بووین کە ماموستا هاتە ئێران، ساڵی ١٩٨٧ بوو، دەبووایە هاوکاری تەیاری ئیخوانی بکردایە لەوێ، کە ئێمە بووین، ئەویش وای پێ باش بوو کە هاوکاری بۆ ئەو پرۆسەی چەکە بکات، کە پێش ئەو، شێخ محەمەد بەرزنجی هاتبوو، شێخ لەتیف هەبوو، ناویان رابیتەی زانایان، یاشتێکی وابوو، پێش بزووتنەوەی ئیسلامی، کە ماموستا هات بەو ئیعتیارەی کە پیاوێکی ریش سپی ئیخوانیەو بەرێزەو هەمووومان خۆشمان دەوێ، چووینە خزمەتی و پێمان وت واچاکە تۆ بووەستی و ئەو مەلایانە کۆبکەیتەوە، خۆت بگری، چونکە ئەوە پەلامارەو شالاوە دەتبا، ماموستاش قەناعەتی وابوو، بەڵام دوایی دەوروبەر نەیانهێشت، چووە ناو ئەو پرۆسەوە، پرۆسەکەش ئاڵۆزبوو، چەکدارییەک بوو بەجدی، چەکداریش لە وەختی شەڕی عێراق و ئێراندا مانای ئاشکرایە چییە...

**ئەو هەوڵی نەدا ئیخوان بگوازێتەوە ناو ئەو خەباتە چەکداریە؟**

- نا، نەیدەتوانی، گلەیی لە ئێمە دەکرد بۆچی نایەن، ئێمە دەمانوت ئەی تۆ بۆچی چوویت..

**ئەو خۆی بەجێی هێشت، یان ئێوە لاتان دا؟**

- نا ئەو خۆی جیاکردەوە. ئەو بڕوای بە چەک بوو، ئێمەش بڕوامان پێ نەبوو.

**ئەو کاتەی لە ئێران بوویت، مادام چالاکیتان هەبوو، بۆچی**

**بیرتان لەوە نەکردەوە ڕێکخراوێکی کوردستانی دابنێن؟**

- ئەوە نەدەکرا، چونکە ئاوارەکان عەرەبی تیابوو، تورکمانی تیابوو، واتە تایبەتکردنی بە کوردستانەوە زۆر بەمانا نەبوو.

**واتا ئێوە زیاتر پشتتان بە خەڵکی ئاوارە بەستووە، نەک خەڵکی ناو شارەکانی ئێرە؟**

- نا، نا. ئێمە لەوێ ئیشمان دەکرد، ئەوەی کە لێرەش مابووەوە ئیشی خۆی دەکرد.

**ئەگەر بێینە سەر بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٨٧ دامەزرا ؟!**

- نا، بەو ناوە نەبوو، بەناوی بزووتنەوەی ئیسلامی دامەزرا...

**وابزانم لە ١٩٨٨ ناوەکەیان گۆڕی بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی...**

-نا پێشتر، نازانم ١٩٨٤ بوو، یان ١٩٨٥، شێخ محەمەد بەرزنجی و عەبدولرەحمان نەورەسی و مەلا عەلی بیارە، لەگەڵ شێخ لەتیفی بەرزنجی هاتنە ئێران شتێکیان بەو ناوە دروستکرد کە تۆ باستکرد.

**کە بزووتنەوە دامەزرا، هیچ ئاڵوگۆڕیەکی بیروراتان هەبوو؟**

- نا تەنها وەکو پەیوەندی کۆمەڵایەتی و خزمایەتی سەردانی یەکترمان دەکرد..

**ئەی لە رووی سیاسیەوە؟**

-ئەوان رایان لە ئێمە نەبوو، ئێمەش رامان لەوان نەبوو.

**له دوای دروستبوونی حیزبه ئیسلامییه‌کان، ئێوه وه‌کو یه‌کگرتوو زیاتر گرفتتان له‌گه‌ڵ راپه‌رینی ئیسلامیدا هه‌بووه بۆچی ؟!**

– جا باسه‌که له وه‌ڵامه‌کانی پێشوودا پچڕا، مه‌لا سدیق له‌و نێوانه‌دا نه ئه‌وه‌بوو ببێته بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی، نه‌وه‌کو ئێمه بکات. نه ئه‌وه‌ی پێده‌کرا، که هاته ئێران ئیخوانی عێراقی پێیانوت ده‌بێ ئیلتیزام به ئێمه‌وه بکات، گوتی باشه‌و بابزانم و ده‌مه‌وێ بڕۆم و ئه‌وانه، گرنگ نه‌رۆیشته‌وه، به‌ڵام هه‌ر خۆی به‌ده‌سته‌ود نه‌دا، حه‌زی ده‌کرد له‌و نێوانه‌دابێ. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مامۆستا مه‌لا عوسمان برا گه‌وره‌ی بوو، نه‌ده‌کرا، وه‌کو دیکه‌ش قه‌ناعه‌تی به چه‌ک نه‌بوو، وه‌کو بڵێی دڵی له‌گه‌ڵ ئێمه بوو، به‌ڵام بۆی نه‌ده‌کرا. له ئه‌نجامدا دوای ماوه‌یه‌ک یه‌کلایی بووه‌وه، هات و ئیلتیزامی کردو له‌گه‌ڵ ئێمه مایه‌وه.

**له ساڵی چه‌ند؟**

– له ١٩٨٩، هه‌ر خۆی ده‌توانین بڵێین باڵێکی ئیخوان بوو، ناتوانین بڵێین ئیخوان نه‌بوو، به‌ڵام بیروبۆچوونی له‌سه‌ر هه‌ندێک شت جیاوازبوو. له ١٩٨٩ تا١٩٩١ که هاتینه‌وه ئه‌و دوو ساڵه پێکه‌وه‌بووین.

**که گه‌ڕاوه ناو ئێوه له سه‌رکردایه‌تی بوو؟**

– به‌ڵێ له شورابوو.

**ئه‌ی که هاتنه‌وه کوردستان..؟**

- پێش هاتنەوەم بۆ ئێرە لە ساڵی ١٩٩١ تەشكیلاتێكی تۆزێك گشتی كرا، ئێمە دوای كۆچڕەوەكە هاتینەوە، كە خەڵكەكە هەموو هاتبووە ئەوێ و دواتر هاتنەوە ئێرە، كە خەڵكەكە هاتەوە ئێرە، مامۆستا سدیق نەیویست هاوكاری ئێمە بكات.

**گفتوگۆتان هەبوو لەسەر خیلافەكانی؟**

- بەڵێ، دەیوت من خاوەنی گۆڕەپانی عێراقم، هەڵبەت ئەوە لای ئێمە پەسند نەبوو، گوایە من لە ئێران بوومەو ئەو لێرە بووە، چونكە ئەو ١٩٨٧ هاتبووە ئێران، من ١٩٨٢ چووبووم. بە حیساب ساحەكە هی ئەوە، بەڵام واقیعەكە ئاوها نەبوو..

**ئەو كاتە ئەمیندارتان كێ بوو؟**

- لەو دیو من بووم.

**واتە خیلافەكەی زیاتر لەگەڵ تۆ بووە؟**

- بەڵێ بێگومان، لێرە كە هاتینەوە ئیخوانی دیكە هاتنە ناو ئیشەكەوە من بوومە كەسی دووەم، ماوەیەك مامۆستا خەلیل عەبدوڵڵا لە سەرەتای ٩٠-تا٩٢، ماوەیەكیش مامۆستا عومەر ریشاوی ئەمیندار بوو.

**باشە ئەوانە چۆن بوونە ئەمیندار؟**

- بە هەڵبژاردن، ریشسپیانی خۆمان لەناو مەجلیسی شورا هەڵبژاردنمان دەكرد، مامۆستا سدیق نەهاتە ناو ئیشەكەو گوتی ئەوە هەقی منە، هەلەو هەلەوی كرد لەگەڵ هەندێ برای عێراقی و ئەوانە،

نەگەیشتنە ئەنجام، بەپێچەوانەوە ئیلزامیان کرد کە دەبێ بچی لەگەڵ ئەوان بێت، کە ئیلزام کرا ئیتر نەیکرد، لە ١٩٩٣ بزووتنەوەی راپەرینی ئیسلامی دروستکرد.

**دەوری ئێران چی بوو لەو دوورکەوتنەوەی مەلا سدیق و هاتنەوەی؟**

- وا نازانم دەوری بووبێ، ئاگام لەوە نییە، چونکە من بۆ خۆم مەلەفم جیابوو لەگەڵ ئێران، لە ساڵی ١٩٨٩ گرتمیان لە ئێران.

**لەبەرچی گیرای؟**

گوایە بزووتنەوەی ئیخوانیان ئاشکراکردووە، دواتر لە دەرەوە ئیخوان فشاری کردو بەریاندام.

**کە راپەرین جیابووەوە، بۆچی ئێوە لە ئاستی راگەیاندن و کادیرانی خۆتان زیاتر قسەتان لەسەر ئەوان دەکردو ئەوانیش قسەیان لەسەر ئێوە دەکرد؟**

- ئاخر ئەوان وەها حیسابیان دەکرد کە ئێمە بووینە هۆکاری ئەو دوورکەوتنەوەیان.

**ئێوەش تەخسیریتان پێ نەدەکردن...**

- خۆی سروشتی شتەکە وابوو،کردارو پەرچە کردارە، بەڵام بەگشتی ئەوان کە بوونە راپەرین، ئێمە پیرۆزبایمان لێکردن.

**لە ساڵی ١٩٩٢ ئێوە لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی چوونە هەڵبژاردن؟**

- هەر هاوكاری بوو بۆ مەسەلەی هەڵبژاردن، خەمی هەڵبژاردنەكەش ئێمە دەمانخوارد ، خەڵكە پالێوراوەكەش زۆری هی ئێمە بوو.

**بۆچی ئەوكاتە خۆتان ڕێكخراوتان نەبوو؟**

- نا ، ڕێكخراومان ڕانەگەیاندبوو، بەناوی ئیسلامی بێلایەن چووینە ناو هەڵبژاردن.

**ئەو بەشداریكردنە بۆ نەبووە هاندەرێك كە ئێوە لەگەڵ بزووتنەوە ڕێكخراوێكی نوێ پێكەوە دروست بكەن، بەتایبەت بە هەمووتان دەنگێكی باشیشتان لە هەڵبژاردن هێنابوو؟**

- نەدەگەیشتینە ئەنجام، ئێمە تێڕوانینمان بۆ مەسەلە سیاسیەكان، هەتا دەقەكان لەگەڵ تێڕوانینی ئەوان جیاوازبوو. ئێمە پێمان وابوو چەك لە كوردستاندا خزمەت نە بەقەزیەی ئیسلام دەكا، نە بەكێشەی كورد، ئەوە كورد چەكی زۆری هەیەو دەشزانین كەچی بەسەرهات. كە تۆ لە كوردستان چەكی ئیسلامی هەڵدەگری، لە ئیسلامداچەك ئەحكامی هەیە، ئەحكام بەو مانایە چەك بەرامبەر كێ، دواییش قوڵبوونەوەی لۆجیستی دەوێ، چەك خۆ جبەخانە نییە لە كوردستان.

دەبێ یەكێك چەكت بداتێ، دەبێ یەكێك فیشەكت بداتێ. بۆیە ئێمە لە ئەساسەوە لەگەڵ چەك نەبووین، بەلای كەم دەمانوت كاكە ئێوە پێشتر چەكتان لە دژی بەعس هەڵگرتووە، باشە، بەڵام خۆ ئێستا

بەعس نەماوە، ئەوە خۆماڵیە، ئەگەر ئەو چەکە بۆ پاسەوانی بێت مانا دەدا، بەڵام بەغەیری ئەوە مانای نابێ. دوایی ئێمە بەڕاستی لە هەڵبژاردنەکە نیگەران بووین، چونکە هەندێ هەڵەی تێداکرا، بۆ نموونە ئێمە لەگەڵ هەڵبژاردنی مامۆستا مەلا عوسمان نەبووین بۆ رابەری. چووین پێمان گوت مامۆستا ئەوە مەوزوعێکی سیاسییە.ململانێی خەڵکێکە کە ٥٠ ساڵە لە گۆڕەپانەکەدان. جەنابت ئەگەر رابەری تەیاری ئیسلامی بیت، لەوانەیە سولح بکەین و بڵێین ریش سپیمانەو چ قەیدییە، ئاساییە رێککەوین، بەڵام رابەری بزووتنەوەی کوردی، پرۆژەو مەلەفێکە، بە هەموو مانا تۆ نابی بچییە ئەم مەیدانە، گوتمان ئەمە دەبێتە مایەی کەمکردنەوەی دەنگی یەکێک لەسەر حیسابی یەکێکی دیکە. مامۆستا گوتی ئەوە قەناعەتی خۆمە، گوتمان ئاخر ئێمە لە لیستی ئیسلامی شەریکین. هەتا گوتم ئەوە فەرشێکە، سروشتی فەرش وایە یادەبێ هەمووی پێکەوە بفرۆشی، یادەبێ نەیفرۆشی، سروشتی ئەو کارانەش وایە، چونکە پێکەوەیە، لەت ناکرێ، گوتی نا، من دڵم خەبەری داوە، با دەنگی موسڵمانان بەفیرۆ نەڕوا. ئێمە وامان زانی کاریگەری لایەنێکی لەسەرە، چونکە زۆری لەسەر چووین و ئەویش زۆری رەفزکرد. هەڵبەت، مامۆستا پێشتر منی زۆر خۆشدەویست، بەڵام دوایی دڵی لێم هێشا، بەم دواییە من چوومە خزمەتی و ئاشتم کردەوە، زۆریشم خۆشدەویست، هاوڕێی باوکم بوو، گوتم مامۆستا ئەو مەوزوعە یان دەبێ جەنابت

ئیعلان بکەی، کە من لەبەر حاڵەتی تەندروستیم نایکەم، یا بزووتنەوەی ئیسلامی بڵێ ئەو مەوزوعە پەیوەندی بە منەوە هەیە، پەیوەندی بە لیستەوە نییە، چونکە لیستەکە ئیئتلافیە، یادەبێ ئێمە قسەیەک بکەین. گوتی یەکەم و دووەم ناکەم، ئێوە بچن چ دەکەن، بیکەن. ئێمەش هاتین بەیانێکمانداو گوتمان خۆ پاڵاوتنی مامۆستا مەلا عوسمان بۆ رابەری، پەیوەندی بەخۆی و بزووتنەوەوە هەیە، پەیوەندی بەئێمەوە نییەو ئێمەش مولزەم نین بە ئەنجامەکەی.

**نەیانگوت ئێوە کێن؟**

- زانراوبوو، چونکە دیاریان کردبوو لە لیستەکە، نووسرابوو فلان بزووتنەوەی ئیسلامی، فلان ئیسلامی موستەقیل.

**یەکگرتوو لە ١٩٩٤/٢/٦ دامەزراندنی خۆی راگەیاند، ئەوکاتە بزووتنەوە بەهۆی شەڕی لەگەڵ یەکێتیەوە لە وەزعێکی زۆر خراپ دابوو، ئایا راگەیاندنی دامەزراندنی یەکگرتوو لەوکاتەدا بۆ ئەوەبوو کە کادیران و خەڵکی بزووتنەوە بگرێتەخۆ، کە لە وەزعێکی خراپ دابوون، یا هەر بارودۆخێکی دیکە هەبوو کە پێویستی کرد یەکگرتوو دامەزراندنی خۆی رابگەیەنێ؟**

- نا، وەختێ کە یاسای حیزبەکان دەرچوو، ساڵی ١٩٩٣ بوو، ئێمە یەکسەر چووین لەگەڵ وەفدێکی بزووتنەوەی ئیسلامی، ئەو وەختە مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمود بوو، کاک دکتۆر ئیبراهیم و وابزانم مەلا سەلمانیش بوو، ئەو باسەمان کرد، من یەکێکیان بووم،

شەهید فؤاد چەلەبی و لەگەڵ مامۆستا ئەمین پشدەری چووینە سلێمانی و گوتمان ئەوە یاسای حیزبەکان دەرچوو، ئێمە وادەزانین دەبێ بە یاسای حیزبەکان پابەندبین، چونکە ئێمە حیزبمان راگەیاندووە، ئێوە هەن و بارەگاتان هەیە، بەڵام ئێمە وانین، بۆیە هەم پێویستیمان بەو یاسایە هەیە، هەمیش ئەم یاسایە دەتوانێ رێگرمان بێ، دەتوانێ لە رووی یاساییەوە بڵێ بۆچی تۆ بەنهێنی هەیت و خۆت ئاشکرا ناکەی، لەبەر ئەوەش حەزمان لێیە یاسایی بژین، دەچین بەدەم ئەم یاسایەوە، هەڵبەت ئەوان زۆر سەریان سورماو زۆربشیان پێ ناخۆش بوو، گوتیان چۆن دەبێ بۆ یاسای عەلمانی بچی و بڵێی مۆڵەتم بدەیێ تا هەبم، گوتمان وەڵڵا ئێمە وا دەزانین دەبێ پابەندبین بەو یاسایە، رەنگە ئێوە پێویستتان نەبێ، بەو ئیعتبارەی پێشتر هەبوونە، بەڵام ئێمە پێویستمانە. ئەوە مانگی نۆی ساڵی ١٩٩٣بوو، دوایی ئەوەبوو مانگی دوازدەی ١٩٩٣ ئێمە خۆمان ئامادە دەکردو کۆنفرانسمان دەبەست بۆ دروستکردنی حیزب، بینیمان شەڕی نێوان بزووتنەوەو یەکێتی روویدا، ئەوە ئێمەی ئیحراج کرد، ئێمە بەنیازبووین زوو دروستکردنی حیزبەکە رابگەیەنین، لەبەر ئەو شەڕە وەستاین، رۆژی ١٩٩٤/٢/٧ کۆتایی ئەو ماوەیەبوو کە تەرخانکرابوو، بۆ تەقدیمی ئەوراقی ئەحزاب، رووداوەکان قەومان و ئەوەبوو مامۆستا مەلا عوسمانیان هێنایە مەسیف، من لەگەڵ چەند مامۆستایەک چووینە خزمەتیان بۆ پرسەیان کە کوڕی شەهید ببوو، لەوێ لەبەر مەوقیفەکە

لەگەڵ خۆی قسەم نەکرد، لەگەڵ مامۆستا شێخ محەمەد قسەم کرد، ئەوە ٢-١٩٩٤/٢/٣ بوو، گوتم مامۆستا دەزانی ئێمە خۆمان ئامادەکردووە بۆ راگەیاندنی حیزب، ئەوەش دەزانی کە ماوەکەی تەواو دەبێ، بەراستی ئێستا ئێمە ئیحراجین نازانین چ بکەین، پێشمان خۆش نییە لەوکاتەدا رایبگەیەنین، بەڵام ناشزانین چی بکەین، هاتووین بزانین رای جەنابتان چییەو پێمان خۆشە راوێژتان پێ بکەین، مامۆستا شێخ محەمەد گوتی زۆر ئاساییە ئێمەش هەر دەبێ داوای مۆڵەت بکەین و زۆر باشە و پیرۆزە.

ئیتر ئێمە ئەوراق و شتمان ئامادەکردو رۆژی ١٩٩٤/٢/٥ تەقدیمان کردو (٦)ی مانگ یەکگرتوومان راگەیاند. مەبەستمە بڵێم کاتەکە هیچ پەیوەندی بە قۆستنەوەی ئەو شەڕە نەبوو، ئێستاش خەڵکی بزووتنەوە کەم دێنە لای ئێمە، راستە نزیکیەک لە نێوان رادەی راگەیاندنی حیزب و شەڕی بزووتنەوەو یەکێتی هەیە، بەڵام ئامانجەکە قۆستنەوەی دەرفەت نەبووە.

**ئێوە پێش ئەوەی داوای مۆڵەتی دامەزراندنی حیزب بکەن، ڕێککەوتنێکی مەبدەئیتان کردبوو لەگەڵ نیخوانی عێراق؟**

- بەڵێ، ئاگادارمان کردبوون.

**رەنگە هەر لەسەر پێشنیاری ئەوان بووبێ؟**

- نا،نا.. پێشنیاری ئێمە بوو، چونکە حاڵی ئێمە وەکو فیدراڵیەکەی خۆمان وابووە. ئێمە پێمانگوتبوون و ئەوانیش

پیرۆزباییان لێکردبووین.

**ئێوە تائێستا خۆتان بە درێژەپێدەری ئیخوان دەزانن؟**

- ئێمە تایبەتمەندی کوردستانیانەی خۆمان پاراستووە، پرۆژەیەکی سیاسیمان هەیە، بەڵام لەرووی پەروەردەیی و هەندێ مەسەلەی فیکری زۆرشتمان لەگەڵ ئیخوان ماوە.

**ئێستا ئێوە رێنمایی و تەوجیهات لە مەکتەبی ئیرشادی ئیخوانی میسر یا هی عێراق وەردەگرن؟**

- نا، پەیوەندیمان هەیەو بەخزمەتیان دەگەین و نێوانمان خۆشە، چونکە ئەوانیش دەرکیان بەوە کردووە کە وەزعی کوردستان جیاوازە، ئێمەش وەک لایەنێک بەو هەموو گۆڕانکارییە بەتەمانین وەکو دەروێشێک مامەڵە بکەین، ئێمە تایبەتمەندی کوردستانیی خۆمان هەیەو پرۆژەی سیاسیمان هەیە، تایبەتمەندی پرۆژەی سیاسیش ئەوەیە کە پەیوەندی بەو ناوچەیەوە بێ و کێشەی ئەو ناوچەیە تەبەنی بکات. لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین یەکگرتوو کیانێکی ترە، سوودی لە خەتی نوورو شتی دیکە بینیوە، سودی زۆربشی لە ئیخوان بینیوە، لەگەڵ پاراستنی نێوانخۆشمان لەگەڵ ئیخوان، هەڵبەت ئەوە شتێکی ئاسان نییە.

**حیزبی ئیسلامی عێراقی کە نوێنەری ئیخوانە لە عێراق بەشداری هەڵبژاردنی ئەم دواییەی نەکرد، ئێوە کردتان، ئەوە گرفتی لە نێوانتان دروست نەکرد؟**

- نا ئەوان لەوەشدا بەویژدانن، دەزانن تایبەتمەندی خۆمان هەیەو خۆمان سەربەستین لە بڕیارداندا، بەڵام هەڵبەت وەکو دۆستایەتی روونکردنەوە دەدەین بۆیان، لە کۆنگرە ئیسلامییەکانی دیکە بەشداری دەکەین و پرسیارمان لێدەکرێ، لە ناوەندە ئیسلامییەکاندا لەگەڵ هەمووان نێوانمان خۆشە.

**خۆ وەک حیزبی شیوعی کوردستان و عێراق نین، مامۆستا کەریم ئەحمەد تا سکرتێری حیزبی شیوعی کوردستان بوو، ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عێراقیش بوو.**

- نا ،نا.. ئێمە هەموو شتمان جیاوازە.

**لەسەردەمی شەڕی ناوخۆ زۆرباس دەکرا کە یەکگرتوو لەلایەن وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە پشتیوانیەکی زۆری لێدەکرێ، بەتایبەتی سعوودیەو ئێران و...بەناوی ئەوەی کە شەڕێکی بێ ئامان لە نێوان ئەو دوو حیزبە هەیە، خەڵکی هەژار زۆرن، ئێوە ئەو یارمەتیانەتان وەردەگرت، بەڵام ئەو یارمەتیانە زیاتر بۆ حیزب و کادیرانی خۆتان بەکاردەهێنا، چەند جارێکیش لە رۆژنامەی (رۆژنامەنووس) بە ژمارە بڵاویان کردووەتەوە، ئەوکات هیچ وەڵامێکتان نەبوو؟**

- نازانم، من ئەو ئەرقام و ژمارانەم لەبیر نییە، بەڵام (رۆژنامەنووس) مەلەفێکی پڕ لە شەڕەنگێزی هەیە لەگەڵ ئێمە، باواز لەوان بێنین، بەڵام ئێمە لە (١٩٨٨)ەوە کارمان لەسەر فریاگوزاری

کرد، بۆ ئۆردوگاکانی ئێران و ئاوارەکان، دوایش کە دوای کیمیا بارانی هەڵەبجە کۆنگرەیەکمان لە تورکیا کرد کە ئیخوانی عەرەب و کوردی پارچەکانی دیکەش بەشداربوون، کۆمەڵەیەک دروستبوو بەناوی رابیتەی ئیسلامی کورد، کە ئێستاش ئەو رابیتە ماوەو دکتۆر عەلی قەرەداغی بووە سەرۆکی رابیتەکە. ئەمە ئیشوکاری ئەوەبوو تەوعیە بکات لە مەسەلەی ئیسلامی کوردی، هەروەها کاری ئەوەبوو کۆمەک پەیدا بکات بۆ ئاوەدانکردنەوەو بۆ هەتیوو هەژاران، لە ساڵی ١٩٩١ کە هاتینەوە تاوەکو ١٩٩٤ تا ئەوکاتەی بڕیاری ٩٨٦ جێبەجێکرا، خەڵکەکە لە دۆخێکی خراپ دابوو، ئێمەش سوپاس بۆ خوا شەرەفی ئەوەمان هەبوو کە هاوکاری خەڵک بکەین، مزگەوتەکان شایەدن، خۆ کوردستان پڕە لە مزگەوتی ئەو رێکخراوانە.

**دەڵێن هاوکارییەکە زیاتر بووە لەوەی کە خەرج دەکرا؟**

- نا، ئەوە درۆیەکی تەواوە وەرە ئیسپاتی بکە، تۆ درۆی خەڵک دەگێڕیتەوە، من دەڵێم درۆیە، چونکە هاوکارییەکە بە ئەرقام هەیەو ژمێریار هەیەو دەزگای مەسئول دەتوانێ بچێ، رابیتە بانگ بکاو بڵێ چەندت وەرگرتووەو چەندت خەرج کردووە، یا (أغاثە) بانگ بکا. ئێمە توانیومانە بچین دڵی ئەو خەڵکە نەرم بکەین و لە وەختێکی هەستیار کۆمەک بەو خەڵکە بکەین، خۆ ئێستا ئەو کۆمەکە نەماوە، لە وەختی نەبوونی و داماویدا ١٦-١٧ هەزار هەتیوی ئەو کوردستانە، هەمووی هەر مەرج نییە باوکی مردبێ، لەوانەیە

کوژرابێ، لەوانەشە خۆمان وەک کورد کوشتبمان و شەهیدی دەستی براکوژی بێ، بەخێوکراون، ئەو هەموو ئاواکارییە کراوە لە مزگەوت و قوتابخانەکاندا، ئەوانە دەسکەوتی باشن و زەخیرەیەکی باشیشن لەرووی ئەجری قیامەتیەوەو لەرووی فەخری دنیایشەوە، ئەوەی کە زیاتر بووبێ و خۆمان خواردبێتمان، ئەوە دەعوایەکەو ئیسپاتی دەوێ.

**ئەوکاتەی لە مزگەوتەکان ئەودوو حیزبە دەستەلاتدارە داوایان دەکرد نابێ مزگەوت بۆ کاری سیاسی بەکار بهێنرێ، دەریش کەوت هەندێ گرووپی بچووک و هەندێ خەڵک لەسەر ئاستی تاک بێ، یان گرووپ، هەوڵیاندەدا بەهۆی ئەو مزگەوتانەوە هەندێک کار بکەن، ئەوکاتە لەلایەن حیزبە ئیسلامییەکانەوە زۆرجار شتی وا بلاودەکرانەوە کە مزگەوت بۆ عیبادەتی خوایەو حزبەکان نابێ بەو شێوەیە لە مزگەوت بترسن، یا مزگەوت بە شوێنێکی خراپ لە قەڵەم بدەن، ئایا ئێوە بەتایبەتی دوای دەستگیرکردنی باندی شێخ زاناو ئەوانیتر، نەگەیشتنە قەناعەت کە خەڵکانێک مزگەوت بەکاردێنێ، بۆ کارێکی سیاسی، یا کارێکی خراپ کە خواش ئەوکردەوانەی پێ ناخۆشە؟**

- خۆی تێکەڵکردنێک هەیە، ئەو تاوانانەی روویانداوە ئیستغلالێکی سیاسی، حیزبی دەکرێ، ئێمە هەمیشە لەگەڵ ئەوەبووینە کە مزگەوت بۆ نوێژو عیبادەتەو بۆ قورئانە، بۆ شتی

ئیسلامییە، ئاخر ئیسلام فراوانە، خۆ وەک مەسیحی نییە هەر باسی ئەوەبێ یەکشەمە چی بکەین ئیسلام فراوانەو باسی ژیانی تێدایە، منداڵ کە لە دایک دەبێ، تا دەمرێ باسی دەکات، رەهەندی سیاسیشی تێدایە، ئێمە رامان وابووەو واشمانکردووە، مزگەوت نابێ بۆ مەسەلە سیاسیەکانی هەتا ئیسلام بەکار بهێنرێ، ئەوە بارەگا هەیەو دەزگای دیکە زۆرە، ئەوە قەناعەتی ئێمەیە وەکو یەکگرتوو، بەڵام جاری وابووە وەکو جبەخانەیەکی چەک بەکارهێنراوە. لە زەمانی پێشمەرگەو لە زەمانی زوو، لە زەمانی تازەش، بۆ ئیسلامی، یا غەیری ئیسلامی بەکارهێنراوە، ئەوە بەکارهێنانێکی هەڵەیە، یا برادەرێکی دەستەڵاتدار لەبەر ئەوەی خۆی چۆنی بوێ، ئاوا دەکا، دەڵێ ئەو مەلایە دەبێ باسی سیاسەت نەکات، بەڵام قەیناکە باسی من بکات و بخوێنێ بە باڵای دەستەڵاتداو باسی حیزبی دەستەڵات بکات، واتە باسی سیاسەتی مەمنوع لای ئەو باسی شتەکانی ئیسلامیە سیاسییەکانە، واتە مەمنوعە مزگەوت باسی سیاسەتی ئیسلامی بکات، نەک سیاسەتی ئەو.

**سیاسەتی ئیسلامی بەگشتی نا، رەنگە کە لێکی دەکەینەوە ئەو ئیسلامە سیاسیە لق و پۆپی زۆر لێ دەکەوێتەوە ئەو لق و پۆپانە رەنگە هەندێ جاران لە بەرژەوەندی دۆخەکەی ئێرەش نەبێ.**

– ئێمە لەگەڵ ئەوەین کە مینبەرو میحراب دەبێ بە پیرۆزی خۆی

بهێنیتەوە، باسی هیچ حیزب و هیچ سیاسەتێکی تێدا نەبێ، ئێمە ڕێنماییمان بۆ مامۆستاو مەلاکانی خۆمان ئەوەبوو کە میحراب و مینبەری مزگەوت، لەلایەکەوە هی ئیسلامەو هی خوایە، لەلایەکی دیکەوە هی هەموو میللەتە بە هەموو توێژو حیزب و لایەنێک، لەبەر ئەوە نابێ ئێوە، میحراب و مینبەر حیزبی بکەن و بیکەنە یەکگرتوو هەر وەکو نابێ بیکەنە پارتی و یەکێتی.

**بەس هەندێ جار مامۆستایانی یەکگرتوو کردوویانە؟**

- ئیتر ئەگەر کردبێتیان سەرپێچیە وەک هەر سەرپێچییەکی دیکە، لەسەر ئەوە سزاش دراون، بەڵام ئەگەر ئەو شتانە بکرێتە هەل بۆ شەڕکردن لەگەڵ مزگەوت، مزگەوت دابخرێ، یا قورئان خوێندن تێیدا قەدەغە بێ، قەدەغە بێ ئیسلامی رووی تێ بکاو ئەگەر رووی تێ کرد، هەر نەفەرەو ئاسایشێکی بەدواوەبێ، ئەوە شتێکی سەخیف و نزمە. شێوازێکی نزمە، چونکە تۆ نوێژ ناکەی، کاکە من نوێژ دەکەم، تۆ ناچیتە مزگەوت، قورئان ناخوێنی، من دەخوێنم، دەتۆش بچۆ کێ تۆی قەدەغەکردووە.

- **بەڵام پێت وانەبێ لەسەر نوێژکردن وایان لێ هاتبێ؟**

- قەیدیناکە، ئیستغلال دەکەن، سەرنج بدە لە هەندێ شوێن دەچن چاودێری ماڵان دەکەن، ناهێڵن لە مزگەوت قورئان بخوێنن، دەچن لە ماڵانیش چاودێری دەکەن، ئەوەچییە ئەو منداڵانە چی بوون هاتن، بۆچی دەخوێنن...

**رەنگە چاودێری ئەوانە بکەن کە جێی گومان بن؟**

- ئاخر چی جێی گومان بن!؟ کاکە تۆ مەسەلەی زانا دەگشتێنی بەسەر هەموو مەسەلەکان؟ ١٤ سەدەیە خەڵک قورئان دەخوێنێ، زانا کە قورئانی دەخوێند واینەدەکرد، کاکە ئەوە بووە پیاوی خەڵک وایکرد.

**بەڵام زانا کە ناوی لە خۆی نابوو شێخ زەنگێکی مەترسیدار نییە بۆ ئیسلامیەکانیش، کە منالێک هاتووچۆی مزگەوت بکات، ئیستتغلالی بکەن؟**

- نا.. ئینجا بۆ؟ هاتووچۆی سینەما دەکرێ، ئیستغلال دەکرێ، هاتووچۆی بازاڕ دەکرێ، ئیستغلال دەکرێ، ئیستغلال دووبارە دەبێتەوە، لە سلێمانی لە قوتابخانەکان فەزایح دەرکەوت.

**بەڵام ئیستغلالی تیرۆر لە هەمووان مەترسیدارترە؟**

- ئەوەی کە من دەیڵێم ئیستغلالی تیرۆر بۆ مەسەلە حیزبی و سیاسییەکان ئەوە تاوانێکی ترە، تۆ ئەگەر کێشەت لەگەڵ من وەکو لایەنێکی سیاسی هەیە کە ململانێت دەکەم و ئازاریی ڕۆحت دەدەم، دەبێ بە ئالیاتی خۆت شەڕەکەم لەگەڵ بکەی، نەک بە دژایەتی دین و قیەمی ئەو میللەتە، ئینجا بۆ هەموو کەس گومان بکەین لە یەکتری.

**باشە پێتوایە چ بکرێ لە کاتێکدا ئەوە دیاردەیەکە؟**

- حالەتێکە، دیاردەی چی! یەک حالەتە، زانایەک ٢٠ ساڵە بەخێوی دەکەن، لێیان هەڵگەڕایەوە.

**ڕەنگە حاڵەتی دیکەش هەبێ؟**

- هیچ.. هەر ئەوەیە.. تاوانی کرد، خیانەتی لە دین کرد، لە خێزان و بنەماڵەی خۆی کرد، خۆ بنەماڵەیەکی بەڕێزیان هەیە، خیانەتی لە پارتی کرد، لە ئیسلامی کرد..

**ئێوە وەک یەکگرتوو لەوکاتەی کە کوردستان بووە دوو هەرێم، ئێوە بەشداریتان لە حکومەتی ئێرەدا کرد، بەڵام بەشداریتان لە حکومەتی سلێمانی نەکرد. ئایا ئەوە لەژێر گوشاردابوو کە بەشداری لێرە بکەن و لەوێ نەکەن، یاخود ئایا ئەوان گوشاریان بۆ سەر نەهێنان کە بۆچی لە هەولێر بەشداری دەکەن، لە سلێمانی بەشدار نابن، هەڵوێستی وڵاتانی ئیسلامی چیبوو لەو مەسەلەیەدا؟**

- سەرەتا دەبێ مێژووی بەشدارییەکانمان لەبیر بێ، کە ٣١ ئاب ڕوویدا ئێمە لە هەولێر بووین، هەڵبەت کە گوتیان ئەوا دەبابە پەیدابوو، زۆرمان پێ سەیربوو، چونکە چاوەڕوانمان نەدەکرد، ئەوکات یەکێتی لێرەبوو، نەشمان بیستبوو، برادەرانی حیزبی شیوعی شتێکیان بیستبوو، نازانم ئێمە تەلەفۆنمان بۆیان کردبوو، یان ئەوان، بەڵام شەوەکەی پێشتر گوتبوویان جەیش دێت، ئێمە پێمان سەیربوو، لە بەرائەتی خۆمان تەسەورمان نەدەکرد شتی واڕووبدات، پێش ئێمە لەگەڵ پارتی ساردیمان هەبوو، لەسەر داخستنی بارەگامان لە ئاکرێ و دوایی لە دهۆک ئێستگەکەمانیان داخست و هەندێ ئیجرائاتی دیکەیان کرد، تازە بەتازە خەریک بوو ئاشتیەک لە

نێوانماندا دروستبێ، ئەو ڕووداوانە هاتنە پێش. ئیتر کە جەیش هات مەترسیمان هەبوو، بەڵام باش بوو گوتیان هێزەکان پەڕۆی زەردیان هەڵداوە، هەرچەندە لەگەڵ پارتیش بەینمان خۆش نەبوو، بەڵام هەر باشتر بوو. ترساین و خۆمان کەناردا و بە ئۆتۆمبێلێکی مەخفی چووینە شەقڵاوەو دانیشین، چەند ڕۆژێکی پێچوو، هەڵبەت مەعلوم بوو کە مەسەلەکە چییە؟ بیستمان کە فوئاد مەعسوم لێرەیەو فلان لێرەیە... زۆربان گیرابوون و بان خۆیان تەسلیم کردبوو، یان پەرلەمانتارەکانیان لەوێ بوون، بیستمان وا ماوەی پەرلەمان درێژ دەکەنەوە، پێمان شتێکی باش بوو، مادام بیریان لای پەرلەمان مابێ، دوای چەند ڕۆژێکی دیکە خەبەریان ناردبوو بێن، ئێمە لە شەقڵاوە بووین، یەک دوانێکمان چووین، دکتۆر ڕۆژیان بینی بوو، گوتبووی دەمانەوێ حکومەت دروست بکەین، برادەرانیش گوتوویان پیرۆزە (هەڵبەت دەزانن کوردستان تاسەر سنوور بووە پارتی، برادەران هەر لە خۆیانەوە ترسابوون) بەڵام ئێوە لەو حکومەتەدا چیتان بەرناکەوێ، برادەرانی ئێمەش گوتبوویان گرنگ ئەوەیە ئیدارەیەک هەبێ و ناوچەکە بەبێ نیزام نەمێنێتەوە، هەر ئەوە لای ئێمە مەبەستە.. دوای ئەوە کە زانیبویان دیارە ئەوانە عالەمێکی سەیرن و داوا ناکەن و لەسەر شت ناچن، تەلەفۆنیان کردو گوتیان دەبێ بێن و بەشدار بن. نابێ بەشدار نەبن، چونکە ئەوە دەبێتە هەڵوێست.. بەرژەوەندی خۆتان لەوەدایە بەشداربن. ئێمەش گوتمان باشە، بەشداربووین و ئەگەر بیرتان بێت،

چووین لە پەرلەمان وتارمان داو بە حیسابی خۆمان قسەی باشمانکرد ، چونکە قەناعەتمان وابوو کە ئەوە شتێکی لەتە ، پەرلەمانێکی تەواونییە ، نیوەی کورسییەکانی چۆڵە ، گوتم ئەو کورسیانە خاوەنیان هەیەو کەس پێی خەلآت نەکردوون، لەگەڵ ئەوەش تەقدیرم کرد بۆ ئەو عەقلەی کە ئەو مەوزوعەی بەو شێوەیە چەرخان کە پەرلەمانێک ببێ و حکومەت ببێ، بەدەر لەوەی چۆن بووە ، چونکە ئێمە چی بکەین ، هەر دەبێ رازی بین بە ئەمری واقیع ، بەراستیش ئەو عەقلە جێی تەقدیر بوو ، ئیتر کە جەماعەتی یەکێتی گوێیان لە وتارەکەی من ببوو ، بیستمان گوتبوویان ئەوەچییە ، ئەو کابرایە دەروێشی دەکا ، لە سیاسی ناچێ، چونکە ئەوکات تاسنوور هەمووی زەردبوو ، مەنتقی نەبوو تۆ شتێکی دیکە بڵێین بە راستی قسەکەرەکانی دیکەش هیچ شتێکی لەو بابەتەیان نەگوت، بەپێچەوانەوە دەیانگوت ئەوە شتێکی باشەو مەسەلەکە یەکلابووەوە ، مام جەلال و ئەوان تەقدیری ئەو هەڵوێستییان کردبوو ، دواتر ئەوان درەنگ حکومەتیان دروستکرد ، داوەتیان کردین ، وەفدێک چووین بۆ لایان ، ئێمە پێشتر دیراسەمان کرد ، بەڕاستی قەناعەتمان نەبوو بەشداری لە دوو حکومەتدا بکەین ، هەر بڕیاری دوو حکومەتەکەمان پێ قورس بوو ، لەلایەکی دیکەش حکومەت بە رەسمیەکەی و بە سەرەکیەکەی دیارە لە هەولێرە ، ئەوەی ئەوان ئیدارەیەک بوو ، بۆ بارودۆخێکی تایبەت دروستبوو ، ئێمەش ئیزنمان لێ وەرگرتن و گوتمان ئەو دوو لەتیەمان پێ خۆش نییە .

**ئەوان پێیان ناخۆش نەبوو؟**

- هەڵبەت پێیان خۆش نەبوو، بەڵام زۆریش پێیان ناخۆش نەبوو، چونکە تەقدیریان کرد کە ئێمە بێ فێڵین و واتە ئەگەر ئیستغلالی و دووڕووبین، دەڵێن لێرەش دەخۆین و لەوێش دەخۆین. بەڵام بەڕاستی دەرکیان کرد کە نیەتمان باشە، گوتمان ئەوەی کە لێرە کراوە لایەنگیری نییە بۆ پارتی، لە بارودۆخێکی تایبەتداو بۆ پشتگیری لە یەکخستنەوەی هەرێم کردوومانە، هەمیشە ئەو دەنگە بووین لە ئەنجوومەنی وەزیران لە هەولێر.

**لە ساڵی ١٩٩٦ نامیلکەیەکت نووسیوە بەناوی ٤٠ ئامۆژگاری بۆ خوشکان دەربارەی رەفتار لەگەڵ هاوسەرەکانیان، لەوێ هەندێک شتت وتووە بەرامبەر ئازادی ئافرەت، بۆ نموونە دەڵێی رەخنە لە مێردەکەت مەگرە، گوێڕایەڵی بە، یان دەڵێیت نوێژو رۆژوو بەبێ هاوسەر جائیز نییە...**

- مەبەستم نوێژو رۆژووی سونەتە.

**یان دەڵێی سەنگی مەحەکی هەمووشت دڵی مێردەکەت بێ، من ئەوانە دەخوێنمەوە پێم سەیرە !!**

- ئەوە هەر تۆنیت، ماوەیەک جەماعەتی (رۆژنامەنووس)رسقیان کەوتبووە سەر ئەوە، منیش گوتم کاکە ئەوانە لە رسق دەگەڕێن، دەزانم تۆ لەو باسەوە نارۆیی، بەڵام بەبرادەرانم گوت واز لە جەماعەتی (رۆژنامەنووس) بێنن، ئەمانە بۆ رسق دەگەڕێن، زاهیرەن دژایەتی من

و باسکردنی من ئێستا رسقه، لێیانگەڕێن با بەهۆی ئەوەوە دوونان بخۆن، بەڕاستی سروشتییە رەخنە لەمن بگیرێ، بەڵام بەنسبەت ئەوەی باسکرد، ئەوە کراوەتە عەرەبی و لە دەوڵەتانی عەرەبیش بڵاوبووەتەوە. ئەوە موحازەراتە تایبەت بۆ خوشکان قسەم کردووە، بۆ برایانیش قسەم کردووە، ئەی تۆ بۆ باسی براکان ناکەیت، ئەویش نامیلکەیە، ئینجا قسەم کردووە بۆ کوڕە گەنجە بێ هاوسەرەکان و کچە گەنجە بێ هاوسەرەکان، چوار نامەیە، ئەم برادەرانە لەبەر ئەوەی رسقەکەیان لێرە باش بوو، چوون ئەوەیان بڵاوکردەوە من کە گوتوومە رەخنە لە مێردەکەت مەگرە، مەبەستم ئەو ئافرەتانەیە کە هەمیشە رەخنە چییەو موزعیجن باسم لەوان بووە، بەڵام رەنگە تەعبیرم بۆ نەهاتبێ، دوایی ئەو قسانەم لە هەشتاکان کردووە، نەک ١٩٩٦ بەس لە ١٩٩٦، چاپکراوە، ئینجا لە موحازەراتی خوشکانی خۆمان قسەم کردووە، نەک بۆ ددرەوە، کە نووسرایەوەش و بڵاوکراوە، داڕشتنەکەی کۆنەو تازە نییە، ئەگەرنا تۆزێ دیقەتم دەکرد کە ئەوەکو یەکێ بە هەڵە تێبگات، مەسەلەی نوێژو رۆژووی سوونەت، ئەوە حەدیسی لەسەرە، بۆ نموونە ژنێک دەڵێ بەیانی دەمەوێ بە رۆژووبم، لەوانەیە پیاوەکە پێویستی بێت تیشی جنسی لەگەڵ بکا، ئەویش دەڵێ نەخێر من بە رۆژوو دەبم، لەو حاڵەتە ئەو رۆژووەی خراپە، لە جیاتی خێری بگات، چونکە پیاوەکەی ئیحراج دەکات، لەوانەیە تووشی بەڵایەک ببێ. یان دەبینێ پیاوەکە دەیەوێ ژنەکەی لەگەڵ بخەوێ، ئەو دەڵێ دەچم شەو

نوێژ دەکەم، مەبەستم نوێژی سونەتە.. ئینجا لەو بابەتە.. من چونکە کوڕە مەلا بوومە، ماڵە مەلاش هەمیشە کێشەکانی تەڵاق و نیکاح و شەرع و دێتە لایان، منیش هەر لەوێ بووم وشتم نووسیوە، زۆر شارەزایم هەیە لە کێشەکانی ژن و مێرد، زۆربەی کێشەکانی ژن و مێرد لە بێ سەلیقەیی و لێکحالینەبوونی نێوانیان روو دەدات، نێوانیان تێک دەچێ، کە تێکچوو کێشە دروست دەبێ. راشم وایە بونیادی خێزانی ئەگەر تەواو نەبێ و وەزعی خێزانی باش نەبێ، ژیان نارەحەتە، لەبەر ئەوە ئەمە تەوسیاتی برایانە کە دەمانەوێ خێزان بەختیاربێ، نەک ئیلتیزاماتی حیزبی.

**ئێوە وەکو حیزبێکی ئیسلامی سیاسی، کە لەسەر رێنماییەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەڕۆن، پێغەمبەر رۆژێک لە رۆژان ئامادەنەبوو ناوی حیزبێک لەخۆی بنێ، زیاتر مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینەکە بوو، ئەویش لەناو خەڵکی کافر، نەک موسڵمان. خەڵکی موسڵمان چ پێویستی بەوە نیمە تۆ ئاینی بۆ بڵاوبکەیتەوە، کەچی ئێوە سیاسەت دەکەن، زۆرجار دەڵێم باشە ئەو بزوتنەوە ئیسلامیانە هەمووی لەناو وڵاتە عەرەبیەکانن، کە هەمووی موسڵمانن، بۆ لە ئەوروپاو ئەو وڵاتانە نیمە کە ئیسلام نین، بۆ ئەوەی ئیسلام لەو شوێنانە بڵاوبێتەوە؟**

- جارێ دەبێ ئەوە بڵێین کە پەیامی پێغەمبەر عەقیدەی تێدایەو ئەحکامی تێدایە، ئەحکامی ژیان بەگشتی تا دەگاتە دەوڵەت،

دەوڵەتداری هەیە، قـەزاوەت هەیە، چۆن مـامـەڵە لەگـەڵ ئابووری و کۆمەڵایەتی و شتـەکانی دیکە دەکەی هەموو شتـەکان لە قـورئان و حەدیسدا هەیە، واتە ئیسلام دینێکە ١٣ سەدە حکومەتیان بووە، جا هەڵەو سـەلبـیـاتـیـان بـووە شـتـێکی دیکەیە، بەڵام مـوسـڵـمـانان حوکمدارییان کردووە لەسەر مەنهەجی شەریعەت.

**ئەمە دوای پێغەمبەر!**

نا، وەخـتـی ئەویش.. ئێ خـۆ قـسـەی ئەوو کـردەوەی لەگـەڵ دەقەکانی قورئان سەرچاوەی شەریعەتە.

**بەڵام ناتوانی بڵێی دەوڵەتێکی هەبوو...**

- ئەی بۆچی دەوڵەت نییە، ئەی چی بوو؟

**لەبەر ئەوەی ئەحکامەکان بەپێی پێویست نەبوو... کە هەموو ئایەتەکان تەماشا دەکەی، ئەوانەی کە بەشی شێریان وەرگرتووە ئەحکام نینە؟**

**- نا، ئاخـر ئەحکام ژمـارەیەکی کـەمـە، بەڵام حـەدیس و هەڵسوکەوتی خۆی ئەوە هەمووی بەشێکە لە شەریعەت، ئینجا چۆن قـەزاوەتی کـردووە لە قـەزیەیەک، چۆن مـامـەڵەی لەگـەڵ مـەسـەلە ژیارییەکان کردووە هەمووی شەریعەتە، شەریعەت دووبەشی هەیە، بەشێکی سەوابتە کە دەقەکانە، بەشێکی گۆڕاوەکانە، گۆڕاوەکان ئەو بوارەیە کە عەقڵ تێیدا کار دەکات، هەمیشە بەشی گۆڕانکارییەکان لە ٨٥-٩٠٪ی شـەریعـەتە، واتا دەقـێک ٣٠٠ سـاڵ لەمـەوپێش**

بەشێوەیەک تێگەیشتوون، تۆ دەکرێ بەشێوەیەکی دیکە تێی بگەی، لەرووی ئەو گۆڕانکارییە زانستی و کات و شوێنانە. لەبەر ئەوە مەرج نییە هەرچی لە زەمانی پێغەمبەربووبێ لە هەموو شتەکاندا، ئێستا تۆ بێی وابکەی، ئەگەر وابێ ئەم دینە.

ئەوە نەتەوەو گەلانی دیکەو شوێنانی تر، مادام دینەکە دەمێنێ، کوێ دەمێنێ؟ سەوابتەکەی دەمێنێ، ئەو دەقانەی کە باسی عەقیدەیە، لەگەڵ عیبادات کە سەوابتن ئەویدیکە کە پێی دەڵێن موعامەلات کە ٨٥٪ی شەریعەتە، ئەوانە هەموو دەگۆڕێن و عەقڵ و زانست تێیاندا کاردەکەن و پێشکەوتن و تێگەیشتنی خەڵک کاریگەری بەسەریانەوە هەیە. ئینجا ئێمە بڵێین لایەنێکی سیاسین بە مەرجەعیەتی ئیسلامی کاردەکەین، تۆ گلەییت هەیە بۆچی لەناو موسڵمانان هەیت، ئێ خۆ من نەمگوتووە کاکە تۆ وەرە موسڵمان بە، تاتۆ بڵێی بۆچی موسڵمانم دەکەی، من لەوانەیە قسەم بێ لەسەر تۆ، لەسەر خۆم، کە چۆن ئەدائی شتەکان بکەین.

**ئامانجی سەرەکیتان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکە نییە؟ ئەگەر بۆ سیاسەتە بۆ ناوەکەی ئیسلامیە؟**

- ئێستا مەلای مزگەوت ئیشی چییە هەموو هەینیەک وتار دەدا، بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین نییە؟

**ئەو وەعزدەدا...**

- ئێ هەمان قسەیە، تۆ دەڵێی ئەو خەڵکە موسڵمانە ئیشی

چییه، مرۆڤ شتی بیردەچێتەوە، بیرخستنەوەی دەوێ. ئەوە ئامۆژگارییە، کاری سیاسی بێگومان دەچێتە ناو مەسەلە قانونی و ژیانییەکانی دیکە، تێڕوانینی ئیسلامی لە هەموو ژیان هەیە، قسەی تێداکراوە. ئێمە دەڵێین ئێمە حزبێکی سیاسین بەمەرجەعیەتێکی ئیسلامی، واتە لە شەریعەت دەگەڕێین چی بۆ ئەو میللەتە باشبێ، واتا خزمەتە، کابرا دەچێ بە فەلسەفەیەکی مارکسی خزمەتی میللەتی خۆی دەکا...

**بەڵام مارکسیەت ئامانجی گرتنە دەستی دەسەڵاتە..**

- هەڵبەت ئێمەش پێویستمان بە دەسەڵاتە چ عەیبی هەیە!؟

**ئاخر لێرە دژیەکە (تناقض) خوا بە محەمەد دەڵێ (انا ارسلناک الا رحمه للعالمین) یان (انا انزلناک شاهدا ومبشرا......)**

- ئێ ئەوە عەیبی چییە!؟ ئەدی فاحکموا بین الناس بالعدل، چییە؟ لە شەریعەتدا دەقی زۆر هەیە کە تەئکید دەکا تۆ حوکم بکەی، حوکم بەشێکە لە ئیسلام. لێرە ئیشتباهەک هەیە، تێڕوانینی رۆشنبیری خۆمان وایە کە ئیسلام وەکو مەسیحیەتە، هەندێ تقوسە،.

- بەڵام ئیسلام شەریعەتی هەیە.

**بەڵام حوکمەکە هەتا لەسەردەمی خولەفای راشدینیشدا هەمووی جیاواز بووە، هەریەکە بۆ خۆی بەشێوازێک حوکمی کردووە ئەبوو بەکر لەگەڵ عومەر، لەسەر زەکات بۆچوونیان جودا**

بووه و... هتد

- ئەوەیە کە گوتم ئیجتهاداتی موتەغەییرات، ئەوە دەکرێ، حەزرەتی عومەر بەشێوەیەک تێیگەیشتبێ، یەکێکی دیکە بەشێوەیەکی دیکە، ئەوە عەقلە کاردەکا، تێگەیشتنی لە مەوزوعەکە جیاواز بووبێ، ئەوە زیان نادا، ئێستا عەیبی کۆمەڵگای ئێمە ئەوەیە، ئەو کتێبە فقیانە سێ سەدساڵ لەمەو پێش نووسراوە، بەڵام مەلاکان لێی لانادەن، بۆ نموونە حەدیسێک هەیە زەمی مۆسیقا دەکات، بەڵام بۆچی؟ ئەوکات مۆسیقا هەر نەبووە، هەندێ لۆتی و خەڵکی بەرەڵڵا هێناویانە، ئێ ئێمە دەڵێین مۆسیقا ئالەتە، بۆ چاکەی بەکاربێنی، چاکە. بۆ خراپەی بەکاربێنی، خراپە. ئەم بۆچوونەی ئێمە تازەیە، لە کتێبەکاندا نەبووە، چونکە مۆسیقا نەبووە، مەبەستم ئەوەیە کەشتی لەو بابەتەمان زۆرن کە دێین خوێندنەوەیەکی تازە لە دەقی ئیسلامی دەکەین و رای تێدا دەردەبڕین. ئەوەش راستکردنەوەی بۆچوونە هەڵەکانە، خورافاتێکی زۆر هەیە زۆر نەریتی خراپ هەیە کراوەتە دین لە کۆمەڵگای ئێمەدا.

**بەڵام حاکمیەت جگە لە خوا بۆ کەسی دیکە نابێ، چونکە پێغەمبەر (د.خ) بۆ خۆی ئەگەر پەیوەندییەکی بەردەوامی لەگەڵ خوا نەبا، رەنگە ئەویش زۆرجار تووشی لادان دەچوو، کەچی ئەو ئەحزابە ئیسلامیانە هیچ پەیوەندییەکیان بە خواوە نییە بۆیە رۆژانە دەیان هەڵەش بەناوی ئاینەوە دەکەن...**

- نا، خۆ تەفویز ئیلاهی نییە، خۆ ئەمە ثیوقراتی نییە. تۆ دەبێ موتابەعەی بیروڕای ئێمەت کردبێ، ئێمە گوتوومانە حکومەتی دینیمان ناوێ، حکومەتی دینی، ثیوقرات مەرفوزە لە ئیسلام، حکومەتێکی مەدەنی لە ئیسلامدا هەیە. هەر حکومەتێکی مەدەنی ئیسلامیە، ئەگەر ناویشی ئیسلامی نەبێ.

**هەر حکومەتێکی ئیسلامیش، مەدەنییە؟**

- هەر حکومەتێکی ئیسلامی ڕاست، مەدەنیەت دەبێ، بەڵام ئەگەر تالیبان و ئەوانە وەربگری، ئەوانە ناراستن. جارێک لەو بارەوە لێیان پرسیم، گوتم دیموکراسیەتی حەق دژ نابێتەوە لەگەڵ ئیسلامی ڕاست.

**مەلا کرێکار لە ساڵی ٢٠٠٢ لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی هاووڵاتیدا، دەڵێ دیموکراسی بە هەموو بنەماکانیەوە دژی ئیسلامە تۆ لەم بارەیەوە دەڵێی چی؟!**

- ئێ ئەی ئێمەو مەلا کرێکار بۆچی جیاوازین؟

**بەڵام ئەویش بەناوی ئیسلام کاردەکا.**

- جا سەد نەوعە ناوی ئیسلام هەیە، زەرقاوی بەناوی ئیسلامەوە خەڵک ئیبادە دەکا...

**بۆچی ئەو بزووتنەوە ئیسلامیە سیاسیانە لە ناو منداڵدانی خۆیان گرووپی توندڕەوی دروست دەکەن؟**

- من وادەزانم توندڕەوی دیاردەیەکی ئینسانیە، لە

کۆمۆنیستیشدا توندڕەوی هەیە، ڕەوتی کۆمۆنیستت لە بیر نییە.

**ڕەوتی کۆمۆنیست دروشمەکانی توندبوون، بەڵام قەت پەنای نەبردە بەر تیرۆر...**

- ئەوە دەستی هەر ئەوەندە دەڕوا چی بکا! تیرۆر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ئینسانییە، تەندروست نییە، لە توندڕەوی دروست دەبێ، بەڵام بەناوی ئیسلام، چونکە مەسائلی غەیبیە بواری ئەوەی باشتر تێدایە. هەر لە زەمانی حەزرەتی عەلی و ئەوانەوە خەواریج دروستبوون. واتە فکرەی توندڕەوی، چونکە مامەڵە لەگەڵ کەسێک دەکا، ئەگەر کەسێک نەبێ بۆی ڕاست بکاتەوە یەکسەر بەنج دەبێ، بێهۆش دەبێ بەئاراستەیەکی هەڵە. لەبەر ئەوە من ئەو تیرۆریستیە ئیسلامیەم بەجنون ناو بردووە، شێتێکی فکرییە، بەڵام قسەی خۆمان بێ، ئیستغلالی دەولی، تاوەکو ئیستغلالی ڕژێمەکانی ناوچە، تاوەکو حیزبی دەستەڵات لە هەر شوێنێک، ئەوەندە بەکاری دەهێنێ بۆ مەرامەکانی خۆی، ڕۆژێک دروستی دەکات بۆ ئەو مەرامە سیاسیە، ڕۆژێکی دیکە بەهێزی دەکاو ڕۆژێک دەیهێنێ بەشێوەیەکی بەکاردەهێنێ، ڕۆژێک بۆ لێدانی تەیاری ئیسلامی سیاسی بەکاریدێنی، کە مونافەسەی دەکا. ئێمە شەڕمان لەگەڵ لایەنە حیزبیەکانی گۆڕەپانەکە، شەڕی ئیسلام و کوفر نییە، کێشەی دەستەڵاتە. لە کوردستاندا ئەو هەموو تیرۆرەی کە کرا، سەربڕین ئەو پەڕەکەیەتی، ئەوە ئاشکرایە ئەنسارو ئیسلام، یان.. بۆچی ڕۆژێ

پاڵپشتی تەیاری میانڕۆی ئیسلامی ناکرێ، بۆچی بوار بۆ تەیاری میانڕەو دروست ناکرێ، بۆ دەنگی بەرز ناکرێتەوە، بۆچی بەکارناهێندرێ لە حیوارێکدا، لە گفتوگۆیەکدا بۆ ئەوەی روونتر قسەی خۆی بکا، چونکە ئەو تیرۆریستیە ئیسلامیە بە ئیسلامی لەناو دەچێ و سەرکوت دەبێ.

**ئێوە رۆڵتان چی بوو لە لاوازکردنی ئەو گروپانە؟**

- جا خۆ ئێمە نەبووینایە قڕتان تێکەوتبوو کاکە. ئەگەر یەکگرتوو نەبوایە کە لە ساحەکەدا گەنجان و خەڵکانێکی زۆر لە دەوری دان و تێگەیشتنێکی جیاوازی داهێناوەو لەگەڵ هەموو کەس دادەنیشی گفتوگۆ دەکا، ئەگەر ئێمە لە گۆڕەپانی کوردستان نەبووینایە، کوردستان لە رووی هەرێمیەوە، لە رووی واقیعی ناوخۆییەوە، زەمینەی هەبوو ببێتە ئەفغانستێک، یان جەزائیرێکی گەورە. لەبەر ئەوە دەستەڵاتدار کە قەدری ئێمە نازانێ، بەپێچەوانەوە دەیەوێ لەپاڵ زاناو ئەساسی زاناو ئەم ئەنسارو تیرۆرستانەوە، شەڕێکی دیکە بکا کە شەڕی مونافەسە سیاسیەکەیە.

**ئێوە وەکو یەکگرتوو دوای رووداني کۆمەڵێک تەقینەوەو کردەی تیرۆریستی، بەشەفافی و بەراشکاوی نەکەوتنە بەربەرەکانێی تەیارە ئیسلامیە توندڕەوەکان؟**

- چ بکەین، ئاسایشین تابچین بیانگرین، ئێمە ئەدەبیاتمان روونە، کتێبمان هەیە، موحازەراتمان هەیە، بەیاناتمان لەکاتی رووداوەکان

دەرکردووە، بەڵام ئیعلامی دەستەڵات ناگاتە بەر تیشک، چەند جار بە لێپرسراوانی ئەو ناوچەیەم گوتووە، کاکە ئێمە وەکو لایەنێکی ئیسلامی چاکتر دەزانین دەماری ئەو مەوزوعانە چۆنە، با دابنشین و گفتوگۆیەکی زانستی ئەو مەوزوعە بکەین، چونکە ئەوە لادانێکی فیکرییەو خەتەرناکە، تۆ بۆ هەر حەز دەکەی دایپۆشی و شەڕی منی پێ بکەیت. یاشەڕی ئیسلام و جاری واهەیە شەڕی مزگەوتی پێدەکا، نەتبیست هەندێک دەیانگوت بامزگەوت دابخەین.

**بەڵام بەکارهێنانی مزگەوتەکانیش هۆیەکە؟**

- مزگەوت بۆ زۆرشت بەکارهێنرا، کۆبوونەوەی حیزبی لەسەردەمی شۆڕش هی پارتی و یەکێتی و شیوعی هەر لە مزگەوتدا نەبوو؟ ئێستاش بەشێوەیەکی دیکە ئیستغلال دەکرێ.

**رایەک هەیە دەڵێ حیزبی ئیسلامی میانڕەو نییە، تادەگەنە دەستەڵات خۆیان بەمیانڕەو نیشان دەدەن، بەڵام کە گەیشتنە دەستەڵات ئەوکاتە ئەوان جۆرێک لە توندڕەوی پیادە دەکەن، نموونەشیان هەیە وەکو پاکستان و سعودیەو ئێران کە ئەوانە بەناوی دەوڵەتی ئیسلامین و دەوڵەتێکی داخراون.**

- ئەوانە ناویان ئیسلامەو بەڵام واقیعەکەی ئیسلامیی نییە. ئەوە مومارەسەیە، مومارەسەش دەبێ تاک تاک حوکمی بدەین واتا هەردەوڵەتەو بەجیا، بەڵام لە گۆڕەپانی خۆمان جیایە، هەموو دنیا دەزانێ یەکگرتوو عالەمێکی جیاوازە، بیرکردنەوەی جیاوازە،

خەڵکەکانی جیاوازن، بەڵام کوا مامەڵەی جیاوازی لەگەڵ دەکرێ.

**دوای ڕووداوی شـویات، کـە ڕاگـەیاندن لەسـەر بزووتنەوە ئیسلامەکان هەندێک کاری کرد، ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیتان گوتی وامـان لێـمـەکـەن ئەندام و کـادرەکـانمـان هەڵگەڕێنەوەو نەتوانین کۆنترۆڵیان بکەین، ئایا ئەندامانی خۆتان ئەگەر گوێیان لێ بێ هەستیان بۆ توندوتیژی ناجولێ؟**

- نا ئەوە مـانای ئەوەیە تۆ دەتەوێ وابکەی.. ئەو فشـارە کە ئەم برادەرانە دەیکەن بۆ سەر تەیاری وەکو ئێمە، سەری لەوە دەردەچێ، کاتێک من بەو هەموو وەسەیەت و خۆراگرییەوە لەگەڵ مەسەلەکان و خۆم لادەدەم، خۆم هەڵدەکەم لەگەڵ ئەو وەزعەو نامەوێ دەرگیربم، ئەو هەر زوو زوو دێت شەڕی پێ دەفرۆشێ.

فؤاد چەلەبی (زانا) کوشتی، ئەوان کردیانە ئەفسەری ئاسایش، کـردیانە بەرپرس لە دەزگـایەک کـە ئێـمـە ناوێرین هەر باسی بکەین. ئێسـتاکە بزانە چی لێقەوماوە دەیهێننە سەر شـاشە، ئێ باشە کاکە هێشـتـا ئێمە قسە ناکەین، ئێوە قسەی چی دەکەن.. ئینجا هەندێ برادەر وەکو بلێی رسقی کەوتۆتە سەر ئەوە، هەر شتێ لەو بابەتە بوو یەکسەر دەست دەکەنە هێرش بۆ سەر مزگەوت و تەیاری ئیسلامی. ئەمە شەڕ فرۆشیە، ڕاستە ئێمە شەڕ ناکەین، بەڵام فشـاریش دەبێ سنورێکی هەبێ.

**ڕایەک هەیە دەڵێن ناوی یەکگرتوو ئەگەر ئیسلامیەکەی پێوە**

**نەبێ، رەنگە ئەوەندە روو بەرووی گرفت نەدەبووەوە، بەنیازنین لە کۆنگرەی داهاتوو وشەی ئیسلامی هەڵگرن؟**

- هیچ نیەتمان نەهێناوە کەوا بکەین و وانەکەین، بەڵام بە دووری مەبینە، ئێمە خۆمان دەزانین چین، جا ناومان هەرچی بێت. ناو زۆر بە گرنگ نابینین.

**لەو ماوەی دوایی قورئانی پیرۆز کراوە بە کوردی پێت ئاسایی بوو.. ئەوەی هەژاری موکریانی و لە ئێرانیش کراوە بە کوردی؟**

- ئەوە کوردی نییە، تەرجەمەیە، ئەمەش غەریب نییە.

**ئەی ئەگەر نوێژو... ئەوانە بکرێنە کوردی؟**

- ئاخر ئەوە عیبادەتە، دەبێ بە دەقەکەی خۆی بێ، بەڵام ئاساییە دوعا بە کوردی.

**دەڵێن زۆربەی سەرکردایەتی یەکگرتوو بە مامۆستا سەلاحەدینیشەوە خەڵکی هەولێر نین، وەک دەڵێن لە هەولێر بنکەی ئیسلامی لە ئەساسدا نەبوو، بەڵکو زەمینەی بوونی بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە ناوچەی هەورامان زیاتر بوو، بەڵام ئەوانە هاتن لە هەولێر بارەگایان داناو خەڵکیان دروستکرد، باشە بۆ زیاترتان خەڵکی هەورامانن؟**

- ئاگات لە هەورامان نییە، ناوچەیەکی گرنگە.

**گۆران لە شیعرێکدا دەڵێ وەک بەهەشت وایە..**

- له رووی سروشتەوه خۆشه، له رووی زەکات و لێهاتوویی تاکەکانەوه، لەرووی مێژوویشەوه هەتا شیعرو ئەدەبیات کاتی خۆی به هەورامی بووه، ئینجا پیاوه هەڵکەوتووەکانی دینی، وەکو نەقشبەندییەکان هەورامی بوون، لەبەر ئەوه ناوچەیەکی پڕ بەرەکەته، هەڵبەت هەڵەبجه ناوچەیەکی به پیته لەڕووی دینییەوه،ئەوەش دەزانی که ناوچەی هەورامان وەکو مەڵبەندێکی شۆڕش بووه، وەک گوتم ناوچەیەکی دینی بووه، دوای ئەوه تەیاری ئیسلامی لەسەرەتای دروستبوونی ئیخوانەوه له هەڵەبجه بووه، بێگومان له هەولێریش بووه، سەرهەڵدانه ئیخوانییەکه زۆر چالاک بووه له ناوچەی هەڵەبجه، ئێمه هەوڵمانداوه که ئەو مەسەلەیه لەو چوارچێوەیه نەمێنێ، هەولێریش پایتەختی کوردستانه، عادەتەن سەرکردایەتی حیزبەکان دەبێ لێرەبێ. ئێمه گرنگیدانی بادینانیشمان هەیه که رەنگه کەم حیزب هەبێ، توانیبێتی ئەو کۆکردنەوەیه بکات له نێوان بادینان و سۆران و هەورامان و تێکەڵی بکا. هەولێر شارێکی کۆن و پڕ له زاناو پڕ له عولەماو پیاوی گەورەی دینی بوون، لەرووی تەیاری ئیسلامی تازەش، چالاکی تیابووه، بەڵام بەباری بزووتنەوەی ئیسلامیدا کەوتەوەو له ماوەی هەشتاکاندا، دواتر له نەوەدەکانیشدا هەر چالاکیەکیان هەبوو، ئێمه بەو شێوەیه له هەولێر نەبووین.

**رەنگه هەر ئەوەش بێ که له سەرکردایەتیتان خەڵکی هەولێر نییه؟**

- له سەركردایەتی هەمانە، بەڵام بەو رێژەیەی شوێنەكانی دیكە نییە.

**دەنگـــوتری یەكگرتوو لە هەڵبـــژاردنی دوایی لە چاو ئەو هەڵبژاردنانەی شارەوانی دەنگی كەمتر بوو، واتا گەڕانەوەیەك هەبووەو لە كورتیتان داوە، ئەمەش هەر دەنگوترێ لەبەر ئەوەی كاتێك شەڕو نا ئارامی هەبووە، ئەوان توانیان ئیستغلالی وەزع بكەن و خەڵك روویان تێبكا ، بەڵام كە ئێستا ئارامی هەیە خەڵكەكە وردە وردە دووركەوتۆتەوە بە گوێرەی دەنگدانەكەش بێ راستیەك هەیە كە ئێوە گەڕانەتەوە دواوە.**

- جارێ هەڵكشان و داكشان لە چالاكی هەر حزبێكدا دەبێت، ئەوە غەریب نییە، بڕوامان وانییە ئێمە مەعسوم بین و هەڵەمان نەكردبێ لە ئەدائی قیادی تاوەكو بڵێین وانییە، بەڵام دەتوانین وا لێكدەینەوە لەشەڕی ناوخۆ ئەو دوو حیزبە سەرقاڵ بوون بە شەڕی یەكترەوەو تۆپخانەو هێنانی لەشكرەوە، راستە ئێمە چالاكتر لە مەیداندا بووین، ئەوان كە پارەو شتیان هێنا سەرفیانكرد لە پێناوی دەنگدا، هەڵبەت ئێمە بەرگەی ئەوە ناگرین، بەڵام حەزدەكەین، چونكە خەڵكەكە هەندێك عاقڵ بووە، پارەكە وەردەگرێ بەڵام دەنگەكە دەدا، نادا زۆر گوێی لێ نییە، ئێمە حەزدەكەین پارە لە خەڵك سەرف كەن. دەربارەی هەڵبژاردنی دوایی، بێگومان بووینمان لەگەڵ لیستی هاوپەیمانی، هەندێ زیانی لێدابن بەو ئیعتیبارەی كە

هاوولاتی چاوەڕێی ئەوەبوو ئێمە بە تەنیا دابەزین و بەو حیسابەی هێزێکی جیاوازبووین، بەڵام شەڕی دەستوورو مەسەلەی فیدرالیەت هەستمانکرد قۆناغەکە وا دەخوازێ لەگەڵ هاوپەیمان بین، زەرەریشمان کرد تەنانەت ئەوانەی بێلایەن بوون و بە تەمای دەنگیان بووین، دەنگیان بە ئێمە نەدا، ئەوەش کە ئیسلامی بوو، لیستی تربوو دەنگی بە لیستی خۆیدا، دەتوانم بڵێم ئەو دەنگانە بە تەنیا دەنگی ئەندامانی خۆمان بووە، لەبەر ئەوە هەڵوەستەمان لەسەر کردو موراجەعەی خۆمان کرد لەو بابەتە، بەڵام وادەزانین پرۆژەی ئێمە کە پرۆژەی چاکسازییەو ستراتیژیەتمان چاکسازییە، سەرەتای ئیشمانە، تەواونەبووینە، ئەگەر خەڵک ئیشی تەواو بووەو ماف وەرگیراوە، بەڵام کێ حوکمی ئەو فیدرالیە دەکا، کێ دەتوانێ عەدالەت و یەکسانی و ئازادی و دیموکراسی و ئەو بنەما جوانانە پیادە بکاو بیکاتە واقیع، تائێستا ئێمە ئەو ١٤-١٥ ساڵەمان بە دڵ نییە، لەبەر ئەوە بۆ پیادەکردنی هەموو بنەما جوانەکان لە مافی مرۆڤ و ماف و ئەرکی هاوولاتی زۆر ماوە لەبەردەمماندا، جگە لە (تصحیح) ئێمە دوو رەهەندمان هەیە چاکسازی و (تصحیح)، چاکسازی بۆ مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان، (تصحیح)یش بۆ رێڕەوی بیرکردنەوەو فیکری ئیسلامی بەتایبەتی کە ئەویش کە شوێنێکی لەسەرەو زوو زوو لادان و توندوتیژی تێدا دروست دەبێ و بەکار دەهێنرێ بۆ شەڕی ئیسلامی..

**بۆچی هەوڵتان نەدا لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامی لیستێک پێکبێنن**

**له جیاتی ئەوەی لەگەڵ حیزبە نەتەوەییەکان لیست دروست بکەن؟**

- ئێمە لەو قۆناغەدا پێمان باشبوو هەموو کوردستان پێکەوە بێ.

**بەڵام کۆمەڵ نەیانکرد؟**

- ئاخر برادەرانی پارتی و یەکێتی ئەمانیان قبوڵ نەکرد، ئێمەو خۆشیان هەوڵیاندا کە بێن لەگەڵ لیستی هاوپەیمانی بەشدار بن، بەڵام پارتی و یەکێتی بوونی ئەوانیان لەگەڵ لیستەکە پێ باش نەبوو، ئێمە بۆ مەسەلەی دەنگی کورد لە پەرلەمانی عێراق و مەسەلەی فیدرالی پێمان باشبوو کوردستان هەمووی بە یەکەوە بێ، بەڵام پێویست ناکا ئەوە دووبارە بێتەوە.

**بزووتنەوە لەهەر حیزبێک زیاتر بەرەو توندڕەوی ڕۆیشتن، ئەوەبوو زەرەرێکی گەورەی لەخۆداو چەندین پارچەی لێبۆوە کە جوندوئیسلام و تا دەگاتە ئەنسارولئیسلام و کۆمەڵیش بە هەمان شێوە، بەڵام هەست دەکەی کۆمەڵ واقیعی کوردستان دەخوێنێتەوە، ئەوە نەبووەتە هۆی ئەوەی کۆمەڵ زیاتر لێتان نزیک بێتەوە؟**

- بێگومان لەو ماوەیە بەینمان خۆشە، چونکە زۆر رامان لە رێڕەوی کاری سیاسی و فیکریان هەیەو حەزدەکەین بەو شێوەیە بەردەوام بن.

**بەڵام دەڵێن جیاوازییەک هەیە لە نێوان ئێوەو کۆمەڵ، کۆمەڵ زیاتر مۆرکی کوردانەی پێوە دیارە، هەرچی یەککگرتووە لەبەر ئەوەی درێژکراوەی ئیخوانەو مۆرکێکی عێراقی هەیە، ئەو**

**مۆرکەی کوردی زۆر پێوە دیار نییەو کوردستانیەکێی کۆمەڵ تۆختره.**

- یاخوا وابێ. هەر دان بەلایەکمان دابنێین هەر باشه.

**له کوردستان بوومته عادەت ئەوەی سکرتێربێ تا ماوه هەر خۆی سکرتێر دەبێ، وەکو عەزیز محمد که چارەگه سەدەیەک زیاتر سکرتێر بوو، ئەوانی دیکەش، ئایا تۆش بەنیازی هەر به ئەمینداری بمێنیتەوه ؟**

- من ئەم جاره بڕیارم بوو و حەزم دەکرد وازم لێ بێنن و خۆم هەڵنەبژێرمەوه، حەزم کرد نموونەیەک پێشکەش بکەم و ئەو مۆدەیه بشکێنم، ئەگینا نه پیرم و نه تەندروستیشم ناتەواوه، ئەوەبوو له کۆنگره تەرحم کرد، بەڵام پێیان باش نەبوو، بوویته مۆدیلیش لەو رۆژهەڵاته گۆڕینی سکرتێر ئاسان نییه، مەگەر رووداو ببێ.

**له رووداوی ١١ی سیپتەمبەردا، ئایا پێتوایه بن لادن توانای ئەوەی هەبوو، ئەو بورجانه برووخێنێ؟**

- وەڵڵاهی من وانابینم، من دەزانم بن لادن سیناریۆیەکی زۆر ئاڵۆزه، سەرەتا بن لادن کەسێکی لەوانەیه به بەرائەت ناوی بنێین چووەته ناو ئەو پرۆسەی جیهادی ئیسلامی له ئەفغانستان، بەڵام جیهادی ئەفغانی له ئەفغانستان هەر خۆی قسەی لەسەره، جیهاد بۆ دروستبوو، له ئەفغانستان خەڵکەکه دانیشتبوو کودەتایەکی شیوعی کرابوو، کاکه شیوعی خۆ ئیتر ئەوەنده نامێننەوه لەسەر حوکم، هەر خۆیان خۆیان لەناو دەبەن، ئەمان به پەله گوتیان دەبێ جیهاد دژی

بکەین.

**بەڵام دوایی خۆیان خۆیان تەواوکرد، حیکمەت یارو بورهانەدین رەبانی و...**

- بێگومان ئەمە ئیستغلال کرا، دیارە ئەمریکا ئیستغلالی کرد، چونکە لە مەترسی بوو و لە هەلیش بوو، قۆناغێک لە مەترسی بوو کە ئەفغانستان شیوعی بێ و ئێرانیش مەیلی کۆن کردووە لەگەڵ ئەمریکا، دەبێ کار لەسەر ئەو ناوچەیە بکرێ، ئەوەبوو پاکستان و سعودیەیان راسپارد کە پشتی ئەو جیهادی ئەفغانییە بگرێ، کە پشتیگیرا ئەوەبوو رێیان خۆشکرد خەڵک بچێ لەوێ جیهاد بکا، لەوانەیە خەڵکەکە بە بەرائەت چوو بێ، بەڵام پلانێک هەبووە، دوایی ئەوەبوو ئەفغانییەکان خۆیان کێشەیان بۆ دروست بوو، ئەوەبوو هەر بەپلانی ئەمریکا، تالیبانیشیان دروستکرد بۆ لە ناوبردنی بزووتنەوەکان، تالیبانیش هەر لەمنداڵدانی پاکستانەوە دروستکرا، دوایی ئەو بنلادنە بووە بەشێک لە پرۆژەی تالیبان، کە تالیبانیش وەختی قەیرانی هات و دەبێ لێیبدرێ و ئەو فیلمە تەواو بێ، بنلادن بووە بەشێک لەو مەوزوعە، وەکو زەرقاوییەکەی ئێرەی لێهاتووە، ئێستا کەس نازانێ زەرقاوی ماوە، مردووە، هەر رۆژێ قسەیەک دەکرێ، ئەو توانا بێ شومارەی لە ١١ی سێپتەمبەردا بەکارهێنراوە ناتوانی بڵێی سروشتیە. وڵاتی گەورە ناتوانێ ئەوەبکا، نەک کۆمەڵە ئینسانێک.

**پێتوایە بن لادن موجاهیدە، تیرۆریستە، چییە؟**

- بەڕای من خوێنی خەڵکێکی زۆری لە گەردنە، چونکە ئاشێکی ناوەتەوە. خوا دەزانێ کەی تەواو دەبێ، من ئیشم بە نیەتی نییە، چونکە نیەت ناخوێنرێتەوە، بەڵام کردەکەی، کردەیەکی مەحکومە، کردەیەکی تیرۆریستی دڕندانەیە فڕی بە ئیسلامەوە نییە، ئەو، چ هەموو ئەوانەی لەو خەتەدا ئیش دەکەن، کارێکی دژ بە دین دەکەن. بەکرداریش ئیسلامی قاچاخ کرد لە ئەمریکا، لە ئەوروپا، ئیسلامی خستە قەفەسی تاوانباری کە ئەو موسڵمانە فەقیرانە لە وڵاتی ئیسلامی خۆیاندا ئازاردراون و چوون لەوێ مافی پەنابەرییان پێداون و بەخێویان دەکەن، ئەوانەشیان خستە ئەزیەت و عەزابەوە.

**بۆچی یەکگرتوو زیاتر گرنگی بە نووسین و بڵاوکراوەکانی سەید قوتب و عەبدولسەلام فەرەج دەدا، لەجیاتی محەمەد عەبدەو جەمالەدین ئەفغانی و عەبدولرەحمان کەواکبی؟**

- نا.. وانییە، ئەوە ماوەیەک بوو، ساڵی هەشتاکان زۆر لەبەردەستدا بووە، بەڵام ئەمڕۆ بڕواناکەم، لە کتێبخانە هەمانە، بەڵام نایخوێنییەوە، لەبەر ئەوەی یەکەم: وەرزی بەسەرچوو، دووەم: کاریگەری و دەرەنجامی ئەو فیکرە دەرکەوت، لەگەڵ ئەوەی من سەید قوتب بە بیرکارێکی گەورە دەزانم، ئەدیبێکی گەورەیە، خزمەتی باشی لە تەفسیری قورئاندا کردووە، بەڵام بە مەعسومی نازانم، لەو بۆچوونانەشدا کە سەری شێواندووە لە خوێنەرەکە لە کە ئەوە کۆمەڵگایەکی جاهیلیەو چی بکاو ئەوە چی بکا، لەوەیان بە هەڵەداچووەو خوا لێی نەگرێ، هەرچەندە پیاوێکی بەهێز بوو لە بەرامبەر عەبدولناسرو خۆی ڕاگرتبوو و خۆی نەفرۆشت.

**عەلی باپیر**

## ئێمە کێشەمان لەوەدابوو مامۆستا عەلی رابەری بزووتنەوەمان بۆ پابەند نەدەکرا بەشووراو بەبەرنامە



مامۆستا عەلی باپیر یەکێکە لەو سەرکردە ئیسلامیە سیاسیانەی کە دەکرێ بڵێین لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە، سەنگ و پێگەیەکی سیاسیانەی هەبووە، بەتایبەتی لە ناوچەی پشدەرو رانیە، بەڵام لە دوای راپەڕینی ١٩٩١، مامۆستا عەلی باپیر زیاتر لە هەموو سەرکردە ئیسلامیە سیاسیەکانی دیکەی کوردستان بەهۆی گوتارەکانی کە خەتیبێکی سەرکەوتوو بوو، هەروەها بەهۆی ئەو نووسین و کتێبانەی کە خۆی دایناوون، بووە جێ سەرنجی خەڵک بەگشتی و گەنجان بەتایبەتی. دووەمین کەس لەو بارەیەوە کە توانی سەرنجی خەڵک رابکێشێ مەلا کرێکار بوو، هەردووکیشیان گوتارەکانیان بریتی بوو لە رەخنە بۆ دەسەڵاتی کوردی، گوتارەکانیان جۆرێک لە توندڕەویشی لە ئامێز گرتبوو، ئیتر راستە مامۆستا عەلی باپیر لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستاندا کاری دەکرد، بەڵام لە راستیداو لە واقیعدا، عەلی باپیر، هێڵێکی پانی ناو بزووتنەوەبوو، توانیبووی هەژموونێک بۆخۆی، خەڵکێک لە ناو بزووتنەوە بۆ خۆی گل بداتەوە، تەنانەت ئەو شکستەی بەسەر بزووتنەوەی ئیسلامیشداهات لە ١٩٩٣-١٩٩٤و تەنانەت هی ئەم دواییەش، مامۆستا عەلی باپیر توانی مەخرەجێک بۆخۆی بدۆزێتەوەو گومرگانەیەکی کەمتر بدات لەوەی زۆرینەی سەرکردایەتی بزووتنەوە دایان.

عەلی باپیر، کە بە تەمەنیش گەنجە، بەجوانی دەزانێ سیاسەت بکات و هەمیشەش پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە کوردایەتی راستەقینە بۆ خەڵکی موسڵمان ئەوەیە کە ئەو دەیکات.

**تێبینی لەسەر بزاڤە ئیسلامیەکانی دیکەی تەنانەت وەکو یەکگرتووی ئیسلامیش هەیەو، ئەو واتە عەلی باپیر نایەوێ لەژێر کاریگەرو کۆنترۆلی هیچ لایەنێکدا مامەڵە بکات، زیاتر دەیەوێ بزووتنەوەیەک دروست بکات وەک خۆی دەیەوێ، سەرەرای بەشداریکردنی لە دەسەڵات و حوکم،دەیەوێ حزبەکەی مۆرکێکی کوردانەشی هەبێ، کە لێرەدا تا رادەیەک لەگەڵ یەکگرتووی ئیسلامی لێک جودا دەبنەوە، دوای ئازادبوونیشی لەلایەن ئەمریکییەکانەوە، هەوڵی خۆ گونجاندنی زیاتری پێوەدیارە، بۆ نموونە کە ئازادکرا چووە هەڵەبجەو سەردانی مەلا عەلی عەبدولعەزیزی رابەری بزووتنەوەی کردووە، بەلام مەلا عەلی سەردانی نەکردۆتەوە، واتە مەلا عەلی باپیر ئێستا باشتر واقیعی کۆمەلایەتی، سیاسی کوردستان دەخوێنێتەوە، ئایندەش توانای عەلی باپیرمان باشتر بۆ روون دەکاتەوە کە ئاخۆ دەتوانێ ببێتە گەورەترین حزبی ئیسلامی لە کوردستان و، سوودی لە شکستەکانی بزووتنەوە وەرگرتووە، یان نا.**

**بەر لەوەی ئینتمات بۆ هیچ رێکخراوێکی ئیسلامی، سیاسی هەبێت، خەریکی چی بوویت؟**

- من لە سەرەتای تەمەنمەوە، واتا هەر لەو کاتەی کە خۆم ناسیوەو شارەزاییەکم لە دین پەیداکرد وەکو دینداری شەخسی، پێش ئەوەی بیر لە خەڵک بکەمەوە، لەبیری ئەوەدا بووم چۆن بەپێی ئەو عەقیدەو

تێڕوانینە ئیسلامیەی کە من وەرمگرت، وابکەم وردە وردەو پلە بەپلە خوا لە خۆم رازی بکەم و چۆن دینداری و موسڵمانێتی بکەم. دوایی وردە وردە تێگەیشتنم لە ئیسلام قوڵترو فراوانتربوو، دیارە بە پلەی یەکەم لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەت، پاشان لەبەر رۆشنایی کتێب و بەرهەمی زانایان، ئەو ڕاستیەم بۆ دەرکەوت کە ئیسلام وەک چۆن داوای پابەندی شەخسی لە مرۆڤ دەکات کە لەزاتی خۆیدا بەدینەوە پابەندبێ، داوای پابەندی کۆمەڵیشی لێدەکات. واتا بۆم دەرکەوت ئیسلام وەک چۆن کۆمەڵێک ئەرکی تێدایە، بە ئینسان وەک تاک لە خودی خۆیدا جێبەجێ دەکرێ، وەکو ئیمان، عەقیدەو عیباداتی شەخسی، هەندێ خوورەوشتی شەخسی، خۆپاراستن لە گوناح و چاکە کاری شەخسی و خۆرازاندنەوە بە سیفاتی باش کە ئەوانە بە تاک جێبەجێ دەکرێن، وێڕای ئەوەش کۆمەڵێک ئەرک و فەرمانیش هەن کە بە ئینسانێک جێبەجێ دەکرێن، لە کاتێکدا تاکێک دەبێ لە کۆمەڵێکداو دەبێ هەموو بەیەکەوە دەسبار بۆ یەکتر بگرن، یانی هەر لە سەرەتاوە من ئەو حەقیقەتەم بۆ دەرکەوت و ئەوەش پاڵی پێوەنام کە لەبیری ئەوە دابم رێکخراوێکی ئیسلامی بنیات بنێم، لەو ناوچەیەی کە زیاتر تێیدا دەژیام کە ناوچەی بیتوێن و پشدەر بوو، هەندێ خەڵک، برایانم و هاوڕێیانم لە خۆمەوە دەئالآند، ئەوەی کە کاتی خۆی فکرەیەکی دیکەی هەبوو، بۆ نموونە شیوعی بووە، یاهەر شتێکی دیکە بووە، قسەم بۆ دەکرد، ئامۆژگاریم دەکردو ئیسلامم

تێدەگەیاند، ئەوە لە ساڵانی کۆتایی هەفتاکان بوو، چونکە من لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە کە ئەو کاتە تەمەنم ٦ساڵان بووە موتالەعەو خوێندنەوەم بووە، لەو کاتەوەی کە چوومە پەیمانگای ئیسلامی، تەوەجوهی ئیسلامیم بۆ پەیدابوو.

**چی وای لێکردی بچیە پەیمانگای ئیسلامی، لە خێزانێکی ئایینی بوویت، یاخۆت؟**

- من باوکم و دایکم نەخوێندەواربوون، بەڵام خوای پەروەردگار دەفەرمووێ، (فطره الله التی فطر الناس علیها)، لە روانگەی ئیسلامەوە هەموو مرۆڤێک بە فیترەت و بە سروشت خواپەرست و خواناسە، ئەگەر ژینگەو زەمینەیەکی بۆ برەخسێ کە رووبکاتە خوا ئەو ئامادەییە خواپەرستیەی زیاتر تێدا دەپشکوێ.. من باوک و دایکم و باپیرم و نەنک و هەموو خزمەکانم بەدین و نوێژکەربوون، بەڵام نەخوێندەواربوون، دەتوانم بڵێم لە سەرەتادا دینداریەکەم شتێکی فیتری بوو، بەبێ حاڵیبوون لە ئیسلام و قورئان و سوننەت، چونکە من هەر لە قۆناغی سەرەتایی نوێژم دەکرد و رۆژووشم دەگرت، هەر ئەو هەستەش پاڵی پێوەنام بچمە پەیمانگای ئیسلامی، مامۆستاو فەقێیەکانیش کە تێکەڵیم لەگەڵیان هەبوو، چونکە من قوتابی بووم، فەقێ نەبووم، رەنگە ئەوانیش کاریگەریان لەسەرم هەبووبێ، ئیتر دوایی کە چوومە پەیمانگای ئیسلامی تەفسیرم خوێند، حەدیسی پێغەمبەر (د.خ)و فقە و عەقیدەی ئیسلامی و چۆنیەتی قورئان

خوێندن و (اصول فقه)، ئەوانەم خوێند.

**ئینتـمـات بۆ ڕێکخـراوێکی سـیـاسی- ئیـسـلامی بۆ کـەی دەگەڕێتەوە؟**

- سەرەتا ئینتمایەکەم بەشێوەیەکی غەیرە ڕەسمی بوو، بەشێوەیەک ناوم لە خـۆنەنابوو کـە ئەندامـێکم، بەڵام بە کـردەوەیی هەبـووم. ئەمـە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٩، ئەو کاتەی کە لە ئامادەیی پەیمانگای ئیسلامی دەمخوێند، لە کۆتایی خوێندنم دابووم کە هەست و نەست و ئاراسـتـەی ئیـسـلامی لای من دەسـتـیـپـێکرد، لەگـەڵ کـۆمـەڵـێک لە مامۆستاو خەڵکی ڕۆشنبیر لە سلێمانی یەکترمان دەبینی، لەو بارەوە راوێژمـــان دەکـــرد، بەتـایـبـــەتی دوای شکســـتی شـــۆڕشی ئەیلول، بۆشاییەکی سیاسی دروستببوو کە هەر کەسەو هەوڵیدەدا بەشێوەی تێڕوانینی خۆی پڕی بکاتەوە. ئێمـەش وەکو ئیسلامی بیـرمان لەوە دەکـردەوە کـە ڕێکخـراوێکی ئیـسـلامی هەبێ، بەهۆیەوە بەرگـری لە مـــەزلومـــیـــەت و بوونی کـــورد بکەین و بەرامـــبـــەر ڕژێمی بەعس بووەستینەوە، پاشان کاری ئیسلامی بکەین و بانگی خەڵک بکەین بۆ ئیسلام و دینی تێبگەیەنین، ئەو خەڵکە ڕاستە موسڵمانە، بەڵام لە دین تێنەگەیشتووە، تێیبگەیەنین و پەروەردەی بکەین. کەواتە دەتوانم بڵێم ئینتمایەکە لە ١٩٧٨- ١٩٧٩ چەکەرەی داو دەستیپێکرد.

**- بەڵام لە هیچ حیزب و گروپێک نەبووی؟**

- نەخـێـر.. لە ١٩٨١-١٩٨٢ ئەو کـاتە بزووتنەوەی پەیوەندی

ئیسلامی هەبوو کە لە ساڵی ١٩٧٨ وەکو نەواتێک دەستیپێکردووە، من لەو کاتەوە بەکردەوە تێدابووم، بەڵام بەرەسمی نا، چونکە هەندێ ئیشکالم لەسەر هەندێ شتیان هەبوو، دەمگوت من هاوکاریتان دەکەم، بەڵام بەرەسمی تێیدا ئەندام نابم.

**واتە پەیوەندیت لەگەڵیان هەبوو؟**

- بەڵێ.. بەکردەوەش هاوکاریم دەکردن. ئەو کاتەی لە ١٩٨٤ - ١٩٨٥ لە رژێم قاچاخ بووم، ماڵم چووە سەرسیان، دوایی ماڵم چووە ماخۆ بزنان، ئەوانەی کە هاموشۆی ئەو دیویان دەکردو ئەوانەشی کە لەو دیوەوە دەهاتن، لە ماڵی ئێمە دەحەوانەوە.

**مادام هاوکاریان بوویت، چۆن بوو ئینتمات بۆیان نەکرد؟**

- هەندێ ئیشکالم لەسەر شێوەی کارکردنیان هەبوو. من بڕوام وابوو و دەمگوت جارێ بارێکخستنەکانمان بەهێز بکەین، بارێکخستن هەبێ، من خۆم کاری رێکخستنم هەر دەکرد، بەڵام وەکو شتێکی تاکی، من دەمگوت ئەو خەڵکەی ئێمە راستە موسڵمانە، بەڵام لە دین تێنەگەیشتووە، گرفتی هەر ئەوە نییە چەکی پێ نییە، بەڵێ پێویستە چەکدارمان هەبێ و لە خەباتی رزگاریخوازانەی میللەتەکەماندا بەشداربین، بەڵام دەبێ رێکخستنەکانیشمان بەهێز بکەین و ئەم خەڵکە هۆشیار بکەینەوە. دەمگوت ئەو خەڵکە هەموو بەسەر جاش و ئەمن و موخابەراتدا ماوەتەوە، خۆ دەبێ ئەو خەڵکە تێبگەیەنین کە کاکە ئەوە حەرامە، من ئەوکات زۆر بەئاشکرا دژایەتی رژێمم دەکرد،

فتوام دا كه جاشايه‌تی حه‌رامه‌و جۆرێكه له دين وه‌رگه‌ڕان، سيخوری حه‌رامه. ده‌مگوت پێویسته ئه‌و خه‌ڵكه هۆشياربكه‌ينه‌وه، ئه‌گه‌رنا سودی چييه ئێمه ٤چه‌كمان پێ بێ و له ده‌ره‌وه بين، به‌ڵام خه‌ڵك هه‌موو له‌گه‌ڵ رژێمدا بێ. هه‌ندێ شتی ديكه‌ش هه‌بوون كه ره‌نگه من تێبينم هه‌بووبێ له‌سه‌ر هه‌نديك له‌وانه‌ی له‌نێو كاره‌كه‌دا هه‌بوون، له‌سه‌رراستی و كارامه‌ييان دڵنيانه‌بووم، به چاكم نه‌ده‌زانی بچمه ناو وه‌زعێكه‌وه تێيدا به‌رچاو روون نيم.

**پێش ئه‌وه‌ی ئه‌وانه هه‌بن، ئيخوان موسلمين هه‌بوو، كه ئه‌و كاته به‌نهێنی كاريان ده‌كرد، ئه‌گه‌رچی له عێراقدا خۆيان ته‌جميد كردبوو، به‌ڵام له كوردستاندا وجوديكيان هه‌بوو، چۆن بوو بيرت بۆ ئيخوان موسلمين نه‌چوو؟**

- ئه‌وه‌نده‌ی من ئاگادار بم، ئيخوان له كوردستان وجودی رێكخراوييان نه‌بوو، وجودی فيكرييان هه‌بوو، ئه‌وان به فه‌رمانی مه‌كته‌بی ئيرشاد له ساڵی ١٩٧٠ كاری خۆيان وه‌ستاند، هه‌تا له ساڵی ١٩٩١ به فيعلی ده‌ستيان به‌كاركرده‌وه‌و وه‌كو ئيخوان موسلمين خۆيان ئاشكراكرد، به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مامۆستا سه‌لاحه‌دين و مامۆستا سديق بيروراريان له يه‌كدی جيابوو، ئه‌و كاته ناويان لێنرا خه‌تی يه‌ك و خه‌تی دوو... جامن بۆيه بيرم له ئيخوان نه‌ده‌كرده‌وه، چونكه هه‌ميشه باوه‌ڕم وابووه، كارێك له‌ناو ميلله‌تێكدا بكرێ، پێويسته هه‌ڵقولاوی واقيعی ئه‌و ميلله‌ته بێت، من به پێويستم

زانیـووه لە رووی فـیکری و ئەدەبیـاتەوە سـود لە ئیـخـوان وەربگیـرێ، بەڵام بە هەڵەم زانیـوە لە رێکخـراوێکدا بم کە تەوجیـهـاتی لە دەرەوەی کوردستانەوە بۆ دێ.

**ئەوە رێک وەک ئەوە نییە چۆن دەڵێن حیزبی شیوعی هەمووی سەر بە حیزبی شیوعی سۆڤیەتی بوون، ئیخوان موسلمینیش هەمووی سەر بە ئیـخوان موسلمـینی مـیسر بوون.. ئەوە دەکرێ وەکو یەک بەراورد بکرێن؟**

- تاڕادەیەک دەکرێ، هەر بۆیەش دەبینین حیزبی شیوعی لە واقیعی کـوردسـتـان و عـێـراقـدا، لەبەر ئەوەی زیـاتر بە سیـاسـەتی یەکـێـتی سۆڤیەتەوە پابەندبوو، تەماشا دەکەی کەمتر توانی مۆرکێکی خۆماڵی وەربگرێ و خـەڵک زۆر مـتـمـانەی پێ بکاو دڵی پێـیـخـۆش بێ و لەگەڵیـدا تەفاعـول بکا. هەڵبەتە لە رووی فـیکرییەوە قـوتابخـانەی ئیخوان موسلمین قوتابخانەیەکی دەوڵەمەندە، هەموومان سودمان لێی بینیـوەو لێـیان بەهرەمەندبووین، بەڵام بە دڵنیـاییەوە حەسەن بەنناو سـەید قـوتب رەحـمـەتی خوایان لێ بێ، ئەگەر لە کـوردسـتـان بوان، پێمـوایە بە لەبەرچاوگرتنی واقیـعی کوردستان بیریان دەکردەوەو رەنگە زۆر لە مـیکانیـزم و شـێـوازەکـانی کـارکـردنی خـۆیان کە لە مـیـسـردا پەیڕەویان دەکرد، دەیانگۆڕی.

**پێتوایە ئیخوان ئەو مۆرکە ناکوردستانیەیان پێوە ماوە؟**

- من پێـمـوایە برایانی یەکگرتوو تاڕادەیەکی زۆر مـۆرکی

کوردستانیانەیان وەرگرتووە، خۆشیان ئینکاری لەوە ناکەن کە پەیوەندیان بەبرایانی دیکەیانەوە هەیە، بەڵام ئایا برایانی یەکگرتوو تاچ رادەیەک لەوەدا ئازادن کە کاری ئیسلامی لە کوردستاندا واقیعی میللەتی موسڵمانی کوردستان بێ، ئایا تاچ رادەیەک لەوەدا رێگەیان پێدەدرێ، ئەوە جێی قسە لێکردنێیە.

**بەر لەوەی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی دروست ببێ رابیتە هەبوو، وابزانم شێخ عوسمان و ئەوانە دروستیان کردبوو، ئەو رابیتەیە دوایی بووە بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی...**

- نا، نا، هەر بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی بوو، پێیاندەگوت (حرکە الرابطە الاسلامیە). هەر ئەوە بوو کە لە (١٩٧٨) وەکو نەوات دانرا، من یەکێ بووم لەوانەی ئاگاداربووم لە دامەزراندنی نەواتەکەی، یەکێکیش بووم لەوانەی بەکردەوە بەشداربووم، بەڵام بەرەسمی نا، دوایی لە ساڵی ١٩٨٧ من پێشنیارم بۆ جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان کرد، پێش ئەوەی مامۆستا بچێتە دەرەوە، لە هەڵەبجە سەردانێکم کرد، گوتم مامۆستا پێویستە ئەو بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیە فراوانتر بکەین و ئەو پەیوەندیەش لەناوەکە لادەین و ببێتە بزووتنەوەی ئیسلامی، ناوەکەی گشتگیرترە، وەکو دەگوترا بزووتنەوەی ئیسلامی لە پاکستان، بزووتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا، یا لە عێراق، بابڵێین بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان عێراق.. ئەوەبوو دواتر وشەی پەیوەندیەکەمان لێکردەوەو ناوەکە

گۆڕا.

**باشە تۆ ئینتمات نەبوو، چۆن ئەو پێشنیارەت کردو ئەوانیش جێبەجێیان کرد؟**

- من وەک گوتم بەکردەوە لە ئیشەکاندا هەبووم، بەڕاستی ئەوان زۆریان پێخۆشبوو لەناو کارەکەدا بم، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٨٥ سەردانێکی مامۆستا مەلا شێخ محەمەدم کرد، ئەوکاتە رابەری بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی بوو، ئەکات ماڵم لە سنە بوو، مامۆستا زۆر تەکلیفی لێکردم و گوتی فلانە کەس خۆ تۆ لە هەموو ئیشەکانماندا بەکردەوە هەیت و پشتگیریمان دەکەی ئەو برایانەی هاموشۆت دەکەن بۆ رێکخستنی ناوەوە، تۆ دەیانگەیەنی و ئەوانەی دێن بۆ لامان لەرێی تۆوە دێن، بەتایبەتی ئەوانەی لە قوڵی پشدەرو بیتوێنەوە دێن، منیش گوتم مامۆستا جارێ عەقڵم نایبڕی، ئەوە من ئامادەم بۆ هەموو شتێکی کردەیی، بەڵام جارێ پێمخۆش نییە. قسەی خۆمان بێ راستە رابەرو ئەو شتانە نەبووم، بەڵام خەڵکێکی زۆر پەیوەندی بەمنەو هەبوو، خەڵکێکی زۆر لەژێر کاریگەری من دابوو لە رێگای کتێبەکان و وتارەکان و ئاراستەو وانەکانمان، واتە بەدەردی کابرا دەڵێ منیش حەرەکەتێک بووم لەو ناوچەیەی لێی بووم و لە شوێنەکانی دیکەش کەم و زۆر خەڵکێک هەبوو لەژێر کاریگەری فیکرو بۆچوونەکانی من دابوو.

**تۆ لە ساڵی ١٩٨٥ چووی بۆ سنەو کوردستانت جێهێشتبوو؟**

- نا ، من بە سەفەر چووم، برایانی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی تەکلیفیان لێکردم، گوتیان ئەگەر سەفەرێکمان بۆ بکەی بۆ لای جەنابی مامۆستا شێخ محەمەدو هەندێک کاری رێکخراوەیی و شت بوو کە من دەمتوانی بیانکەم، ئەوەیەکێ بوو لەو شتانەی کە وەک گوتم بەکردەوە تێدابووم، بەلام بەڕەسمی نا .

**لە سالی ١٩٨٧ کە بووە بزووتنەوەی ئیسلامی، ئەوکاتەش هەر ئینتمات نەکرد؟**

- با ، ئەوکاتەی من چووم بە رەسمی بەیعەتم بە مامۆستا مەلا عوسمان کرد ، بە رەحمەت بێ ئەوکاتە لە ئۆردوگای سەریاس بوو ، بەس ئێمە ئەوکاتە بنکەو بارەگامان لە قەلاتوکان دانابوو ، ئێمە وجودی خۆمان زیاتر لەوە دەبینی کە دەبێ لەم دیوە بین، لە کوردستان بین، من دوایی مالەکەی خۆشم بۆ قەلاتووکان هێنایەوە، چونکە هەمیشە قەناعەتم وابووە ئینسان دەبێ لەو شوێنەی کە کاری تێدا دەکا ، مال و مندالیشی لەوێ بێت، بۆ خۆشت لەگەل ئەو پێشمەرگەو خەلکە دابی کە ئیش دەکەن و ئاگات لە واقیعەکەیان بێ، لە موعاناتیان بێ، تێیان بگەیی و لێت تێبگەن و بتوانی لە نزیکەوە ئاراستەیان بکەیت.

لە سالی ١٩٨٧ بە مامۆستا مەلا عوسمانم گوت: ئەوە بۆ خۆت دەزانی خەلکێک لە ناوچەی ئێمە لەسەر من وەستاون و بەمنەوە پەیوەستن، من ئەوە بەیعەتت پێدەدەم کە کاربکەین بۆ ئیسلام، کار

بکەین بۆ میللەت لەژێر ئالاو بەیداغی ئیسلامیدا، دیارە ئەویش زۆر زۆری پێخۆشبوو. ئەوکاتە گەڕامەوە بۆ ناوچەی بناری قەندیل کە لەوێ بنکەو بارەگامان دانابوو، ئێمە پێش ئەوەی بەیعەتی مامۆستا بکەین، بارەگامان دانابوون.

**ناو گۆڕینەکە چۆن بوو بە بڕیاربوو، یا کۆنفرانستان بەست؟**

- ئەوەش پێویستی بە تەفاسیلێکە، بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی کە گۆڕدرا بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی، هەر لەسەرەتاوە بەو شێوەیەنە بووە بلێی حیزبێکی رێکخراوەیی بەسەروبەرو تۆکمەو توندوتۆڵ و کۆنفرانس و کۆنگرەی لە جێی خۆیدا بووبێ.. من پێشنیارم کردبوو، مامۆستایان و کادیران و هەموویان زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆبوونەوەو ناوەکەیان گۆڕیبوو.

**بە پێی ئەو نزیکیەت لە بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی، رۆڵی ئێران لە دامەزراندنیدا چی بوو؟**

- لەسەرەتای دامەزراندنیەوە ئێران رۆڵی نەبوو، چونکە وەک گوتم لە (١٩٧٨)ەوە هەبوو، ئەوکاتە من لە پۆلی پێنج و شەشی ئامادەیی بووم، هێشتا شۆڕشی ئیسلامی ئێران نەکرابوو، ئەوەی وای لەمن و مامۆستاو کۆمەڵێک خەڵک کرد بیر لە دروستکردنی بکەینەوە ئەو بۆشاییە سیاسیە بوو کە لە دوای شکستی شۆڕشی ئەیلول دروستبوبوو، هەروەها ئەو زوڵمەی بەعس لە کوردی دەکرد، بەڵام دواتر بە دڵنیاییەوە وەک چۆن هاوکاری پارتی و یەکێتی کرد،

هاوکاری پەیوەندی ئیسلامی و دواتر بزووتنەوەی ئیسلامیشی کردووە.

**رەنگە هی بزووتنەوە زیاتر بێ لەبەر ئەوەی حەرەکەیەکی ئیسلامی بووە؟**

- نەخێر، هی پارتی و یەکێتی زیاتربووە، واقیعەو پێچەوانەوە ناکرێتەوە.. راستە ئێمە بزووتنەوەیەکی ئیسلامی بووینە، بەڵام کۆماری ئیسلامی ئێران کۆمەڵێک سیاسەت و بەرژەوەندی خۆی هەیە، لەوانەیە ئێمە نەمانتوانیبێ بەرژەوەندییەکانی ئەوان بهێنینەدی. باشتێکت بۆ بگێڕمەوە، لە ساڵی ١٩٨٧ یەکەم سەفەرم بوو، ئێمە بارەگایەکمان لە قەڵاتوکان لە بناری قەندیل دانابوو، لەیادمە لێپرساوی قەرارگای رەمەزان کە ناوی زولقەدربوو کە ئێستا بەرپرسێکی پایە بڵندە لە کۆماری ئیسلامی، لەوێ بوو، مامۆستا مەلا عوسمان و کۆمەڵێک مامۆستای دیکەش لەوێ بوون، منیش ئەوکاتە فەرماندەی هێزی حەمزە بووم، ئەندامی سەرکردایەتیش بووم، لەوێ مامۆستا مەلا عوسمان فەرمووی فلان کەس تۆ دەتەوێ بچیە قەڵاتوکان و لەوێ بارەگاتان داناوە، ئەوە ئاغای ذوالقدر داوا دەکا هەندێ پاسدار لەگەڵ خۆتان بۆ ئەوێ بەرن، منیش گوتم جا مامۆستا ئێمە جارێ هیچمان بۆ ئەو میللەتە نەکردووە، چۆن دەبێ هەر لەرێوە پاسداران لەگەڵ خۆم بەرم، ئەوە بە کەڵک نایێت، ئاغای (ذوالقدر)یش گوتی ئاخر چۆن دەبێ پارتی و یەکێتی بۆ کۆماری

ئیسلامی لە ئێوە دڵسۆزترین، ئەوان پاسداریان بردووە، جا بەراستیش

برادەرانی پارتی پاسداریان بردبووە ئەو سەری دنیایێ، یەکێتی

بردبوویانە ئەو سەری دنیایێ، منیش گوتم ئەوجا هەر کەسە بە عەقڵی

خۆی بەڕێوە دەچێ، دوایی برادەرانی پارتی و یەکێتی خەباتیان

کردووەو رۆڵێکیان بینیوەو خەڵک دەیانناسێ، بەس ئێمە جارێ

چیمان نەکردووە، بسم الله پاسداران لەگەڵ خۆم ببەم، بە کەڵک

نابێ. بووە مشتومڕمان، مامۆستا مەلا عوسمان گوتی جامن دەڵێم

بیبەو ئەویش تەبعەن رابەربوو، منیش گوتم ئاخر مامۆستا من

شارەزای ناوچەکەم، دەزانم بە کەڵک نابێت، نەچوومە ژێربار، دوایی

ذوالقدر گوتی ئاخر چۆن پاسدار لەگەڵ خۆت نابەی، ئەوە رابەرتانەو

دەڵێ بیبە، من گوتم راستە ئەو رابەرە، بەڵام من دەزانم واقیعەکە بە

کەڵک نابێت. وەڵڵا دیاربوو ئەویش لەگەڵم کەوتە مشتومڕ، منیش

تۆزێ فارسیم دەزانی، گوتی ئاخر چۆن نابەی، گوتم لەتکە

پاسدارێکیش نابەم، ئیتر ئەو تووڕەبوو گوتی ئەوەتەو هینە بە کۆماری

ئیسلامی، چونکە خۆ پاسدار لەت ناکرێ، گوتم دیارە جەنابت

زانستی بەلاغەتت نەخوێندووە، ئەگەرنا وەختێک شتێک

دەبەسترێتەوە بە شتێکی مەحاڵەوە، یانی ئەو شتە ناکەم، ئەگەرنا

مەبەستم تەوهین نییە، گوتی باشە ئاخر ئەگەر تۆ پاسدار نەبەی،

ئێمەش چەکتان نادەینێ، منیش گوتم جا چەکی ئێوەمان ناوێ،

چەکمان هەیەو لەسەر پێی خۆمان دادەنیشین، ئێمە بڕیارمان داوە

خەبات بکەین دژی بەعس و بەرگری لە میللەتی خۆمان دەکەین، هاوکاریمان دەکەن سوپاستان دەکەین، پێ گەشە دەکەین، بەڵام هاوکاریمان ناکەن، ئێمە کاری خۆمان هەر دەکەین، بەقەدەر توانای خۆمان. ئیتر پاسدارم نەبرد، هەڵبەت چەکەکانیشمان وەرنەگرت، بەڵام ئەوان هاوکاری بزووتنەوەی ئیسلامیان دەکرد، وەک چۆن هاوکاری پارتی و یەکێتیان دەکرد، چونکە بەرژەوەندی خۆشیان لەوەدابوو، ئەوان لەگەڵ رژێم شەریان بوو، ئێ نالێن دوژمنی دوژمنم دۆستە.

**ئەوکاتە بۆچی هەوڵتان نەدا ئیخوان بهێننە ژێر باڵی خۆتان لەکاتێکدا ئێوە بزووتنەوەیەکی چەکداری بوون، ئەوان تەنها لە ئێران دابوون، لەناو ئۆردوگاکانی ئێراندا بوون، لەناو ئاوارەکان؟**

- هەوڵماندا، هەندێکیش لەو برایانەی کە هاتبوونە نێو بزووتنەوەی ئیسلامی برایانی ئیخوان بوون، کاک حاجی قاسم و خەڵکی دیکە هەیە ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامیە، کاتی خۆی برایانی ئیخوان بوو، خەڵکی دیکەشمان هەبوو، بزووتنەوەی ئیسلامیمان لەکێ پێکهێنا، لەو گەنج و خوێندەوارو خەڵکە موسڵمان و ئیسلامیەی کە شتێک لە ئیسلام حاڵی ببوو، بەڵام دیارە هەموویان نەهاتن، ئەوان دیارە رایەکی دیکەیان هەبوو، پێیانوابوو چەک هەڵگرتن باش نییە، ئەوەش پێموایە زیاتر تەوجیهاتی مەکتەبی ئیرشادیان بوو، بۆیە من دەڵێم شتێک هەڵقولاوی واقیعی ئەو شوێنە نەبێ، بە ئیجتیهادی خەڵکی ئەو شوێنە بەرێوە نەچێ، هەرچۆن بێ،

شتی تێدەکەوێ، چونکە پێموایە ئێستا برایانی یەکگرتووی ئیسلامی بۆ ئەوکاتی پەشیمانن، کە ئەگەر بەشدارییان کردبا لە خەباتی رزگاری نەتەوەکەیان بە تەئکید ئێستا پارتی و یەکێتی پێیاننە دەگوتن بوونەتە حازرخۆری بەر سێبەرێ، چونکە ئێستا زۆرجار وادەڵێن، هەڵبەتە من ئەوەشم پێ هەڵەیە، بڵێی هەرچی دوێنێ تەقەی نەکردبێ لە شاخی، ئەورۆ نابێ نانی بخوا لە شاری، مەبەستم ئەوەیە ئەوان ئێستا پەشیمانن بۆ ئەوکاتی، ئەگەر ئەوکاتی چوار تەقەیان بکردبا، وەکو ئێستا ئێمە درێژە پێدەری بزووتنەوەی ئیسلامین، دەیانگوت کاکە ئێمەش بەشداربووین، مادام لە ناخۆشیەکانیش بەشداربووین، با لە خۆشیەکانیش بەشداربین، هەرچەندە ئێمە لە خۆشیەکان مەحرومین.

**راستە مەلا کرێکار لە ۱۹۸۷ لە پاکستان بوو، کە لە ساڵی ۱۹۸۸ هاتەوە چووە ناو بزووتنەوەو یەکسەر کرا بە ئەندامی ناوەندی شوورا؟!**

- بەڵێ وابوو، پێشتر لە پاکستان بوو.

**پێشتر بۆ خوێندنی ئایینی چووبووە پاکستان یان کاری دیکە؟**

- قاچاخ بووە لە رژێم، وەکو زۆر خەڵکی دیکە چووبووە پاکستان، ماوەیەک لە ئێران بوو، دوایی چووبووە پاکستان، زیاتر رەنگە بۆ خوێندن چووبێت، ئینجا دوایی لە ۱۹۸۸ هاتەوە ناو بزووتنەوە.

**دەڵێن لە ۱۹۸۸ هاتەوە بووە ئەندامی سەرکردایەتی لە بزووتنەوە،**

**بەڵام پێش ڕاپەڕین جیابیۆوە گرووپەکی دروستکردبوو بەناوی الجماعە الاسلامیە و دواتر لە پایزی ١٩٩١ هاتەوە ناو بزووتنەوە؟**

- من هێنامەوە ناو بزووتنەوە.

**بۆچی جیابیۆوە؟**

- ئێمە زۆربەمان هەر لەسەرەتاوە تێبینیمان هەبوو لەسەر هەڵسوکەوتی هەندێک لە سەرکردەکانی ئەوسای بزووتنەوەی ئیسلامی، بەتایبەتی مامۆستا مەلا عەلی و ئەوانە، جا ئەویش وەکو ئێمە تێبینی هەبوو، بەس ئەو پێیوابوو بەوە چارەسەر دەکرێ، شتێک جیاکاتەوە، من پێمواببوو دەبێ خەڵک تێبگەیەنرێ و شتەکە لەنێوخۆدا چارەسەر بکرێ، نەک بە لێکجیابوونەوە، ئەوەبوو ماوەیەک جیابۆوە کە مانگێک یا زیاتری خایاند.

**دەبێ زیاتر بێ، چونکە لە پایزی ١٩٩١ هاتەوە ناو بزووتنەوە؟**

- ئا، ئەوەبوو من چووم، ئەوکاتە لە قەزای سۆران بوو، لەوێ سەربازگەیەکیان هەبوو، چووم قسەم لەگەڵ کردن و هێناومەوە ناو بزووتنەوە.

**بەڵام هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەدەن کە عومەر عەبدولڕەحمان ئەمیری جەماعەی ئیسلامیەی میسر دەوری هەبووە لە هێنانەوەی مەلا کرێکار بۆ ناو بزووتنەوە؟**

- هیچ ئەسل و ئەساسی نییە، ئەو هەر لەوێ نەبوو.

**ڕەنگە بە ئیتسالات؟**

– نەمزانیوە ، چونکە من چووم، قسەم لەگەڵ خۆی کردو رازیم کرد کە بێتەوە ناو بزووتنەوەی ئیسلامی و ئەو شتە واز لێبێنێ، ئەوەبوو دوایی کردمان بە مەسئولی مەکتەبی عەسکەری.

**لە هەڵبژاردنی ١٩٩٢ مەلا عوسمان خۆی هەڵبژارد بۆ رابەری، لە کاتێکدا تەسەور دەکرا کە مەلا عوسمان دەرناچێ لەبەر ئەوەی کاک مەسعودو مام جەلال سەرۆکی دوو حیزبی زلهێزن لەرووی جەماوەری و لەرووی دەنگدانەوە، ئەگەر دەریچن یەکێک لەوانە دەردەچن، ئایا ئەوە لەژێر گوشاری ئێران بوو یان لەژێر فشاری سەرکردایەتی بوو، یا هەر بریارێکی تاکرەوانە بوو؟**

– پێموایە زیاتر لەرووی ناواقیعبینی مامۆستا خۆیی و، هێندێک لە خەڵکی دەوروبەری خۆی بوو، من یەکێک بووم لەوانەی رای پێچەوانەم هەبوو، دەمگوت شتێکی راست نییە، با رەئی بۆ کەس نەدەین ئەگەر قەناعەتمان بە کەس نییە ببێتە رابەر، بەڵام تاریکەشەو سەر لە ئێوارە دیارە، تۆ کە دەزانی دەرناچی، بۆچی خۆت هەڵدەبژێری، ئەوە بۆ ئێمە دەبێتە جۆرێک لە شکست و هاتنەدواوە، بۆیە من لەگەڵ نەبووم، بەڵام دیاربوو مامۆستا قەناعەتی وابوو، یان هێندێ خەڵک رایان وابوو، چونکە مامۆستا هێندێ شتی دەکرد شەرت نەبوو بە قەناعەتی خۆی بێ، رەنگە هێندێ خەڵکی دەوروبەر وایان پێ چاک بووبێ، یاخود رەنگە تێروانینیشیان وا بووبێ کە لەوانەیە مامۆستا دەنگ بێنێ.

**واته به زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی یا کەمینەی ئەندامانی سەرکردایەتی نەبوو؟**

- نەخێر ئەوەنەبوو، بەڵام من لەگەڵ نەبووم، لە یادمە گوتم بە شتێکی دروستی نازانم نەک لە رووی شەرعیەوە، بەڵکو لەرووی ئەوەی کە ئامانج بەدەستناهێنێ.

**لە هەڵبژاردنی ئەوکات ئیخوان کە هێشتا نەبووبونە حیزب، یەکگرتوو دروست نەببوو، ئەوان لەگەڵ ئێوە بەشداریان کرد، ئەو دەنگەی هێناتان هی هەردوولاتان بوو، ئەو دەنگهێنانە وایکرد بزووتنەوە کە هەست دەکرا دوای راپەڕین زیاتر بەرەو توندڕەوی دەچوون، وەکو بڵێی حیسابی بۆ یاسا نەدەکرد، بە ئارەزووی خۆی دەجوولایەوە، وەک چۆن پارتی و یەکێتی حیساب بۆ یەکتر نەدەکرد، ئەویش دەیویست حیسابیان بۆ هەردووکیان نەکا، ئەوە لەبەر ئەوەنەبوو کە دەنگی لە حیزبە بچوکەکان زیاتر هێنابوو، بۆیە وایدەکرد؟**

- پێموانییە لەوەوەبووبێ، رەنگە زیاتر لەوەوەبووبێ ئەوکاتە بزووتنەوەی ئیسلامی وەکو گوتم لەسەرەتاوە چونکە بەشێوەیەکی رێکخراوی توندوتۆڵ و تۆکمەو بەرچاوڕوون بنیات نەنرابوو، زیاتر تەجەموعێک بوو، من ئەوکات کتێبم دەنووسی، یەکێک لە کتێبەکان دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو، بە راشکاوی دەمگوت بزووتنەوەی ئیسلامی تەجەموعێکی ئیسلامیە، کۆمەڵە خەڵکێک

کۆبوونەوەتە سەربەک، بەڵام کۆمەڵێک پرەنسیپ و مەفاهیمی ئەساسی بۆ هەر ڕێکخراوو حیزبێک پێویستە لەسەری کۆ بن، ئێمە لەسەر ئەوە کۆ نەبووین کۆمەڵێک تێڕوانین و تێگەیشتنی دژ بەیەک و لێکجیا هەیە دەربارەی هێندێ مەسائل کە پێویستە یەکبخرێ.

**واتە وەحدەیەکی مونسەجیم نەبوو؟**

- وەحدەی فیکری نەبوو...

**ڕەنگە سیاسیش نەبووبێ؟**

- جا ئەگەر فکری نەبوو، سیاسەت لەسەر فیکر بنیات دەنرێ.

**لەشەڕی بزووتنەوە و یەکێتی دا پاڵنەرێکی دەرەکی نەبوو کە ئەو شەڕە لەگەڵ یەکێتی دروست بێ مەبەستم ئەوەبوو پشتگیرییەکی ماددی و مەعنەوی هەبوو بۆ بزووتنەوە، چونکە بە ڕاستی دەزانرا شەڕەکە دۆڕاوە، لەبەر ئەوەی بزووتنەوە دەرحەقی یەکێتی نایەت ئێوە تەسەورتان دەکرد پاڵپشتییەکی ماددی و مەعنەوی گەورەتان لە پشتە، یا حزبێک پشتگیریتان دەکا بۆیە شەڕتان کرد یا هەر شەڕەکە دروست بوو بۆ خۆی؟**

- ئەوە کاتێک ئەو پرسیارە دەبێ بکرێ کە تۆ شەڕت کردبێ، بەڵام کە شەڕت پێ فرۆشرابێ، ناڵێن ئەو شەڕەت چۆن کرد، چونکە شەڕەکەی پێ فرۆشراوە. ئێمە زنجیرە گرژی و تێکهەڵچوونێکمان ببوو لەگەڵ یەکێتی، هەڵبەت پێشبینی ئەوەم کرد، ئەوکاتی یەکێتی و پارتی بۆ یەک دەستیان لەسەر پەلەپیتکە بوو، پێشبینی ئەوە دەکرا

تێکهەڵبژێن. من هەمیشە بە برایانی خۆمان و بە مامۆستا مەلا عوسمانم دەگوت، با دان بەخۆدابگرین و ئەو شەڕەی کە بە نیازە لە نێوان پارتی و یەکێتیدا بکرێ با نەئاڵێنرێتە ئێمە. ڕۆژێک ٥ برای ئێمە بە بازگەی کفری دادەچن، یەکێتی تەقەیان لێ دەکاو ئەوەبوو کە کوژران (جا من بەهی خۆمان و غەیری خۆمان دەڵێم کوژران، چونکە لە قورئاندا استشهد نەهاتووە هەر کوژرا هاتووە). جەنازەی یەکێ لەو برایانە هێنرایەوە بۆ ڕانیە، مامۆستا مەلا عوسمان بڕیاریدا کە دەبێ ئەو جەنازەیە بە مەراسیمەوە بنێژرێ، دەبێ خۆپیشاندانی بۆ بکرێ بەناو بازاڕی ڕانیەداو بچینە سەر گۆڕستان، من ئەوکاتە خولێکم کردبۆوە لە ڕانیە لەسەر ئەشکەوتانەوە دەهاتم، کە ئەوکاتە سەرکردایەتیمان لەوێ بوو، مامۆستا مەلا عوسمانیش لەوێ بوو، دەهاتم لەوێ ڕۆژانە دەرسەکەم دەگوتەوەو دەچومەوەسەر ئەشکەوتان.
من موخالیفی ئەوەبووم، گوتم کاکە گیان با ئەو جەنازەیە بە مەراسیمەوە نەنێژرێ، یەکەم شتێکی بیدعەتە، دوو هیچ بەرژەوەندییەکی تێدانییە، سێ جۆرێکە لە (استعطاف)و خۆ بە لاواز زانین و شتێکی شەرعی نییەو شتێکی سیاسیانەو دووربینانەش نییە، پاشان پارتی و یەکێتی بۆ یەک دەستیان لەسەرە پەلەپیتکەیە، ئەوە شەڕە بۆ بیئاڵێنینە ئەستۆی خۆمان و شانەکەی لەسەری ئێمەدا بشکێ، ئەوەبوو برایان گوتیان ئاخر مامۆستا مەلا عوسمان فتوای داوەو لەسەر تەلەفزیۆن ئیعلانکراوەو گوتم کاکە وەڵلاییی با فتواشی

دابێ هەڵەیە، بانەکرێ دوایی پەشیمان دەبینەوە، دیارە زیاتر ڕەئیان وابوو، ئەوەی بە قسەی منی کرد نەچوو، چوون جەنازەکەیان بردە بازاڕ، ئەوەبوو لەبەردەمی کۆمیتەی یەکێتی کۆمەڵێک هوتافیان کێشابوو، کاک خدر کۆساری بەرەحمەتبێ شیعری گوتبوو، حەماسەتی خەڵکەکەش جولابوو، لەو ناوەندەو لەمیانی ئەوەشدا تەقەیەک کرابوو، ئایا لە کۆمیتە کرابوو، لە کوێ کرابوو، گرنگ تەقەیەک کرابوو، پاسەوانەکانی کۆمیتەی یەکێتیش تەقەیان کردبوو، ئایا لە خەڵکی ئێمەیان کردبوو، یان لە ترسی خۆیان بە حەوایان وەنابوو، بەڵام گوتیان خەڵکی یەکێتی چووبوونە ناو کۆمیتە بۆ ئەوەی تووشی شەڕ نەبن، بەراستیش جەماعەتی یەکێتی پێش مەراسیمەکە هاتنە لای من، گوتیان مامۆستا ئێمە لەگەڵ برادەرانی پارتی نێوانمان تەواونییە، پێمان خۆش نییە لەگەڵ ئێوە تووشی شەڕبین، دەزانین زوڵمێکە لێتانکراوە، کاکە چی ئیجرائاتە دەیکەین، بەڵام با ئەوە نەبێ، گوتم من ڕەئیم نییە ئەو خۆپیشاندانە بکرێ بەڵام مامۆستا عوسمان وای بڕیارداوەو پێشم هەڵەیە، گوتیان باشە مادام مەیبەنە بەردەم کۆمیتە، با خەڵکێک فیتنەیەک دروست نەکات. گوتم باشە، بڕیاریش بوو نەچن بۆ ئەوێ، ئیدی بەهەرحاڵ دوای ئەوەبوو کەبوو، لە ڕاستیدا یەکێتی لەوێ نەیدەویست ئەو شەڕە ببێ، چونکە یەکێتی لەوێ بەنسبەت لاوازبوون، منیش نەمدەویست، مەرج نییە برایانی دیکەمان ویستبێیان، بەڵام تەقدیرەکەیان هەڵە بوو، پێیانوابوو هیچ

نابێ، ئەوەبوو کە شت بوو.. هەرچەندە دوایی زیاتر باسی من دەکرا لە شەڕوشۆڕەکان، بەڵام ئەوە ئەسل و ئەساسی نییە، یەکێتی زۆرباش ئەمە دەزانن، دوای ئەوەش کە ئەوەکرا کاک قادر لەگەڵ ئەحمەد شەریف هاتن لەماڵی ئەنوەر بەگی بێتواتە لەسەروچاوە، لەگەڵیان دانیشتم و گەیشتینە رێککەوتنێکیش، یەکێتی داواکارییان ئەوەبوو گوتیان رەدی ئیعتبارمان بۆ بکەن، کۆمیتەمان چۆڵ بکەن، کۆمیتەی رانیەو چوار قورنەیان گیرابوو، گوتیان با هێزەکانی ئێوە بچنە دەرەوەی شار وەکو رەدی ئیعتبارێک، با شتەکە پێکبێنین، گوتم باشە، چونکە من دەمزانی شەڕمان لەگەڵ یەکێتی پێ ناکرێ و شەڕێکی بێ ئەنجامە، گەیشتینە رێککەوتنیش، بەڵام وادیاربوو، یەکێتی بڕیاری خۆی دابوو، چونکە وام هەستکرد. کاک قادرو کاک ئەحمەد شەریف لەگەڵ من گەیشتنە ئەنجام ئەوانیش دەیانویست شەڕ نەبێت، بەڵام وەختی لەکاتی قسەکردندا بووین، بروسکەیەک بۆ کاک ئەحمەد شەریف هات و دوایی کاک ئەحمەد هاتەوە رەنگی گۆڕابوو، وادیاربوو پێیانگوتبوو ئێمە تازە بڕیارمانداوەو سەری خۆت مەیەشێنە، ئەوەبوو دوایی شەڕەکە بوو.

**بەڵام لە نووسراوێکی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیزدا دەڵێ داگیرساندنی ئەو شەڕە بۆ دووکەس دەگەڕێتەوە، مامۆستا عەلی باپیرو دلشاد کەلاری، دەڵێ ئەو دووە بوونە هۆکار بۆ ئەوەی یەکێتی لە ئێمە بدات؟**

- ئەوە قسەیەکە پێویستی بە ئیسپات هەیە.

**لە نووسراوی دیکەش هەندێ جار مامۆستا عەبدولقادر برایەتی تۆمەتبار دەکرا؟**

- مامۆستا عەبدولقادر برایەتی و هێندێک برای دیکە لە رانیەبوون، گوتیان دەبێ بڕیارەکەی مامۆستا مەلا عوسمان جێبەجێ بکرێ، بەڵام ناڵێم ئەوان کڕیاری شەڕبوون، دەڵێم تەقدیرەکەیان هەڵەبوو، من دەمزانی شەڕی لێدەکەوێتەوە، رەنگە ئەوان وایانزانیبێ شەڕی لێناکەوێتەوە، رەنگە وەکو تەنفیسێکیش بۆ خەڵکی خۆمان کە زوڵمان لێکراوەو خەڵکمان لێکوژراوە، ئیجتیهادێکی وایان کردبێ، بەهەرحاڵ هەڵوێستی من ئاوابوو کە باسمکرد، ئیدی جەنابی مامۆستا مەلا عەلی، یان کەسێکی دیکە چۆنی لێکدەداتەوە، ئەگەر قسەیەک دەکا لەسەر یەکێکی دیکە دەبێ ئیسپاتی بکا.

**لە شەڕی بزووتنەوەو یەکێتی، بزووتنەوە لە هەولێر کەمتر خۆی تووشی شەڕ دەکرد، وەکو ناوچەکانی رانیەو پشدەرو هەندێک شوێنی دیکە نەبوو، ئێوە ئەو تێبینیەتان لەسەر مەڵبەندی هەولێر هەبوو؟**

- راستە ئەوکاتە رەنگە هێندێک بەرپرسی لێبێت زۆر نەیانویستبێ، ئەوەیەک، دوو، هەولێر وەک بڵێی شانۆی رووداوەکان نەبوو، زیاتر ناوچەی پشدەرو بیتوێن و گەرمیان شانۆی رووداوەکان بوون و شەڕو پێکدادانیان تیادا گەرم بوو، یەکێتیش زیاتر هێزەکانی بۆ ئەوێ هێنابوو، لە هەولێر یەکێتی بەنسبەت ئێمەوە لە دۆخێکی

لاوازدابوو، ئەمجا خەڵکی ئێمەیان لەوێ بە وتووێژو گفتوگۆ خافلاند، وردە وردە لەشکرکێشیشیان دەکرد بۆ ئەو شوێنانەی کە دەیانویست، واتە لەو شوێنەی مەبەستیان بوو شەڕەکەی لێبکرێ، بەکردەوە شەڕیان گەرم دەکردو لەشکرکێشیان دەکرد، لەو شوێنەش کە دەیانزانی زەرەریانە شەڕی لێبکرێ خەڵکی ئێمەیان بە وتووێژەوە دەخافلان، ئێمە تێبینیمان زۆربوو لەسەر ئەو شتانە.. لە هەڵەبجەش وەکو پێویست شەڕ دەکرا، بەهەرحاڵ بەو شێوەیە رۆیشت، ئەگینا ئەگەر لە هەموو شوێنەکان بەو هێزەی هەمان بوو لەگەڵ یەکێتی شەڕ بکرابا، یەکێتی نەیدەتوانی هێزەکانی خۆی لەسەر سەرکردایەتی کەڵەکە بکات و جەبار فەرمان بێت بڵێ ماموستا خۆت تەسلیم بکە تۆ گیانت پارێزراو دەبێ، چونکە دوونامەی بۆ ماموستا مەلا عوسمان نارد، نامەکان دەهاتنە لای من، چونکە ماموستا لە شاخ بوو، من سەرپەرشتی ئیشەکانم دەکرد، لەبەر ئەوە ماموستا بە تەمەن بوو منی کردبووە وەکیلی خۆی، ئەوکات دەیانگوت فلان کەس هەموو ئیشەکانی گرتەدەست خۆی، بەڵام ماموستا بەمنی گوت کە من دەچمە شاخ لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی تۆپباران دەکرا، تۆ سەرپەرشتی ئیشەکان بکە، من فەرمانی ماموستام جێبەجێ دەکرد، ئەگینا دەمویست شەڕەکە نەکرێ، بەڵام تازە هاتبووە پێش.

**لەو شەڕەدا، هەڵەبجە شوێنێکی سەرەکی بزووتنەوەبوو، واتە بارەگایەکی زۆرو چەکدارێکی زۆری لێبوو، کەچی زۆرجار مەلا عەلی**

**کە ئەوکات بەرپرسی مەڵبەندی هەولێر بوو، یان کادیرێکی دیکە، نەیدەتوانی لە هەولێر بێتە هەڵەبجە، واتە تووشی ئیشکالیەتێک ببوون و وەزعێکی سیاسی دروستببوو بەسەر مەلا عەنیدا، ماوەیەکیش ئەو وەزعە بەردەوام بو ئێوە وەکو بزووتنەوە و هیچ رەئیەکتان نەبوو لەوەی یان مەلا غەنی بکێشنەوەو بیبەنە هەڵەبجە، یان هەڵوێستان لەسەر هەڵسوکەوتی هەبێ؟**

- ئێمە لەسەر زۆرشتان تێبینیمان هەبوو، ئەو تێبینیانەبوو وایکرد دواتر کۆمەڵی ئیسلامی رابگەیەنین، جا کاک مەلا غەنی بەشێک بووە لە تێبینیەکانمان، مامۆستا مەلا عەلی و کورەکانی و شتی دیکەو هەڵوێستی سیاسی و فیکری و پەیوەندیەکانمان کە زیاتر شەخسی بوون، نەک، ئەوانەو زۆر تێبینی دیکەمان هەبوو.

**بۆچی ئەو تێبینیانە نە دەگەیشتنە چارەسەرێک لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیدا، نەدەکرا بکەنە چارەسەرێک و بزووتنەوە وای بەسەر نەهاتبا؟**

- زۆرمان هەوڵدا نەگەیشتینە ئەنجام لەبەر ئەوەی کەسانێک بەرژەوەندیان لەوەدا بوو کە بارودۆخی بزووتنەوەی ئیسلامی بەو شێوەیە بمێنێتەوە، پێیانوابوو بەو شێوەیە بۆ ئەوان چاکە، ئێمەش دەمانزانی بەم شێوەیە زیان بە پرۆژەی کاری ئیسلامی و سومعەی رەوتی ئیسلامی دەگا، ئەوەبوو سەرەنجام خۆمان، ناچار بینی کە کۆمەڵی ئیسلامی رابگەیەنین، بەو ناوەش ئیعلانی بکەین کە

درێژەپێدەری سەروەرییەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامییە.

**پێشتر راپەڕینی ئیسلامی هەبوو کە درێژبووەوەی ئیخوان موسلمین بوو، لەبەر ئەوەی مامۆستا مەلا سدیق لە ناو ئیخوان بوو دوایی بەهەر شێوەیەک بوو جیابۆوەو راپەڕینی ئیسلامی دروستکرد، کە وەکو بزووتنەوەی ئیسلامی بڕوای بە چەک هەبوو و چەکداریان هەبوو، ئێوە کە ئەوانە بەناوی ئیخوانیش بوون بۆ زوو نەتانتوانی ئیستعابی ئەو بکەن، بەتایبەتی ئەوانە لە خێزانێک بوون وەکو مەلا عوسمان و مەلا عەلی و مەلا سدیق سەرقافلەی ئەو حیزبانە بە خۆیان بوون؟**

- ئێمە لەسەرەتاوە نەمانتوانی بگەینە ئەنجام، رەنگە جیاوازی لە هێندێک بیروبۆچووندا بووبێ، بەڵێ برایانی راپەڕینی ئیسلامی ئەوکات هێندێکیان چەکیان پێ نەبوو، نەک وەکو بزووتنەوەی ئیسلامی چەکداربن، تارادەیەک بیرکردنەوەی ئەوەشیان هەبوو کە پێویستە چەک هەبێت و هێزێک هەبێت، بەڵام پێموایە بەهۆی بەرژەوەندی شەخسییەوە نەگەیشتینە ئەنجام، ئەوە یەک، دوو ئەوکاتە مامۆستا سدیق دەیگوت چۆن من بێمە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیەوە کە کاکەم عەلی بەو شێوەیە دەکا، دوایی تێکدەگیرێین، بۆ نموونە لەیەکێ لە کۆبوونەوەکان مامۆستا مەلا عەلی کە برا گەورەی مامۆستا سدیق بوو، پێیگوت سدیق دەبێ بتوێنەوە لەنێو بزووتنەوەی ئیسلامیدا، مامۆستا سدیقیش بەمنی گوت فلان کەس چاوت لێیە، چونکە من زۆر پێداگیریم دەکرد کە پێویستە بێن و پێکەوەبین، گوتی

ئەوە دەڵێ دەبێ بتوێنەوە، مامۆستا مەلا عەلیش لێی ...بوو، منیش گوتم مامۆستا راستە ئەوە برا بچووکتە، بەڵام ئێوە ئێستا دوو حیزبن، پێم باش نییە بەو شێوازە قسە بکەی، لەولایشەوە بە مامۆستا سدیقم گوت جا بۆ بە باری خراپە تەفسیری دەکەی، بەباری چاکە تەفسیری بکە، گوتی چۆن؟ گوتم کاکە گیان سەتلە ئاوێکت هەیە، مەیلەو گەرمە، قاپە بەفرێکیشت هەیە، ئەو بەفرەی لەو سەتلە ئاوەی دەکەیت، بەفرەکە بە کرۆشتن ناخورێ، ئاوەکەش سارد نییە تابخورێتەوە، بەفرەکە ئاوەکە سارد دەکاو دەشخورێتەوەو هەردوو لاش قازانجیان کردووە، گوتی جا ئەگەر وابێ چاکە، بەڵام ئەو بە جۆرێکی دیکە دەیلێ، مامۆستا مەلا عەلیش گوتی راست دەکا من مەبەستم ئەو مانایەیە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە مامۆستا سدیق لە وەزعەکەی رانەدەبینی، رەنگە هێندێک خەڵکی دیکەشیان هەبووبێ، لەوەزعەکەی رانەدەبینی، دەیانزانی ئێمەش بەدەست مامۆستا مەلا عەلی و دەوروبەری گرفتاریمان هەیە، هەستیان بە موعاناتمان دەکرد، دەیانگوت جا کاکە ئێمەش بۆچی بێین وەک ئێوە گرفتار بین.

**ئەدی لەبەرچی هاتن؟ فشاری دەرەوە نەبوو؟**

– باسی زۆر شت دەکرا، بەڵام من شتێک علمم پێی نەبێ، نایڵێم. باسی ئەوە دەکرا کە کەسایەتی ئیسلامی و خەڵکی دیکە تەوسییەیان کردوون، رەنگە خۆشیان وایان هەست کردبێ وەزعی ماڵی مامۆستا مەلا عەلی لەناو بزووتنەوەدا لاوازە، یان هەستیان کردبێ کە ئەگەر

ئەو دوو بزووتنەوەیە یەک بگرن، ئەوانیش وەکو بنەماڵە قازانج دەکەن، ڕەوتە ئیسلامییەکەش قازانج دەکات.

**- وابزانم ئێوە لە ئایاری ۲۰۰۰ لەگەڵ بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی یەکتانگرت، مەرجێکتان دانا کە دەبێ زوو کۆنگرە بکرێ، ئەوەبوو لە مانگی ئاب کۆنگرە کرا، دەڵێن لە کۆنگرە تۆ لەگەڵ مامۆستا مەلا سدیق تەحالوفێکی ژێراو ژێرتان کرد لە بەرامبەر مەلا عەلی، وابزانم ۳ کەس لەوانەی لەگەڵ مەلا عەلی بوون دەرچوون، ئێوە ۲٦ کەستان دەرچوون، ئەوە وایکرد وردە وردە لێکبترازێنەوە، واتە ئەو تەکەتولە بووە هۆی ئەوەی لە یەکدی داببڕێنەوە.. ئەوە هەقیقەتی تێدایە؟**

- ئەوە ڕاستە، بەڵام نەک لەگەڵ مامۆستا سدیق، ئەو لەگەڵ کاکی خۆی بوو، ئێمە لەگەڵ برایانی دیکەی کە پێشتر ڕاپەڕین بوون لە زۆرشتدا هاوفکربووین، دەمانگوت دەبێ کار بە مەنهەج و بە ڕاوێژبکرێ، دەبێ کوڕەکانی مامۆستا دەست لەکاروبار وەرنەدەن، (بیت المال) بە عەدالەت دابەشبکرێ، دەبێ پەیوەندییەکان، پەیوەندی سیاسی و حیزبی بن، شەخسی نەبن. دەبێ ڕاگەیاندنمان و هەڵوێستەکانمان وابن، واتە لە کۆمەڵێک شتدا هاوڕاو هاوبیربووین، ئەوەبوو ئێمە تەفاهومێکمان لەنێوان خۆماندا کرد، کە کارێکی وا بکەین کەسانی دەوروبەری مامۆستا دەرنەچن ، بەڵام ئێمە لەگەڵ مامۆستا ڕێککەوتبووین کە ئەگەر پابەندبێ بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە

خاتری دەگرین و وەکو رابەر دەیهێڵینەوە، بەمەرجێک پابەندبێ بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە،گوتمان ناتخەینە ناو هەڵبژاردن چونکە دەرناچی، دەریش نەدەچوو، بەڵام بە ئەنجامەکانی کۆنگرە پابەندبە، ئەوەبوو ئەنجامەکانی کۆنگرە بەو شێوەیە بوون کە دەوروبەری مامۆستا دەرنەچوون، مامۆستا سدیق دەرچوو، بەڵام ئەوانی دیکە دەرنەچوون، مامۆستا مەلا عەلیش بە رێککەوتن دامانناببووەوە، ئەوەبوو ٩مانگ مشتومڕمان بوو، هەر پابەندنەبوو بە ئەنجامەکانی کۆنگرەو خۆمان ناچاربووین بڵێین مامۆستا خواحافیزی بێت، ئێمە درێژەپێدەری بزووتنەوەی ئیسلامین، بەڵام ناوەکەی دەگۆڕین بۆ کۆمەڵی ئیسلامی بۆ ئەوەی موکەسەرات و کەموکوڕییەک کە بەناوی بزووتنەوەی ئیسلامیەوە کراوە، ئێمە باجەکەی نەدەین، بۆ ئەوەی لەسەر ناوەکەی نەبێتە شەڕو دەعوامان مامۆستا بڵێ من بزووتنەوەدم و ئێمە بڵێین بزووتنەوەین، کاکە تۆ بزووتنەوەبە، با ناوەکەی لای تۆبێ و ناوەڕۆکەکەش لای ئێمەیە.

**حیسابی ئەوەتان نەدەکرد لە کۆی ٢٩ ئەندامی سەرکردایەتی، ٢٦ کەسی ئێوەبن، بە دڵنیاییەوە جیابوونەوە دروست دەبێ، لەبەر ئەوەی ئەو چۆن رازی دەبێ ٣ کەسی لەگەڵ بێ، واتە نەدەبوو حیسابەکی بۆ بکەن و هاوسەنگییەک هەبێ ئەویش رازی بکەن و خۆشتان رازی بن، نەک بەوشێوە بیسڕنەوە؟**

- ئێمە دوایی بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەوە ئامادەبووین کە هەتا ١٠-

١٢ ئەندام لەوانەی کە کەوتوون مامۆستا بیانهێنێنەوە بۆ شورا، بەڵام ئەو هەر رازی نەبوو، ئێ باشە گوتمان تەنازول لەوەی زیاتر چیت بۆ بکەین؟ بەراستی ئێمە کێشەمان لەوەدابوو مامۆستامان بۆ پابەند نەدەکرا بە شوراو بە بەرنامە، واتە خۆمان ناچاربینیوە کە ئەگەر دەستی مامۆستامان پێ نابەسترێ لەو شتانەی کە بەهەڵەو ناشەرعی دەزانین، با لانی کەم دەستی خۆمان بکەینەوە.

**ئەوکات لە هاوپەیمانیەتەکەتان مەلا کرێکارتان لەگەڵ دابوو، ئەو دەمیش مەلا کرێکار جۆرێک لە توندڕەوی تێدابوو، ئێوە حیسابی ئەوەتن نەدەکرد کە ئەو دەبێتە باڵێکی توندڕەو لەناو بزووتنەوە؟**

- ئێمە وامان بە باش دەزانی کە مامۆستا کرێکار لای خۆمان بێ باشترە، لەوەی کە شتێکی دیکەبێ، چونکە ئەگەر لای خۆمان بێ، زەبتی دەکەین، یان ئەو شتانەی کە ئێمە پێمان هەڵەیە دەستی دەگرین، بەڵام ئەگەر بچێ واقعێکی دیکە بۆ خۆی دروست بکا خراپە، بە کردەوەش دوایی وادەرچوو.

**دەڵێن جەنابتان لەدوای کۆنگرە دوای هەندێک راوێژکردن و خۆ دوورخستنەوە لە ٢٠٠١/٥/٣١ کۆمەڵی ئیسلامیتان راگەیاند، دەڵێن لەو ماوەیەدا دەورێکی ئەساسی لەوەبینرا کە مەلا کرێکاریش بۆ خۆی جیابێتەوەو گرووپێک، یا رێکخراوێک دروست بکا. واتە جیابوونەوەی ئێوە لە بزووتنەوە وای لە مەلا کرێکار کردبێ شتێک بۆخۆی دروست بکات؟**

ئێمه پێش ئەوەی کۆمەڵی ئیسلامی رابگەیەنین، زۆر هەوڵمان لەگەڵ مامۆستا کرێکاردا کە لەگەڵمان بێ، گوتمان رێزت دەگرین، ئەندامی مەکتەبی سیاسیش دەبی، بەڵام عەقڵی نەیبڕی، ئەوەبوو لەگەڵ ئەو جەماعەتی جوندولئیسلام و حەماس و تەوحیدو ئەوانە یەکیان گرت، مامۆستا بۆخۆی پێشتر گرووپێکی هەر هەبوو، ئەوە یەک لەو تێبینیانەبوو کە لەسەریمان هەبوو، من بۆ خۆم کە لەوکاتەی لە بزووتنەوەی ئیسلامیدا کارم دەکرد، بڕوام بەوە نەبوو رێکخستنێکی نهێنی و گرووپی نهێنی دروست بکەم، لەبەر ئەوەی شەرعی نییە، هەتا بڵێی مامۆستا مەلا عوسمان رابەرە، نابێ واقعێکی دیکە لەوێدا دروست بکەی، حیزب داخیلی حیزب، نابێ، وەکو تەیارو تەوژم هەبووین، بەڵام من رێگەم نەدەداو دەمگوت بە شەرعی نازانم من بە رواڵەت مامۆستا مەلا عوسمان بەرابەر بزانم، لەژێرەوەش شتێکی دیکە بکەم، ئەو ئەوشتانەی بە شەرعی دەزانی. بەهەرحاڵ ئێمە نەمانتوانی مامۆستا کرێکار رازی بکەین کە لەگەڵ ئێمەدابێ، ئەوەبوو دواتر بۆخۆی لەگەڵ ئەو چەند گرووپەی دیکە یەکیان گرت و کردیان بە برا گەورەی خۆیان، دوایی هەر بۆ خۆشیان فەسڵیان کرد.

**- ئەوکاتەی ئێوە لە بزووتنەوە جیابوونەوەو هێشتا کۆمەڵتان رانەگەیاندبوو، هێزی دووی سۆران هەبوو، دەڵێن بە پشتگیری تۆ ئاسۆ هەولێری کرا بە فەرماندەی هێزی دووی سۆران.. ئەوە راست بوو؟ واتە جەنابت پشتگیریت کرد تا ببێتە فەرماندەی ئەو هێزە؟**

- کاک ئاسۆ یەکێ بوو لەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵ من بوو کاتێ من لە جەبهەی پشدەر بووم، ئەو هەر فەرماندەی هێزبوو نەک من کردبێتم، پیاوێکی عەسکەری بوو. هەڵبەت ئەوکاتەی لە ناوچەی چۆمان و حاجی ئۆمەران بوو، یەکێ بوو لەو هێزانەی کە لەگەڵ ئێمەدابوو، واتە لەگەڵ ئەو تەیارو تەوژمە بوو کە من نوێنەرایەتیم دەکرد، بەڵام ئەوە مانای ئەوەنییە، من کردبێتم بە فەرماندەی هێزی دووی سۆران، نەخێر هەر بۆ خۆی پیاوێکی عەسکەری بوو، فەرماندەی هێزەکانی ئێمە زیاتر یا پێشمەرگەکان هەڵیاندەبژاردن، یا مەکتەبی عەسکەری دایدەنا، من نایەتە یادم گوتبێتم کە دەبێ کاک ئاسۆ ببێتە فەرماندەی ئەو هێزە، بەڵام دیارە کاک ئاسۆ لەسەرەتاوە وانەبوو، دوایی ئەو جۆرە هەڵسوکەوت و تێڕوانینەیان لا دروست بوو.

**ڕەنگە پەیوەندی شەخسیت لەگەڵ ئاسۆ بەهێز بووبێ؟**

- بەڵێ کاک ئاسۆ هەولێری یەکێ بوو لەو فەرماندانەی کە من خۆشم دەویست،و پیاوێکی ئازاو ئیشکەر بوو، لەناو پێشمەرگەدا خۆشەویست بوو.

**ڕەنگە هەر ئەو کاریگەرییە بێ کە ئێوە جیابوونەوە ئەو ٩ مانگە ئەوان هیچ هەڵوێستێکیان نەبوو نە بەرامبەر ئێوە، نە بەرامبەر بزووتنەوە؟**

- ئەوان ئامادەبوون بێنە گەر ئێمە، بەڵام هەندێک مەرجیان هەبوو، مەرجەکانمان پێ قبوڵ نەدەکرا، هەتا کە خۆشیان ئاشکراکرد بەناوی

جوندولئیسلام، دوایی ئەنساروئیسلام، ئێمە هەر لەگەڵیان خەریک بووین، بەڵام ئەوان هێندێک مەرجیان هەبوو کە بە کەڵک نەدەهاتن، بۆ نموونە یەکێ لە مەرجەکانیان ئەوەبوو دەیانگوت ئەمڕۆ رامانگەیاند بێینە ناو کۆمەڵ، سبەی دەبێ لە یەکێتی بدەین. گوتم ئاخر ئەوە ناکرێ ئێمە رێککەوتنمان هەیە، ئەوە شتێکی راست و رەوانییە، ئێمە دەبێ تەماشا بکەین بەرژەوەندی موسڵمانان و کاری ئیسلامی لەچی دایە، نەک بڵێین هەر وادەکەین زەرەربێ، یا قازانج.

**ئەوکاتەی کە کۆمەڵتان راگەیاند، ئێران هیچ رۆڵێکی هەبوو لە جیابوونەوەتان؟**

- ئێران بە پێچەوانەوە.. هەڵبەت ئێران لە نێوانمان دابوو، لە تاران یەک دووجار لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی و ئەوان لەگەڵمان دانیشتن، ئەوەبوو کە ئێمە قسەی ئێرانیەکانمان دەگرتەوە هەر بۆ ئەوەی ببینەوە یەک، زۆر سووربووین لەسەر ئەوەی ببینەوە یەک، بەڵام مامۆستا مەلا عەلی پێیەوە پابەند نەدەبوو. لە ئەنجامدا بە ئێرانیەکانم گوت کە ئێمە چیتر چاوەڕێ ناکەین، خەڵکەکەمان تووشی دڵساردی و نا ئومێدی دەبێ، ئەگەر مامۆستا مەلا عەلی پابەند نەکەن بەو رێککەوتنانەی لە نێوانماندا کراون، ئێمە ناچارین ئەو واقیعە دەگۆڕین، گوتیان چۆنی دەگۆڕن، گوتم دەیگۆڕین.. ئەوەبوو دوایی کۆمەڵی ئیسلامیمان راگەیاند بەبێ ئەوەی برادەرانی ئێرانی ئاگاداربن، دواتر گلەییان لە ئێمە کرد، هاتن دانیشتن گوتیان ئێمە سنورەکان دادەخەین، مامەڵەتان

لەگەڵ ناکەین، لەبەر ئەوەی ئێوە کارێکتان کردووە بەبێ ئاگاداری ئێمە، دوایی بەرپرسێکی پایەبەرزیان هات، سێ چوار لێپرسراوی دیکەشی لەگەڵدا بوو، لە ئەحمەد ئاوا لەگەڵم دانیشتن، گوتیان بەس ناوەکەی بگۆڕن و بیکەنەوە بە بزووتنەوەی ئیسلامی، ئێمە مامۆستا مەلا عەلی و کوڕەکانی دەبەین بۆ ئەودیوو ئێمە رازی نەبووین، گوتی ئێمە پشتگیریتان دەکەین بەس ناوەکەی بگۆڕن، لەبەر ئەوەی ماوەیەک لەو ناوە (بزووتنەوەی ئیسلامی) کۆمەڵێک پەیوەندیمان هەبووە، گوتم نەخێر ئێمە تازە بڕیارماندااوەو ناوی کۆمەڵی ئیسلامیمان لەخۆ ناوە، گوتم ئەمڕۆ ناوەکەی بە قسەی ئێوە بگۆڕین، سبەی بە قسەی یەکێکی دیکە ناوەڕۆکەکەشی دەگۆڕین، ئیتر گوتیان ئاخر ئێمە نیگەرانین و هاوکاریتان ناکەین، گوتم کەیفی خۆتانە. دوایی لە راستیدا کە کۆمەڵی ئیسلامی بوو بە ئەمری واقیع، ئینجا ئەوان هاتن و مەکتەبیشمان لە تاران کردەوەو بۆیان دەرکەوت کە خەڵکەکە هەمووی لەگەڵ ئێمەبوو. واتە بە پێچەوانەوە ئێران رۆڵی لە جیابوونەوەی ئێمە نەبوو، هەتا مام جەلال گوتی بۆ زانیاریت برادەرانی ئێران لە ئێوە نیگەرانن، ئێمە یەکێ لەوشتانە کە وامان لێ دەکا متمانەمان بە ئێوەبێ، ئەوەیە برادەرانی ئێرانی لێتان نیگەرانن، لەبەر ئەوە دەزانین ئێوە خەڵکێکن پشتتان نییەو ئەوشتانە، هەتا ئەمجارەش کە لە سجن هاتمەوە، گوتی فلان کەس، فلان کەسیش گیرا بەڵام چەند رۆژێک مایەوە لەبەر ئەوەی کە فلان دەوڵەوت بەرگری

لێدەکرد، بەڵام دیارە جەنابت بەس سەر بەخوا بوویت.

**- ئەوکاتەی لە ساڵی١٩٩٦ حەوت پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی ئێرانتان تەسلیمی ئێران کردەوە، هەڵوێستت چی بوو؟**

- ئەوکاتە هەر ئاگامان لێ نەبوو، ئەو شتە لەلای ماڵی مامۆستا مەلا عەلی ئەنجامدرا، بە دانپێدانانی برادەرانی ئێرانی خۆیان، ئێمە زۆر گلەییمان کرد، بەڵام دیارە ئینکاری کرا گوتیان ئێمە ئاگامان لێی نییە، ئەوە هەڵسوکەوتێکی شەخسیە، گومان ئەوە کاریگەری خراپی لەسەر ئێمە دەبێ، چونکە ئێمە پێشتر شتی وامان نەکردووە ئەوانی دی کردبوویان، بەڵام ئێمە نەمانکردبوو.

**بزووتنەوە زۆر لە نووسینەکانی سەید قوتبیان تەرجەمە دەکرد، ئەو بڵاوکراوانەو کەسایەتیە توندڕەوەکانی ناو بزووتنەوە، هۆکارێک نەبوون بۆ ئەوەی ئەو گرووپە توندڕەوانە دروست ببن؟**

- ڕەنگە کاریگەرییان بووبی، بەڵام من دەڵێم ئەگەر ئەو شتانە کاریگەرییان هەبووایە، دەبوو هەموو بزووتنەوەی ئیسلامی وای لێبێت.. ئەوە تۆزێک کاریگەری بووە، هەندێک نامیلکەی فۆتۆکۆپیکراو کاریگەری بووە، سەفەری هەندێ لەو نەفەرانەی کە دوایی ئەو شتانەیان دروستکرد بۆ هەندێ لە وڵاتان و پەیوەندییان بە هەندێ خەڵکەوە، خوێندنەوەی فەتوانامەو نامیلکەو کتێبی هەندێ خەڵک، کە لە هەندێ وڵات دانیشتوون و بۆ خۆیان بە ئیسراحەت فەتوایان بۆ خەڵکی کوردستان دەردەکرد، ئەمانە هەمووی بەسەریەکەوە

کـــاریگەریـیـــان هەبوو، هەروەها حـــاڵەتی نەفـــسی و هەست بە مەزلوومیەت کردنیش کاریگەری هەبوو، بۆچی ئەو گروپانە زۆربەی خەڵکی هەولێرن، چونکە لەوێ زیاتر فشار هەبوو، ئێستاش هەروایە، دەرگای مزگەوتەکان دادەخران، مەلاکان بێدەنگ دەکران، خەڵک دەگیران، لە کوێش فشار زۆربوو، خەڵک بیر لە شتێ دەکاتەوە چۆن ئەو فشارە لەسەر خۆی لابەرێ. هەروەها هاندێ کەس هەر کەیفی بە توندی دێت، هیچ پەیوەندی بە موسڵمانێتی و کافریەتیەوە نییە، خەڵکی نەسرانی هەیە، یەهودی هەیە توندوتیژە، ئێستا عەلمانی توندڕەوی واهەیە دەڵێ نابێ حیزبی ئیسلامی هەبێ، دەیەوێ لە وڵاتێکی موسڵماندا لایەنێکی ئیسلامی قەدەغە بکات. ئێ کاکە خۆماڵ لە ماڵخۆ حەرام نییە، لە وڵاتی موسڵمانیشن بۆ حیزبی ئیسلامی نەبێ.. دوای ئەوە من بڕوام بە هەموو مافێکی میللەتەکەم هەیە، بۆ هەموو خێرو خۆشیەکی لەگەڵیدام، بۆ هەموو بەرگری لێکردنێک لەگەڵ دام، لە تۆ زیاتر بڕوام بە پێشەسازی و بەرەوپێشبردنی زانست هەیە، ئیتر بۆ نەبم کاکە ئێ ئەوە توندڕەوی نییە؟

**هێزی دووی سۆران دوایی کە بووە جوندولئیسلام و مەلا کرێکار گرووپێکی هەبوو کە جۆرە رێکخستنێک بوو ناوی باڵی ئیسلاح بوو، ئەوکاتەی هەوڵیاندا لەگەڵ جوندولئیسلام یەکبگرن، ئێوە هەوڵتان نەدا مەلا کرێکار لەگەڵ جوند نەبێتەیەک؟**

- با ، ئێمه نەک پێش ئەوەی ببێتە جوند ، زۆر پێشترو دواتریش ئەو کاتەی کە مامۆستا کرێکار بەرپرسی ئەنساریش بوو هەولمان لەگەلدا ، لەگەل ئەوانی دیکەش خەریک بووین ، ئامۆژگاریم دەکردن ، چونکە ئەوانە هەموویان پێشمەرگەی خۆمان بوون ، جگە لە مامۆستا کرێکار هیچیان خەلکی قیادی نەبوون ، کاک ئاسۆش ماوەیەک ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوە بوو ، بەلام دوایی لە کۆنگرە دەرنەچوو . . هەموویان پێشمەرگەی گەنج بوون ، تازە پێدەگەیشتن کە ئەوە یەکێک لە خالە لاوازەکانیان بوو ، کەم ئەزموون بوون ، دەرکی واقیعە سیاسیەکەی کوردستانیان باش نەکردبوو .

**بەلام دەلێن هۆی دوورکەوتنەوەی مەلا کرێکار لە بزووتنەوەو چوونی بۆ ناو جوندلئیسلام زیاتر کۆمەلی ئیسلام بووە ، لەبەر ئەوەی جارێک رێگە لە نوێنەری مەلا کرێکار گیرابوو کە وتاری رۆژی هەینی بخوێنێتەوە کە هەموو رۆژانی هەینی لە مزگەوتی جیهاد ، لە ٢٠٠ / ٨/٣ جارێکی دیکەش رێگەی هاتوچۆی گولپ لە مەلا کرێکار قەدەغەکرابوو ، کە ئەوانە وایکرد مەلا کرێکار بچێتە ناو هێزێکی توندرەو ؟!**

- رێی گولپ لێگیران قەت نەبووەو ئەسلی نییە ، مەسەلەی وتاریش ئێمە بڕوامان بەوە نەبوو وتارەکانی مامۆستا کرێکار خزمەت بە پرۆژەی ئیسلامی دەکەن ، پاشان نەماندەویست ئەو مەلبەندەی سلێمانی بکرێتە مەلبەندێکی ئەوان ، چونکە خەلکەکە زیاتر هی ئێمە

بوو، ئینجا دیاره برایان لێره نەیانهێشتبوو وتار بدات، لەبەر ئەوەی نەوەک قسەیەک بکات و لەسەرمان بکەوێ و کێشەمان بۆ پەیدابێ. هەڵبەت کەوادیرو پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی سلێمانی زیاتر لەگەڵ ئێمە بوون، ئێ هیچ ڕەوانییە کەسێک کە بۆچوونێکی جیای هەیە، بێت خۆی بەسەر واقیعێکدا بسەپێنێ کە خەڵکەکە نایەوێت. هەر خەڵکی سلێمانی بوون، نەیانهێشت وتار بدات، نەک خەڵکی دیکەمان ناردبێ.

**خەڵکی سلێمانی بوون، بەس ڕێکخستنی کۆمەڵ بوو؟**

- بەڵێ، مەبەستم ئەوەیە دیاره کە مامۆستا کرێکار ئەو بنکە جەماوەرییەی نەبووە کە باوەشی بۆ بگرێتەوە.

**ئەوکاتەی ئێوە دەستان بەوەی کرد کە لەگەڵ ئەوان یەکگرن لە شنروێ وابزانم پرسەیەکیان هەبوو وەفدێکی کۆمەڵ چوون بۆ ئەوێ، لە پەراوێزی پرسەکە باسی ئەوەتان کردبوو کە شتێکی وابێ و پێکەوە بن باشترە، چونکە یەکێتی چەند کەسێکی لەوان کوشتبوو، دوای ئەوە دیاره ڕێککەوتبوون کە وادەیەک بۆ دانیشتن دابنێن، کە دانیشتن گوایە کۆمەڵ لەبەر ئەوە لەگەڵ جوند یەکی نەگرتەوە لەسەر ئەوەی ئەوان گوتیان دەبێ هەڵەبجە یەکێتی چۆڵی بکات و هەروەها هەندێ سنوور بۆ یەکێتی دابنرێ کە لە شارەزوورو لە دەوروبەری سلێمانیش، گەر یەکێتی رازی نەبوو لێی بدرێ ئایا سەبەبی ئەوەی کە یەکتان نەگرتەوە ئەو خاڵانە بوو یان خاڵی دیکەش هەبوو؟**

- نا ، شتی دیکەش هەبوو ، ئەوان لە ئەدەبیاتیاندا پێیانوابوو کە ئەسلەن نابێ لەگەڵ ئەحزابی عەلمانی دانیشتن بکرێ، نابێ بەشداری ئەو واقیعە سیاسیەی کوردستان بکەین، تێڕوانینان بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵک، لە تێڕوانینی ئێمە زۆر جیابوو.. یانی هەر لەسەر یەک شت و دووشت نەبوو ، بەڵام ئەوە یەکێک بوو لەو مەرجانەی کە پێمانوابوو مەرجێکی تەعجیزییە ، ئێمە رێککەوتنمان لەگەڵ یەکێتی هەبوو ، هەمووومان کۆک بووین لەسەر ئەوەی یەکێتی جگە لەو بنکەو شوێنانەی کە لە رێککەوتنەکەدا هاتووە هێزی تێدا بهێڵێتەوە ، نابێ هێزی لە شوێنی دیکە بهێڵێتەوە ، یەکێتیش لەسەر ئەوە لەگەڵمان یەکدەنگ بوو ، بەڵام ئەوان (جوندلئیسلام) دەیانگوت ئەمڕۆ پێمان گوت، دەبێ سبەی لێیدرێ. ئێمە دەمانگوت ئەوە مەرج نییە ، تۆ ئەمڕۆ لەگەڵی دادەنیشی. با ئەویش لە خۆی دڵنیابێتەوە، واتە لە رووی ئەمنیەوە تۆ تەئمیناتی بدەیێ. جا دوایش ئەوەی کە ئێمەیان نەسەلماند ، هەر بۆ خۆیان لەگەڵ یەکێتی کردیان، بەس لە هەوڵی کوشتنی د. بەرهەم شتەکان تێکچووەوە ئەگینا چەند جار مامۆستا کرێکار هاتبووە سلێمانی و چووبووە قەلاچوالان لەگەڵ یەکێتی دانیشتبوو کە یەکێتی تەفاهومیان لەگەڵ بکاو ئەوانیش حیزبێکی رەسمی بن، بەڵام لەسەر چەندێتی پارەکە رێکنەکەوتبوون، ئەوەش خەریک بوو چارەسەر بکرێ، بەڵام هەوڵی کوشتنی د. بەرهەمی بەسەرداهات، هەرچەندە بەپێی زانیاری

من ئەوان وەکو سەرکردایەتی ئاگایان لێ نەبوو، ئەوانەی ئەو هەوڵەیان دا، لەوان جیابوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە لێک دوورکەوتنەوە.

**ئەوان چۆن جیابوون، لە رووی رێکخستنەوە جیابوون، یان چی؟**

- کە ئەنسار لەگەڵ یەکێتی دەستی بە وتوێژکرد، ئەوانەی وەکو ئەفرادبوون لێیان جیابوونەوە، گوتیان ئێمە بڕوامان بەوەنییە لەگەڵ یەکێتی گفتوگۆ بکرێ، نابێ تەقە رابگیرێ یان خەلاسیان دەکەین، یان خەلاسمان دەکەن، ئەوە بوو هەوڵی کوشتنی د. بەرهەمیان دا لەوەوە وتوێژەکان لێک پچڕا.

**لەگەڵ ئێوە مەرجێکی دیکەشیان هەبوو کە شەش ئەندامی شورایان هەبێ، ئێوە سێتان قبوڵ بوو؟**

- من بەوردی لە بیرم نەماوە، ئێمە ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی و دوو ئەندام، یا سێ ئەندامی سەرکردایەتیمان پێ گرفت نەبوو، بەڵام لایەنی فیکری و تێڕوانینی ئەوانمان بەلاوە گرفت بوو.

**بابچینە سەر هەڵبژاردنی ئەم دواییە، ئایا بۆچی بە تەنها چوونە ناو هەڵبژاردن، حیزبەکان ئێوەیان قبوڵ نەکرد، یان ئێوە خۆتان ویستان قەبارەی خۆتان بزانن؟**

- من ئەوەکات لێرە نەبووم، بەڵام کە هاتمەوە برایان بۆیان گێڕامەوە، لە راستیدا لەبەر ناچاری بووە، هەرچەندە وەکو عەرەب دەڵێن هەندێ جار شتێکت پێ ناخۆشە، بەڵام خێری تێدایە. جا

بەبرایانی خۆمانم دەگوت؛ ئێوە ویستوتانە شتێک بکەن کە بەرژەوەندی تێدانەبوو، بەڵام خوا شتێکی دیکەی پێ کردوون کە بەرژەوەندی تێدابووە، چونکە برایان بۆیان باسکردم، چۆن لەگەڵ یەکگرتوو قسەیان کردووە کە بەلیستێک دابەزن، ئەوان قبوڵیان نەبووە، دوایی لەگەڵ پارتی و یەکێتی قسەیان کردووە، ئەوانیش هەر قبوڵیان نەبووە، هەتا دوایی ویستویانە هەر نەهێڵن کۆمەڵی ئیسلامی بەشداری هەڵبژاردن بکات، بەڵام دوایی هەر چۆنێک بیت بەشدارییان کردووە دابەزین بە لیستی تەنیا ناچاری بووە، بەڵام ئەگەر من لێرەبام هەر دەمگوت وابێت، چونکە بائێمەش لە خۆمان حاڵی بین و بنکەی جەماوەریمان چۆنەو چەند خەڵک تەئیدمان دەکات، هەرچەندە لەمەشدا فرت و فێل و تەزویری زۆرمان لێکرا.. لەوانە خەڵکی ئیسلامیش بەخۆشیەکەوە دەنگ بداتە لیستێکی ئیسلامی.

– بەپێچەوانەوە دەڵێن لەبەر ئەوەی یەکگرتوو، خۆی لەناو لیستی ئیئتلاف دابووە جەماوەری یەکگرتووش دەنگی بە کۆمەڵدا لەبەر ئەوەی کورسیەکانی یەکگرتوو مسۆگەر بوو؟

– جا ئەوە خاڵی هێزە، ئەوە هەندێ برای ئێمەش دیاربوو ئەوەیان زۆر رەتکردەوە، گوتم نەدەبوایە بەوە قەڵس بن، گوتیان چۆن؟ وتم کۆمەڵی ئیسلامی بتوانی کاربکاتە سەر کادیرەکانی یەکگرتووش کە دەنگی بۆ بدەن، دیارە ئەو حیزبە سیاسەت و ستراتیژ و سەرکردایەتی ئەوەندە بە هێزی هەیە وا لە کادیری حیزبی دیکە بکات دەنگی بۆ

بدات، چجای کادیرەکان خۆی و خەڵکی خۆی، ئەگەر وابێ، نوختەی قوەتە ئەگەر واشنەبێ ئەوە هی خۆمانەو کەس خێری پێ نەکردووین.

**کە لەگەڵ یەکگرتوو باسی ئەوەتان کرد بەیەکەوە دابەزن ئەوان بۆ رازی نەبوون؟**

- من لێرە نەبووم، بەڵام دیارە ئەوان وایان پێچاک بوو، جائێستا من لەوانم نەپرسیووە بۆچی واتانگوتووە.

**مامۆستا ئەوکاتەی کە ئەمریکا بۆردومانی بارەگاکانی جوندلئیسلامی کرد ئێوە تائەوکاتە پەیوەندیتان لەگەڵ جوندلئیسلام هەبوو، وەکو هاتووچۆو ئەوانە؟**

- نەخێر ماوەیەک بوو لێیان نائومێد ببووین. خەڵکیان وردە وردە دەهاتە ناومان وازی لەوان دەهێنا. لە ماوەی ئەو وتووێژانەدا دووسەد(٢٠٠) کەسێکیان بۆ ناو ئێمە هات، بەڵام لە رووی ئەمنییەوە کە ئاگامان لە یەکتر بێ و تەقەمان نەبێ لە بەیندا ئەوانە مابوون.

**مامۆستا کە ئەمریکا لەوانیدا ئێوە هەستتان بە مەترسییەک نەکرد بۆ سەر خۆتان کە ئەورۆ لەوانە بدرێ، بەیانیش لە ئێوە بدرێ؟**

- جاخۆ ئەمریکا پێش ئەوەی لەوان بدا، لە ئێمەیدا، مەترسی چی؟ ئەمریکا بەر لەوەی یەک ساروخ بە ئەنسارەوە بنێ، لە ئێمەیدا. لە مەکتەبی عەسکەریمانی دا، حەوت بارەگامان لەگەڵ خاک تەختبوو، زیاتر لە ٥٠ بریندارماندا.

**رەنگە وایان زانیبێ بارەگای ئەنسارو ئیسلامە؟**

- نا، بەهەرحاڵ واینزانیبێ، یان، بەهەڵەدابراون، یان خۆیان لەگێلی داوە، زۆر ئەگەری هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە پێش ئەوەی لە ئەنسار بدرێ، لە ئێمە درا.

**واتە لەگەڵ ئازادبوونی عێراق هەستان بە مەترسی زۆر کرد؟**

- وەڵڵا هی هەستمان دەکرد دەوڵەتێک دێت **وڵاتێک** داگیردەکا، هەرچەندە ئەمریکا دەیگوت بۆ رووخانی رژێم هاتووم، نەدەبوو ئێمە کە دژی رژێم بووین بەریەلابین، بەس بەوەندە لێمان نەگەڕان بارەگاکانمان موشەک باران بکەن، منیشیان گرت، ئینجا دوایی زۆریشیان عوزر هێنایەوە کە بە هەڵە براون و داوای لێبوردنیان کرد، بەڵام دوای چی؟

**دەڵێن تۆ هەتا نەگیرابووی، لە وتارەکانت جۆرێک لە توندڕەویت پێوەدیاربوو، بەڵام دوای ئازادکردنت زیاتر لە جاران واقیعی کوردستان دەخوێنیتەوە..**

- ئەگەر وابێ حاڵی من باشە! بەڵام بیستوومە دەڵێن دوای زیندان توندتربووە، من هەر وەکو خۆمم، چونکە من لەمێژە خودا هیدایەتی داوم و لە دین تێگەیشتووم، کە ئیسلام بەرنامەی ژیانەو عەقیدەو شەریعەتە، لە خیلالی قەناعەت و ئیرادەی ئینسانەکان ئەو دینە پراکتیزە دەبێ و دەبێتە واقیعێکی ئیجتیماعی و سیاسی. جارێک هەفتەنامەی میدیا پرسیاری لێکردم گوتی مامۆستا جەنابت توندڕەوی

یان نەرم ڕەوی، وتم هیچیان نیم، گوتی ئەی چیت؟ گوتم شەرع ڕەوم، لەو شوێنەی کە شەرع دەڵێ نەرم بە نەرم دەبم، لەو شوێنەی کە دەڵێ توندبە، توند دەبم. هەمـوو مـرۆڤـێکی واقـیع بینیـشن هەروایە، مەسەلەیەکی کوردی هەیە دەڵێ کەس لە شەڕ شەکری نەبەخشیوەتەوە، تۆ کە ڕێزم بگری، من ڕێزت نەگرم خودا دەمگرێ، بەڵام کە تۆ شەڕم پێ بفرۆشی هەر هیچ نەبێ دوعـای خـراپت لێ دەکـەم، یا کـاتێک بەرگری لە مەزلومیەتی خۆم دەکەم تونددەبم شتێکی خراپم نەکردووە.

**دوای ئازادبوونت لە دیـانەیـەکــــدا دەڵێـی ئازاری دەروونـی و جەستەیی درام، باشە ئازاردانی جەستەیی بۆچی بوو دەیانویست چی بڵێی لەکاتێکدا تۆ دیاربووی کە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیت؟**

- ئەو تۆمـەتانەی لە چاوپێکەوتنەکـاندا باسـمکردوون، سێ چوار تۆمـەت بوون کـە گـوایە من بەنیـازبووبم لە هێـزەکـانی ئەمـریکاو هاوپەیمانانی بکەم وەکو: پشتگیریکردنی ئەنسار، هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ڕژێم و لەگەڵ ئێران، دەیانگوت دان بەوانە دابنێ، ئێ دان بەچی دابنێم، پەیوەندیمان لەگـەڵ ئەنسـار نەبووە، بەتەمـا نەبووینە لە ئێـوە بدەین، ئەگـەر بەتەمـابووم، چۆن دەزانـی بەتەمـابووم، خۆ بەتەمـابوون نیەتەو لە دڵدایە، خۆ دڵی منت شەق نەکردووە، ئەمجا لە چ قـانون و شـەریعـەتێکی ئاسـمـانی و زەویدا کـەسـێک لەسـەر نیـەت ئەگـەر نیەتەکـەت بۆ ئاشکراش بێ سزادراوە، تۆ بۆیشت ئاشکرا نیـیە، خۆ دڵمت نەکۆڵیوە، بۆ خۆشم نەمگوتووە، کوا نووسینێک، کوا قەڵەمێک

کوا قسەیەک کە نەمکردووە خۆ دڵم هەڵناکۆڵی، گریمان زانیشت، لە خەوندا نیەتی منت بۆ ئاشکرابوو، ئێ خۆ بۆت نییە سزام بدەی لەسەر کارێک کە نەمکردووە.

ئەمریکیەکان دەیانگوت قسەکانی تۆ زۆر مەنتیقی و بەهێزن، هەر کەسێک کە لێکۆڵینەوەی لەگەڵمدا دەکرد، لە کۆتاییدا دەیگوت وەڵڵاهی قسەکانی تۆ زۆر راستن، بەڵام من هەر کارمەندێکم لەسەرەوە بڕیاردراوە تۆ لێرەبیت. بۆ نموونە دەیانگوت ئێوە پەیوەندیتان بە رژێم هەبووە، دەمگوت باشە سەدام تاکۆتایی ئەمە لێرەن، بیانهێننە بەرەورووم، گوتم سەرانی رژێم گلەیی ئەوەم لێدەکەن دەڵێن بەس تۆ پەیوەندیت نەبووە، ئەوانی دی هەمووی هەیانبووە، زۆریان پێ سەیربوو یەکێک لەوانە عەلی حەسەن مەجید بوو، دەیگوت یانی تۆ یەکێک لە تۆمەتەکانت ئەوەیە کە پەیوەندییت لەگەڵ ئێمە هەبووبێ، دەمگوت بەڵێ، دەیگوت وەڵڵاهی ئێمە تۆمان بە پیاوێکی زۆر خەتەر دەزانی، چونکە کەس بەعسی تەکفیر نەکرد تۆ نەبێ. وتی لەمنیشیان پرسی گوتومە نەوەڵڵا هیچ پەیوەندییان لەگەڵ ئێمە نەبووە، هەوڵماندا پەیوەندییان لەگەڵ بکەین، بەڵام ئەوان رەتیان کردۆتەوە... ئیتر داوای ئەو شتانەیان دەکرد، منیش تاکۆتایی یەک قسەم کرد، تەعزییم دەن، بمکوژن، بمبڕن هەر ئەوەیە کە گوتوومە، لە کۆتاییدا گوتیان تۆ کابرایەکی مەبدەئی و ئەو راپۆرتانەی لەسەر تۆ هات هەمووی درۆ بوو، ئێمە بەرەسمی داوای لێبوردن دەکەین.

**لەوێ بواری ئەوە هەبوو کە لەگەڵ سەرانی رژێم یەکتر ببینن و قسە بکەن؟**

- لە هەندێک کات کە بۆ وەرزشکردن، یان بۆ حەمام و سەرئاو دەریاندەکردین.

**لەیەک کاتدا دەچوون بۆ وەرزش؟**

- قاتع قاتع بوو، هەر قاتعی ٧ کەس بوو، عەلی حەسەن مەجید لە قاتعی ئێمە بوو، تەها یاسین رەمەزان لە قاتعەکەی بەرامبەرمان بوو، تاریق عەزیزیش لە تەنیشتمان بوو، ئەوها جارجارە بۆ وەرزش دەریاندەکردین، دوایی کردیان بە ٣ قاتع بەیەکەوە وەرزش بکەین، ئاوا لەو کاتانەدا یەکتریمان دەبینی.

**واتا هەموویان دەیانزانی ئەوانی دی و سەدام گیراون؟**

- دەیانزانی.

**سەدامیش بۆ وەرزش دەهاتە دەرەوە؟**

- نا، ئەو لەگەڵ ئێمە نەبوو، بەتەنیا لە شوێنێک بوو، جارجار دەمانبینی، کە بۆ لێکۆڵینەوە دەیانبرد.

**ئەویش ئێوەی دەبینی؟**

- دیارە، ئەگەر چاویان نەبەستبێ، دەبێ بینیبێ.

**واتا دەیزانی عەلی حەسەن مەجیدو تەها یاسین و ئەوانە هەمووی گیراون؟**

- بەڵێ.

**راستە سەدام لە سجن خۆراگربوو؟**

- پاسەوانە ئەمریکیەکان وایاندەگوت، دەیانگوت سەدام رەقەو قسەی نەرم ناکا، جا نازانم وایە یان نا.

**دەڵێن عەلی حەسەن مەجید زۆر رووخابوو؟**

- لاواز دەهاتە بەرچاو، هەرچەندە خۆی وانیشان نەدەدا، بەڵام پێیەوە دیاربوو.

**ئێستا خەڵکێک بەناوی جیهاد سەربازی ئەمریکی دەکوژن، پێتوایە ئەوە جیهادە؟**

- پێموایە رەوانییە یەک حوکم بەسەر هەموویاندا بدرێ، دەبێ پۆلێن بکرێن، هەیانە بە جیهادی دەزانێ و بەواقعێکی ئیسلامی دەزانێ، هەیانە بەدافعی واقیعێکی لە دەستچووی دەزانێ.

**لە رووی شەرعەوە؟**

- جۆرج بۆش گوتی ئەگەر وڵاتەکەم داگیر بکەن، بەرگری لە خۆم دەکەم، بە مەزهەبی جۆرج بۆش ئەوە رەوایە، جائەگەر هی واهەبێ لە جۆرج بۆش، جۆرج بۆشتربێ ئەوە شتێکی دیکەیە. بەراستی من لەوێش بە ئەمریکیەکانم دەگوت ئێوە هاتوون ئەم وڵاتەتان داگیرکردووە، بیرتان لە داگیرکردنی کردۆتەوە، بەڵام بیرتان لە چۆنیەتی بەرێوەبردنی نەکردۆتەوە. هەڵبەت کە یەکێک بێ ماڵ و وڵاتت داگیربکات، خۆت دەزانی هەموو شەرایعی ئاسمانی و قەوانینی سەر زەوی موقاوەمە بەرەوا دەزانن، بەڵام وەکو واقیعی

ئەمرۆی عـێراق ئایا ئەوەتا چەند قـازانجـەو زەرەرە؟ دەبێ لەو رووەوە هەڵبـسـەنگێندرێ، ئایا ئەوەتا چەند ئامـانج بە دەست دێنـێ، ئینجـا شـتـی دیکەی تێکەڵ دەبێ و ئیـشکالی لێـپـەیدا دەبێ، وەک کـۆنە بەعسی و موخابەرات و باندی قاچاخچی و ئەمجا لە پەنا ئەوەدا کە شەڕی مەزهەبی و تائیفی دەکرێ، هەڵبەت ئەوە وەزعەکە زۆر قـورس دەکات.

**مـامـۆسـتـا بە کـورتی رات لەسـەر بن لادن چیـیـە؛ کـابرایەکی موجاهیدە، یان تیرۆریست؟**

– وەڵڵا من کـاتی خۆی گوتوومـە ئوسـامـە بن لادن مـوسـڵـمـانێکی ئومەتی پێغەمبەرە (د.خ) ئەوەی کە دەشیکات نەیشاردووەتەوە دەڵێ ئەمـریکاو رۆژئاوا، بازوڵم لە وڵاتانی ئیـسـلامی نەکـەن و بەجـێمـان بێڵن و خـێروبێـرمـان نەبەن و تەعـەدامان لێ نەکەن و قـیـەمی خۆیان بەسەر ئێمەدا فـەرز نەکەن و ئەو وادەڵـێ، ئەوە شیعـارەکانیـەتی، بەڵام لە راستیدا میـکانیزمەکانی، شێوازەکانی کاری ئەوە جێی موشتومڕە کە تاچ رادەیەکی شەرعیـیەو شەرعی نییە، من وەکو قـاعیدەیەکی عام دەڵێم ناچمـە ناو تەفـاسـیلەوە من کـوشـتنی خـەڵکی بێ دیفـاع لە شەڕیشدا بە جائیزی نازانم و پێم دروست نییە.

**ئێستا پەیوەندیت لەگەڵ مەلا کرێکار هەیە؟**

– نەخـێـر، هیچ پەیوەندیان نیـیـە، ئەو یەکـێک بوو، لەو کـەمـە دۆستانەی کە بەخێر هاتنەوەی نەکردبم، بەڵام هەر بە برایەکی بەڕێزو

به موسڵمانی دەزانم سەرەڕای تێبینیم لەسەر قسەو هەڵسوکەوتی.

**سەبارەت بە دیموکراسی، مەلا کرێکار لە ساڵی ۲۰۰۲ لە (هاوڵاتی) دەڵێ ئیسلام پێیوایە دیموکراسیەت هەموو بنەماکانی کوفرە، یەعنی بنەماکانی دیموکراسیەت رەفزە لەلای ئیسلام؟ تۆ چۆن دەڕوانیە دیموکراسیەت لە روانگەیەکی ئیسلامیەوە؟**

- من لە کتێبی چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم رای خۆم لەبارەی دیموکراسی بە دووردرێژی گوتووە، بەڵام لێرە بەکورتی دەڵێم دیموکراسی لە کۆمەڵێک موفرەدە پێکهاتووە کە لەگەڵ ئیسلامدا تێکدەکەنەوە، بەڵام هەندێ شتی تێدایە لەگەڵ ئیسلامدا دژ دەوەستێ، ئەوەی کە لەگەڵ ئیسلامدا تێکدەکاتەوە قەزیەی پرس و راکردن بەخەڵک، بە هەڵبژاردن بەرپرسەکانی خۆی هەڵبژێرێ، ئەوە شتێکی شەرعییە لە ئیسلامدا (وامرهم شوری بینهم) ئەوەی کە لەگەڵ ئیسلامدا تێکدەکاتەوە دەستاودەستکردن دەسەڵات بەشێوەیەکی ئاشتیانە ئەوە کە ئێستا لە رۆژئاوا هەیە لە وڵاتانی بەناو ئیسلامیدا نییە، ئەوەی ئەوان لەگەڵ شەرع تێکدەکاتەوە، ئەوەی لە وڵاتانی بەناو ئیسلامیدا هەیە دژی شەرعە.

**خۆی پێشتریش لەناو ئیسلامدا هەر بەرێگای توندوتیژی هاتووە....**

- نا،نا... پێشتر وانەبووە، لەسەردەمی خیلافەی راشیدیندا، لە دوای معاویەوە کە کردی بە میراتی، لەوێوە لادان لە حوکمی

ئیسلامی کرا، بەڵام لە دوای ئەوەش لە چەند قۆناغێکی مێژوویی ئیسلامیدا، ئەوانەی هاتوون بەرای خەڵک هاتوون و بنکەی جەماوەری هەڵیبژاردوون و خەڵکیان لەگەڵ بووە، هەبوو کە بە زۆر خۆی سەپاندبوو وەکو ئەوانەی ئێستا خۆیان بە سەرۆکی وڵاتانی ئیسلامی دەزانن... موفرەدەیەکی دیکەی دیموکراسی کە ١٠٠٪ لەگەڵ شەرع دەگونجێ، بریتییە لە ئازادی بیروڕا دەربڕین، ئازادییە مرۆییەکان، ئەو ئازادیانەی کە ئینسان بەبێ ئەوان نابێتە ئینسانێکی تەواو. هەڵبەت ئازدای شەخسی لە سنووری شەریعەتدا، بەو مانایە نا کە ئازادی جنسی و ئەو شتانە هەبێ، بەڵام ئەوەی کە لەگەڵ ئیسلامدا تێکدەگیرێ، قەزیەی حەلال و حەرام بدرێتە دەست ئەنجومەنێک بەبێ حیساب کردن بۆ شەریعەت و دین و خواو پێغەمبەر (د.خ)، ئەوە لەگەڵ ئیسلام دژ دەوەستێ. بۆیە شورا لە ئیسلامدا پابەندە بە شەریعەتەوە، قەتل و تێکدانی ئاسایشی خەڵکی و زینا خوا حەرامی کردوون، ئەوەی خوا حەرامی کردووەو یاخود ئەوەی واجبی کردووە، شوراو ئەنجومەن بۆی نییە قسەی لەسەر بکات، بەڵام قسە لەو شتانە دەکات کە شەرع وەکو فەراغ بەجێی هێشتووە لە مەسەلە ئیداریەکان و کێشە لاوەکیەکان، لەوانە ئەنجوومەن بۆی هەیە قسەی لەسەر بکات، بۆیە من لە زیندان بە ئەمریک دەگوت شورای ئێمە لە دیموکراسیەتی ئێوە زۆر موتەرەقیترەو بەرزترە، دەیانگوت چۆن؟ دەمگوت بەپێی دیموکراسیەتی ئێوە شتی

وادەکرێ پیاو پێی عەیبە لە مەجلیسەکاندا باسی بکات ئەو ئازادی جنسی و ئەو پیاو لە پیاو مارەکردن و ئەو بەزم و ڕەزمەی کە زۆر عەیبە پیاو باسی بکات، بەڵام لە ئیسلامدا قەت شتی وانابێ، چونکە لە ئیسلامدا ئەو شتانە قەدەغەکراون، نوێنەرانی خەڵک کە دادەنیشن ڕەوانییە قسە لەسەر شتێک بکەن کە خوا حەرامی کردووە و بۆیان نییە شتێک حەرام بکەن کە خودا واجبی کردووە، لەبەر ئەوەش شورا لە ئیسلامدا موقەیەدە بە چوارچێوەیەک کە ئینعراف بە کۆمەڵگا ناکا.

**تۆ هەمیشە جلوبەرگی کوردی لەبەردەکەی، لەبەرکردنی ئەو جلوبەرگە شتێکی شکلی نییە زیاتر؟ ڕاستە تۆ زۆر تەئکید لە کوردایەتی و مۆرکێکی کوردانە دەکەی، چ لە بزووتنەوەی ئیسلامی، چ ئێستاش بابڵێین، بەڵام بە جلوبەرگە؟ وەکو پەندێکی کوردی دەڵێ بەئیشە نەک بەریش؟**

- جا ئەگەر وابلێیتەوە با بە کوردیش قسە نەکەین، گرنگ موحتەوایە، بە عەرەبی بڵێی، بە تورکی بڵێی، بە ئینگلیزی بیڵێی هەمان شتە، ئەگەر واشە پێویست ناکا لە کوردستان بی، لە هەر شوێنێک بی، بەدڵە، بەڵام من ئەوە بەبەشێک لە کوردایەتیم دەزانم، وەکو من بە کوردی قسەکردنم بەبەشێک لە کوردایەتیم دەزانم، هەروەها لە کوردستان ژیانیشم بەبەشێک لە کوردایەتیم دەزانم.

**واتا بڕوات بەوە نییە ڕۆژێک تەنگەتاو بکرێن بڕۆی بۆ دەرەوە؟**

- با، بۆ بڕوام پێ نییە؟ بەڵام ئەگەر تەحکامی تەنگەتاویە، جیایە

له ئەحكامی حاڵەتی ئاسایی، كە ئاسایی بێت بۆ لە وڵاتی خۆم دانەبم، كە هیچ هۆكارێكی جەبری نەبێ، بۆ بەرگی نەتەوایەتی خۆم بگۆڕم، من لاسایی ئەوروپا بكەم لە جلوبەرگمدا، سبەی لە عادات و فكرو ئەدەبیات و راگەیاندنیشم رەنگدەداتەوە، ئەوكات چیم بۆ دەمێنێتەوە لە موسڵمانێتی و كوردایەتی و نیشتمانپەروەریم، جگە لە ئیدیعا، بەڵام كە سەفەری وڵاتان دەكەم چاكەت و پانتۆڵ لەبەردەكەم، بۆ ئەوەی شتێكی شاز نەبی، لە رووی ئەمنیشەوە رەنگە واپێویست بكا، بەواتا لە رووی شەرعیەوە ئیشكالی تێدا نابینم، بەڵام وەختێك لەناو میللەت و وڵاتی خۆمم، لەبەركردن و پۆشینی جلی كوردیم پێ كەموكوڕی نییە، پێموانییە مرۆڤ بەلەبەركردنی چاكەت و پانتۆڵ دەبێتە رۆشنبیرو بەبەرگی كوردی پاشدەكەوێ، پێموایە پێشكەوتن و دواكەوتنی مرۆڤ پەیوەندی بە زهن و حاڵەتی فكرو تێگەیشتن و ناوەرۆكە، نەك بە مەزهەرو واقیع.

**تۆ زۆر تەئكید لە كوردایەتی دەكەی، قورئانی پیرۆز كەكرا بە كوردی كەس قسەی نەكرد، ئایا جائیزە نوێژ بە كوردی بكرێ!**

– لەبەر ئەوە جائیز نییە، چونكە ئەو قورئانە كە بە عەرەبیە ئەگەر هەر بە عەرەبیش، بەڵام بە غەیری ئەو وشە عەرەبیانەی كە خودا لە قورئان فەرموویەتی، تەرجوومە بكرێ، هەمان مانا نادات. نەگوتراوە دروست نییە قورئان تەرجومە بكرێ، من بە فەرزو واجبی دەزانم كورد قورئانی بۆ بكرێتە كوردی، تورك بۆی بكرێتە توركی، فارس هەروا، بەڵام تەعەبودپێكردنی دەبێ بە زمانی خۆی بێت، لە راستیدا

عەرەبیبوونی قورئان لەبەر کۆمەڵێک تایبەتمەندیە کە لە زمانی عەرەبیدا هەیەو خودا ئەو زمانەی هەڵبژاردووە، وەک چۆن زمانی عیبری هەڵبژاردووە بۆ تەورات، ئەو پێغەمبەرانەی هاتوون هەر کامێکیان بەزمانی نەتەوەکەی خۆی کتێبی خودای بۆ هاتۆتە خوارێ.

**لە ژمارەی پێشووی گۆڤاری هەرێمدا مامۆستا سەلاحەدین بەهائەدین دەڵێ لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر دانیشتوومەو پێمگوتووە لەناو کۆمەڵی ئیسلامی خەڵکێک یاهەندێک کەسی توندڕەو لەسەرکردایەتی هەن، پێویستە سەبرسەبر ئەوانە بکرێنە میانڕەو، هەست دەکەی ئێستا کۆمەڵ میانڕەوە، یان خەڵکێکی توندڕەوی تێدایەو پێویستە کۆنترۆڵ بکرێن؟**

- ئێمە سوپاسی هەر کەسێک دەکەین کە ئامۆژگاریمان بکات، بەڵام وەکو واقیعەکە ئەگەر زیادەڕۆیمان نەکردبێ لە نەرمیدا بەلای تۆدا نین، چونکە مەرج نییە هەمیشە نەرمی باشبێ، من پێم وایە تۆ دەبێ لەگەڵ مەبادیئی خۆتدا راست بیت، ئەگەر مەبادیئەکەت داوای لێکردی توندبی توندبە، باشە ئەگەر سبەی کوردستانی ئێمە کەوتە بەرپەلاماری خەڵکێکی عەرەبی شۆڤێنی ئەوکاتە باشە توندبین یان نەرم، بپارێینەوە یان رووبەڕوو ببینەوە؟

من بۆیە توندم، چونکە ئیسلام دەڵێ بەرگری لە میللەت و خاک و وڵاتەکەت بکە، ئەی ئەگەر کەسێکی دیکەش بێت و بە نەوعێکی دیکە زوڵمم لێ بکات، من ئەگەر بۆم بکرێ نەیێڵم زوڵمم لێ بکات بۆ خەراپە؟ مەبەستم ئەوەیە راست نییە کە هەمیشە نەرمی باشبێ

هەروەکو راست نییە هەمیشە توندی باشبێ، بەڵکو پێویست بەوە دەکات ئەگەر نەرمی ئامانجەکەت بە دەستدێنێ، نەرم بیت، ئەگەر بە توندییش بەدەستدێت، توندبیت، پێشم وانییە سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی بەو شێوەیە بێ کە باستکرد، چونکە سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی، رەنگە زیاتر لەژێر کاریگەری فیکرو تێڕوانین و بۆچوونەکانی بەندە دابن و ئێمە پێکەوە مونسەجیم و تەباین، هەر شتێکیش بڕیاری لەسەر بدەین بە راوێژو دوای ئەوەی دەیکوڵێنین و قسەی لەسەر دەکەین، وەکو دەڵێ بیچێژە ئەمجا ببێژە.

**وەکو دەڵێ پەند و لە بزوتنەوە وەرگرتووە؟**

- لە مەسەلەی بزووتنەوەش ئەوکاتە رای ئێمە هەروابوو، بڕوا بکە ئەوەی شارەزای ژیانی بەندەبێ دەزانێ کاتی خۆشی ئێمە هەروا بووین لە شەڕەکەی ٩٣ ئەگەر بە قسەی من کرابوایە شەڕ نەدەکرا، ئەوجا بەڕاستی قەزیەی ئێمە ئەوە نییە کە وەکو شتێکی ئیسلامی تەنیا تەماشای یەک لایەنی ئیسلامیەکە بکەین بەو مەفهوومەی لە زیهنی خەڵکدا هەیە. کاکە من خزمەتکردن بە وڵاتەکەم بە نەتەوەکەشم هەر بە ئەرکێکی ئیسلامی دەزانم. من بە واجبێکی شەرعی دەزانم وڵاتەکەم ئازادو سەربەخۆ بێت، بەواجبی شەرعی دەزانم هێمن و ئاسایش وڵات پارێزراو بێت، بە واجبی شەرعی دەزانم لە رووی ئابووریەوە قڕوپڕی نەبێ وەکو ئێستا هەیە، چینایەتی نەبێ واتە هاوسەنگی هەبێ هەندێکی لە بورجی حاجی و لە قەسردا نەبێ و هەندێک کۆختەشی دەستنەکەوێ. من ئەو واقیعە ئابووریە

بەناشەرعی دەزانم . واقیعە سیاسییەکە بەناشەرعی دەزانم کە کوردستانێک کە خوا یارمەتی دا رزگارمان کرد بۆ خۆمان دوولەتی بکەینەوە وەکو ئێستا کە هەیە، بەناشەرعی دەزانم کە پەرلەمانێکمان هەبێ نوێنەرانی ئەو میللەتە بن کەچی پەرلەمانێکی ئیفلیج بێ، هەموو قەرارەکان حیزبیانە بۆی لێبدرێنەوە وەکو شیر بە گەروویدا بکرێ، ئەو پەرلەمانە مەلۆتکە نییە، منداڵی ساوا نییە شیرەخۆرە بێ، شیرەکەی بۆ بگرییەوەو ئینجا بەگەروی دابکەی، هەموو بڕیارە سیاسیەکان ئێستا بەگەرووی دادەکەن.

**بەڵام نوێنەری حیزبەکانی دیکەش قسە ناکەن؟**

- دەزانم، مەبەستم ئەوەیە واتەسەور مەکەن ئیشی من هەر ئەوەیە خەڵک نوێژ بکات و ریش بێڵێتەوە، ئیسلام بەو فراوانیەی لێی تێگەیشتووم دەبێ لە رووی سیاسیەوە میللەتەکەم تەبابێت، لە رووی ئابوورییەوە دادگەری هەبێ، لە رووی کۆمەڵایەتییەوە چینایەتی نەبێ، یەکگرتن هەبێ لە رووی ئەمنی و ئاسایشەوە پێکەوە هاوکاری یەکتربین، لە رووی حیساب بۆ یەکترکردن، یەکێک نەڵێ هی خۆم بۆ خۆم، هی تۆش هەموو دەخۆم، ئێستا وایە. بۆ نموونە ئێمە بارەگاکەمان لە خانووی کرێ دایە حزبێکم بۆ بێنە بارەگاکەی لە خانووی بەکرێ دابێ، وەکو لەگەڵ کاک مەسعودیش باسم کرد گوتم شتێکی رەوایە کاک مەسعود ئێمەش لە هەموو خێروبێری کوردستان بێ بەش بین، پێکەوە لە شاخ نەبووین، پێکەوە نەهاتینەوە ئێوە بەشی خۆتان و ئێمەش بەشی خۆمان، کاکە ٩٩٪ی بۆ تۆ ١٪ش بۆ ئێمە بەس

مەعقولە ئێمە ١٪یشم نەبێ سەدا هیچ بم و ئێوە سەدا هەموو شتێک بن، مەبەستم ئەوەیە ئێمە خۆمان بە خەڵکی ئەو وڵاتە دەزانین، وەڵڵاهی کە کورد کیانی هەبێ بەهی خۆمی دەزانم کورد برا گەورەیەکی هەبێ وەکو بە کاک مەسعودم گوت بۆ منی ئیسلامی واباشە جیهەتێک هەبێ موراجەعەی پێبکەین، بڵێین کاکە ئەو زوڵمەمان لێکرا یان ئەوحەقەمان بدەنێ، نەک من نەزانم روو لە کوێ بکەم، من پێم خۆشە مەرجەعێک هەبێ کە حەق و حیسابی منیش بدات و واجباتی منیش دیاریێ.

لە بەغدا کە کورد شتێکی دەستدەکەوێ زۆرپێمخۆشە، کە زوڵمێکمان لێ دەکرێ، پێمان ناخۆشە، کارە ئیسلامیەکەی من هەر ئەوە نییە خەڵک فێری رۆژوو نوێژ بکەم، کارە ئیسلامییەکەی من کارێکی سیاسی ئابوورییە کۆمەڵایەتییە، رۆشنبیرییە، پەیوەندییە.

**رات بەرامبەر یەکگرتووی ئیسلامی چۆنە کە حیزبێکی میانڕەوەو ئێوەش لەناو خەڵک دەگوترێ زیاتر بەرەو میانڕەوی دەچن، ئەوە خاڵی هاوبەشی بۆ دروست نەکردوون، یان هەر وەکو جارانن؟**

- ئێمە کاتی خۆشی کە لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا بووین ئەو خەت و تەوژمەی کە من نوێنەرایەتیم دەکرد لەگەڵ برایانی یەکگرتوو بەتایبەتی لەگەڵ مامۆستا سەلاحەدین باشترین پەیوەندیمان هەبوو، زۆرجار کە لیژنەی تەنسیق پێکدەهێنرا بەرپرسی لیژنەکە من بووم و هەمیشە قیادەی بزووتنەوەی ئسلامیم هاندەدا کە لەگەڵ برایانی یەکگرتوودا موتەفاهم و برابین، پێکەوە تەبابین و کارەکانمان بە یەکەوە

بێ و ئەوکاتەش هەروا بووین و ئێستاش سوپاس بۆ خوا نزیکی هەیە و برایانی یەکگرتووش دیارە ئەوانیش بۆ خۆیان خەڵکێکن و قوتابخانەیەکن پەرێزو بەرهەمێکیان هەیەو لە زۆربەی شتەکانیش لەگەڵ ئێمە تێکدەکەنەوە، بەڵام دیارە هەر کەسیش شتی تایبەتمەندی خۆی هەیە.

**تۆ ناوت لەخۆناوە ئەمیر، ئێستاش دەبینین هەر مزگەوتێک ئەمیرێکی هەیە، ئەو گرووپانەش کە گیران هەریەکە ئەمیرێکی هەبوو، ئەوە کاریگەرییەکی سلبی نییە لەسەر ئەو ناوەو ئێوە لەمەودوا لە جیاتی ئەمیر سکرتێر، یان ئەمیندار بەکاربێنن؟**

- وەڵڵا ئەوە لەرووی شەرعییەوە هیچ ئیشکالێک نییە ناوی ئەمیر بێ، یان سەرۆک، یان ئەمینداربێ و هەر ناوێک بێت، من خەڵک ئەو ناوەی لێناوم، بابم ناوی لێناوم عەلی، خەڵکیش ناوی ناوم ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی، دەگونجێ ئەو ناوە بگۆڕدرێ کە بزانرێ ئیشکالێک دروست دەکات، هیچ ئیشکالی تێدانییە ئەگەر بگۆڕدرێ، ئەگەر بشمێنێتەوە هیچی تێدانییە، چونکە کاک مەسعود سەرۆکی هەرێمە و سەرۆکی شارەوانیشمان هەیە، سەرۆکی لیژنەیەکیشمان هەیە، مانای ئەوەنییە ئەوانە وەک یەکن، مەبەستم ئەوەیە گرنگ ناوەڕۆکە، خەڵک نابێ وابزانێ هەر لەبەر ئەوەی من ناوم ئەمیرەو ئەویش ناوی ئەمیرە، هەموو وەکو یەک بین، مەرج نییە ئینسان لەناودا یەکیان گرتبێتەوە ئەوا لە ناوەڕۆکدا وەکو یەک بن.

## مەلا عەلی عەبدولعەزیز

## کە ئێمە بزووتنەوەمان دروستکرد ئیخوان موسلمین کە ئێستا یەکگرتووی ئیسلامی یە لەناو خەڵک دەگەڕان و پارەیان دەدانێ و پێیان دەگوتن مەبن بە بزووتنەوەو گوناهە عەسکەری عێراق بکوژن



بزووتنەوەی ئیسلامی، تاکە بزوتنەوەو ڕێکخستنی سیاسی-سەربازی بەناو ئیسلامی بووە کە لە نیوەی دووەمی هەشتاکان (١٩٨٧) خەباتی چەکداری دژ بە ڕژێمی دیکتاتۆری بەعس ڕاگەیاندووە، بەڵام پێکهاتەی بزووتنەوە، بەتایبەتی لە ئاستی سەرکردایەتی زۆر نارێک و ناتەبابووەو، لەو بارەیەوە بزووتنەوە بەیەکێک لەو حزبانە دادەنرێ کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئەزموونێکی زۆر تاڵی چەشتووە، هەر ئەو ئەزموونە تاڵەش بوو، وای لە بزووتنەوە کرد لە هێزێکی کاریگەری عەسکەری و ئینجا سیاسییەوە بچووک بێتەوە، بۆ ڕێکخراوێکی..... کورد گوتەنی ((پڵنگ بوو، بوو بە پشیلە))، ئیتر کە سەیرێکی ئەو ئەزموونەی بزووتنەوە دەکەی زۆر پەندو وانەو پرسیار خۆیان قووت دەکەنەوە، لەبەر ئەوەش بوو بەپێویستمانزانی ڕابەری ئێستای بزووتنەوەی ئیسلامی بدوێنین، لە ڕێگای دواندنی ڕابەری بزووتنەوەشدا بەشێکی باشی گرفتەکانی بزووتنەوەو هۆکارەکانی شەڕ هەڵگیرساندنی لەگەڵ (ی.ن.ک)و دروستبوونی ئەو هەموو گرووپ و ڕێکخراوە توندڕەوانەو دەرچوونیان لە بزووتنەوەو ئینجا یەکگرتنەوەی بزووتنەوە لەگەڵ ڕاپەڕینی ئیسلامی و دواتر جیابوونەوەی مەلا عەلی باپیرو مەلا کرێکارو تەکەتولاتی جیابوونەوەی عەلی باپیرو دانیشتنی مەلا سدیقی عەبدولعەزیز دوای ئەم تەکەتولاتانەو چەندین پرسی دیکە، ڕوومان لە شاری هەڵەبجە کرد، بۆ بینینی مامۆستا مەلا عەلی

**عەبدولعەزیزی رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی، هەر کە نزیک سکرتاریەتی بزووتنەوە کەوتین، هاوکات مەڵبەندی بزووتنەوەش لە تەنیشت سکرتاریەتە، بینیمان کچ و کوڕێکی لاو، تۆڵیان لە قۆڵی یەکدی هەڵکێشاوەو بەبەزدەم هەردوو بارەگای سکرتاریەت و مەڵبەندی بزووتنەوەدا رەت دەبن یەکسەر تێگەیشتم بزووتنەوە لە هەڵەبجەش هیچ بەهایەکی نەماوەو بزووتنەوە تەواو چۆتە قالبی خۆیەوەو.....هتد.**

**لەم دیمانەماندا هەوڵمانداوە تارادەیەک گرفتە ئاڵۆزەکان بخەینەبەر پرسیار، بەو هیوایەی توانیبیتمان تینوویەتی خوێنەران بشکێنین.**

**ئێوە بنەماڵەیەکی ئاینین، کەچی مامۆستا مەلا سدیق حیزبێکی دروستکرد، شێخ عوسمان حیزبی دروستکرد، چی وای لە ئێوە کرد بچنە ناو رێکخستنێکی سیاسیەوە؟**

- لە راستیدا ئەوکاتەی مەلا مستەفا لە رووسیا هاتەوە، بارودۆخێکی زۆر خراپ لە عێراق روویدابوو، ئەوکاتە کوردە نەتەوەییەکان زۆر لاوازبوون، حکومەتی عەبدولکەریم قاسمیش بە هەموو شێوەیەک پشتگیری لە شیوعیەکان دەکرد، جەماعەتێکی دیکەش بەناوی نەتەوەیی عەرەبیەوە خەریک بوون، کە پێیانوابوو عێراق غەیری عرووبە شتێکی دیکەی نییە، باسی ئیسلامی تێدا

نییە، ئەوە کورد هەر کەس نەیدەتوانی ناوی بێنێ، هەتا کە کوردەکان «کە ئێستا زۆریان ماون»، وەکو عەلی شاوەیسێک هەیە لێرەیە کاتی خۆی کادربوو،، دەیانگوت کوردستان، ئەوانی دیکە لە بەرامبەر ئەوە هەڵدەپەڕین و دەیانگوت قلیاسان، واتە گاڵتەیان بە کوردستان دەکرد. کە مەلا مستەفا لە رووسیا هاتەوە، خەڵکێک چەپلەیان بۆ لێدەدا، وایان دەزانی بووە بە رووس، بەڵام کە ئێمە چووینە لای، گوتی من بەهیچ شێوەیەک ئەو مەیل و فکرانەم وەرنەگرتووە، بەڵکو لەوە حاڵیبووم کە لە غەیری ئیسلام هیچ رێگایەکی دیکە نییە بۆ ئازادی، لەبەر ئەوە سوێند بەخوا ئامادەم سەربازێک بم لە دەوڵەتێکی ئیسلامی خاوەن عەقیدەو ئەخلاق، بەمەرجێک مافی کورد بپارێزێ، ئامادەنیم سەرۆکی دەوڵەتێک بم لە حکومەتێکی بێ ئەخلاق و بێ عەقیدە.. مامۆستا مەلا سالحی گەورە سەرۆکی وەفدی ئێمە بوو، کاتی خۆی دەرسی بە مەلا مستەفا گوتوە، مەلا مستەفا زۆر زۆر رێزی دەگرت، لەو دانیشتنە پەیمانێکمان بەیەکتردا کە کوردو ئیسلام لەیەکتر جیانەکەینەوە، هەزار دەوڵەت بێ، بڵێ ئیسلامم، ئەگەر دان بە مافی کورد نەنێ، ئێمەش دانی پیانانێین.

بێگومان ئەوکاتە ئێمە لە هەموو دەوڵەتە عەرەبیەکان و جیهانی ئیسلامیدا دیاربووین، مامۆستا مەلا سالح بەرامبەر بە شێخی ئەزهەر دادەنرا، مامۆستا مەلا عوسمان بەرامبەر بە موفتی سعودیەو وڵاتانی دی دادەنرا، لای هەموو حکومەتەکان قسەیان دەڕۆیشت،

لەوکاتە هەرچی موفتی و کەسایەتییەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان هەبوو، کۆیانکردنەوە، لەکاتی قسەکردن، قسەی مامۆستا مەلاساڵح بەسەر قسەی هەمووواندا سەرکەوت. جا لەبەر ئەوە ئێمە ئەوکاتە لەگەڵ مەلا مستەفا ئەو بڕیارەماندا، لە ڕاستیدا ئەو تا مابوو ڕاستی کرد، لێرەش هەر ڕاستمانکرد، بەلامانەوە واجب و شەرع بوو بەرگری لەم میللەتە بکەین، ئینجا بەچی بەرگری لێبکەین! بە هاوکاری مەلا مستەفا یەکێتی زانایانمان دروستکرد، من سکرتێری ناوچەی سلێمانی بووم، کاک عوسمان کرایە لێپرسراوی گشتی، بەڵام قبوڵی نەکردو گوتی من لێرە دوورناکەومەوە، مەلا عەلی هەولێریی لەباتی خۆی دانا.

**بەڵام بەپێی هەندێ زانیاری مامۆستا مەلا عەلی عوسمان لە ساڵی ١٩٥٤ ئینتیمای بۆ ئیخوان موسلمین کرد؟**

- ئەی لەگەڵ کێ بێ؟ دیارە ئەوکاتە ئیخوان بزووتنەوەیەکی ئیخوانی جیهانی بوو، ئێمە پشتگیریمان لەوان دەکرد.

**عەرەبی بوو، چونکە لە میسر سەریهەڵدا؟**

- نا، جیهانی بوو، لە پاکستان هەیە، لە ئەندەنووسیا هەیە.

**بەڵام سەرچاوەکەی لە میسر بوو...**

- چ قەیدییە، لە هەر کوێیەک بووە، مادام بزووتنەوەیەکی جیهانی بووەو فکرەیەکی ئیسلامی بووە، واتە زیندووکردنەوەی ئیسلام بووە، لەبەر ئەوەو لەبەر ئەوەش ئەوکاتە حکومەتی عێراقی سەر بە حلفی

مەرکەزی بوو، ئێمە پشتگیریمان لە ئیخوان کرد.

**بەڵام ئیخوان پەیوەندی بە کوردایەتیەوە نەبوو؟**

- چۆن نیەتی؟

**چونکە ئیخوان مۆرکێکی عەرەبی هەبوو سەرچاوەی بڕیارە گرنگەکانیشی مەکتەبی ئیرشادی میسرە...**

- ئێوە نایزانن، چونکە ئێمە لە بناغەکەی بووین، لە ئێوە باشتر دەیزانین، ئێوەو هیچ کەسێک نایزانن، بێگومان کاک مەسعودیش نایزانێ، ئێمە دەیزانین وتیابووین و چووینەتە میسرو وڵاتانی سەرگۆی زەوی، من هەرچی ویلایەتی ئەمریکا هەیە گەڕاوم، هەروەها چوومەتە ئەلمانیا، فەرەنسا، میسرو سعودیە، من لە پشتی ئیمامی سعودیەوە بووم کە دوعای بۆ سەرکەوتنی کوردو نەمانی سەدام کرد، من پێموت دوعا بۆ کورد بکا کە ئەوکاتە میوانی مەلیک بووم. جا لەبەر ئەوە ئەوشتانە ئێمە دەیزانین، ئەسلی فیکرەکە، فیکرەیەکی ئیسلامی بووە، نەک عەرەبی، هەتا دژی نەتەوەیی عەرەبی بووە، بۆیە سەید قوتب و حەسەن بەننایان کوشت، دژی ئینگلیزو جولەکەو داگیرکەربوون، یەکێک لەو ئیخوانانە کە وەختی خۆی لە سوپای عێراقی ئەفسەر بوو، کاتی خۆی زۆر هاوکاری دەکردین، من بەدەمانچەوە چوومەتە وەزارەتی بەرگرییەوە کەس نەیپشکنیوم، لە زەمانی عەبدولکەریم قاسمدا کۆمەڵێک گەنج لەگەڵ هەندێک عەرەبدا ویستمان کودەتا بکەین، ئەو ئەفسەرە ئەوکات زۆر یارمەتی

دەداین، ئێمەش لەگەڵ ئەو هاوکاربووین، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ لەگەڵی بەشەڕ هاتم لەسەر ئەوەی گوتی؛ ئێوە بۆچی بەیانتان دەرکردووەو گوتووتانە فیدرالیمان دەوێ بۆ کوردستان، منیش وتم فیدراڵی واتە حوکمی ولایات، ئەی تاکەی ئەم کوردە بێ سەر بێت، بۆ ئێوەی عەرەب ٥٠ دەوڵەتتان هەبێ، ئێمە دەوڵەتێکمان نەبێ!؟ ئیتر مشتومڕیان بوو، ئیحسانی کوڕیشم لەگەڵدا بوو، دەعوەتی کردبووین، وەختێک گوتی وەڵڵاهی من ئێستا لای سەدام مەحکومم بە ئیعدام، بەڵام ئەگەر فیدراڵی بە کورد بدرێ، دەگەڕێمەوە لای سەدام و تەشەبزی پێ دەکەم و لە دژی کورد چەک هەڵدەگرم، ئیحسانیش گوتی وەڵڵاهی ئێستا بە تەلەفزیۆن عێراق دەبینی، ئەوجارە وات لێدەکەین بچیە ولاتێکی وەها بە تەلەفزیۆنیش عێراق نەبینی، لێی توڕەبوو، وەلحاسل شەڕێکی خراپمان بوو لەسەر ئەم قسەیەی کردی، ئێمە هەمیشە ئیسلام و کوردمان لەیەک جیانەکردووەتەوە.

**تۆ بەرەسمی ساڵی چەند چوویە ناو ئیخوان؟**

- لە راستیدا من بەرەسمی نەچووم، بەڵێ منیان کردبووە لێپرسراوی سلێمانی، بەڵام نەک بەو ناوەوە، بەو ناوەی هەر کەسە خەریکی فکرەیەکە، ئێمەش وەکو فکرەی ئیسلام هەوڵبدەین کە ئەو خەڵکە موسڵمان بێ، بێگومان ئەوکات ئێمەو نەتەوەییەکان بەتایبەتی پارتی لەبەرەیەکدا بووین، شیوعی و خەڵکی دیکە لەبەرەیەکی دیکەدا بوون، ئێوە ئەو شتانە نازانن، لە پیاوی ریشسپی

بپرسن تابزانن چیبووه، شیوعیەکان لە هەموو شوێنێکدا خۆپیشاندانیان دەکرد، وێنەی عەبدولکەریم قاسم و مارکس و لینینیان بەرز دەکردەوە، خەڵکی شارەزووری فەقیریان حاڵی کردبوو، دەیانگوت بیگرە، بیکوژە، ئەمە کوردیشە، لاویشە، پارتیشە. ئەوە مەسەلەیەکی مەشهوربوو، ئێمە لە بەرامبەر ئەوان دەوەستاینەوە، ئەحمەد نەقیب هەبوو لە سلێمانی، ئێستاش ماوە، برۆن لێی بپرسن بڵێن دەوری مامۆستایانی هەڵەبجە چی بوو.

**ئەو کاتەی مامۆستا مەلا عوسمان لە ئیخوان دابوو....**

– ئەمە ئیخوان نەبوو، حیزبێکی ئیسلامی دروستبوو، کاکە من بەڵگەم هەیە...

**بەڵام ئەو حیزبە ئیسلامیە درێژکراوی ئیخوان بوو..**

– راستە لەسەر ئەو فکرەبوو، بەڵام ئەوە حیزبی ئیسلامی عێراقی بوو، یەکەمجار کە داوای دامەزراندنیان کرد، عەبدولکەریم قاسم مۆڵەتی نەدانێ، وتی ئەوانە چەند کەسێکن، مامۆستاو ئەندازیارن، ئەوانەش نوێنەرایەتی هەموو عێراق ناکەن، تەنها نوێنەرایەتی بەغداو رومادی دەکەن. ئەوانیش هاتن بۆ ئێوە بۆ لای کاکە مەلا ساڵح، چووبوونە هەولێرو سلێمانی، دیارە وەڵامیان نەدابوونەوە، کە هاتن بۆ ئێرە، کاکە مەلاساڵح گوتی ئەگەر ئێوە راست دەکەن و بۆ حکومەتی ئیسلامی بێت، ئامادەم هەرچی بڵێن بۆتان بکەم، ئەوانیش زۆر مەمنون بوون. ئێمەش چووینە سلێمانی و کەسایەتی زۆرمان بینی،

ئینجا کاکەم مەلا ساڵح کاغەزێکی بۆ مەلا مستەفا نووسی، مەلا مستەفا ئەوکاتە لە قەسری سیاحی نوری سەعیددابوو، کاکەم منی نارد، مامۆستایەکی دیکەشم لەگەڵ بوو، کە چووین یەکسەر تەلەفۆنم کرد، مەلا ساڵح کە خوشکەزای مەلا مستەفایە، ئێستاش ماوە، هات ئێمەی برد، کە چووین لە قەراخ بەحرەکەوە هەزار کەس لەناو باخەکە وەستابوو، ڕێ نەبوو ئەوەندە قەڵەبالغ بوو، مەلا ساڵح ئێمەی لە گوێی بەحرەکەوە بە سەیارەیەکەوە بردە ژووریّ و وەڵڵاهی پێنج دەقیقەی پێنەچوو مەلا مستەفا لە دەرگایەکەوە هاتەوە ژوورەوە، ئیتر مەرحەباو چاک و خۆشیمان لە یەکترکرد، تەنها سەید عەزیزو نوری ئەحمەد تەها لەو ژوورە وەستا بوون، کاغەزەکەی مەلا ساڵحمان پێدا، کە لە نامەکە گوتبووی پێشتر ئێمە شتێکی وامان لەگەڵ تۆ گوتووە، ئێستاش حیزبێکی ئیسلامی داواکارییان پێشکەش کردووەو داوای پشتیوانی لە ئێمە دەکەن، ئایا جەنابت ڕات چییە؟ مەلا مستەفاش گوتی کێ ئەمە دەکا؟ من باش نایانناسم، زۆر کەس بەناوی ئیسلامەوە درۆ دەکات، کێ لە پشت ئەوانەیە؟ منیش گوتم وەڵڵاهی نازانم، فەرمووی بڕۆن ئەگەر ئەمجەد زەهاوی پشتگیریکردن من لەگەڵ ئەوم، شێخ ئەمجەد کوردبوو، ئەوکاتە موفتی هەموو عێراق بوو، سەرۆکی ڕابیتەی عالەمی ئیسلامی بوو، ئێمەش چووین بۆ خزمەت شێخ ئەمجەد، ئەویش نامەیەکی بۆ مەلا مستەفا نووسی، کە ئێمە داوای عێراقێک دەکەین مافی هەموو کەسێکی تێدا مسۆگەر

ببێ، یەکێ لەوانەی ئومێدمان پێی هەیە، تۆی، لەبەر ئەوەی لە نەوەی شێخ عەبدولسەلامی، ئومێدمان هەیە عەموود فەقەری ئەو مەسەلەیە بیت، ئەوە ساڵی ١٩٦١ بوو.

**واتە تەقریبەن لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول بوو؟**

- بەڵێ. برا! بناغەی شۆڕشی ئەیلول ئێمە بووین، ئێمە بەناوی ئیسلامەوە کردمان، دەمانگوت واجبی شەرعیەو دەچووینە لای خەڵکی لادێ و ریشسپیەکانیان و هانمان دەدان بۆ موزاهەرە کردن، کەچی شیوعیەکان دەهاتن مەقەری پارتیەکانیان دەسوتاند، ئێمەش دەچووین (ان فتحنا)مان تێدا دەخوێندو بارەگاکەمان دەکردەوەو بەشەق شیوعیەکانمان دەردەکردن، ئێستاش شیوعیەکان لە پێشترن.

**کە بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی دامەزرا....**

- کوڕە پەیوەندی چی!؟ ئەو پەیوەندی و مەیوەندییە هەر نەبووە، ئەمە ئیخوان دروستیکردبوو، ئێمە بزووتنەوەمان بە رێککەوتن لەگەڵ کاک مەسعودو مام جەلالدا دروستکرد، کە بۆردوومانی هەڵەبجەیان کرد، ئێمە دەرچووین جیهادمان راگەیاندو لەسەر مەسەلەی کورد فتوامان دەرکرد. ئەو ئیخوان موسلمینەی تۆ باسیدەکەی ئەو یەکگرتووەیان دروستکرد، بۆ ئەوەی بەرگری لە ئێمە بکات، هەتا لەسەر ئەوە تەفرەقەمان کرد، ئەو سەلاحە (ئەمینداری یەکگرتوو) گوتی نابێ ناوی کوردستان لەو مەنهەجەدا ببێ، ئێمەش گوتمان دەی بڕۆن خوا حافیزتان .. ڕۆیشتن.

**مەبەستم ئەوە بوو کە مامۆستا مەلا عوسمان بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی (الرابطه الاسلامی) دروستکرد؟**

- نا، رابیتەی دروست نەکرد، بزووتنەوەی لە ساڵی ١٩٨٧ دروستکرد، پێش ئەوەش هەر خەریک بووین و هاتوچۆمان دەکرد، هەتا ئەوکات لولەی تفەنگی جاش چاوی پیاوی دەردەهێنا، ئێمە لەناو جاشەکان شتمان دروست دەکرد، موزاهەرەمان دروستدەکرد.

**مەبەستم ساڵی ١٩٧٨ بوو؟**

- نا، ئێمە لە ١٩٨٧ بزووتنەومان راگەیاند.

**ئیعلانی بزووتنەوەنا، ئیعلانی رابیتە لە ١٩٧٨ بوو...**

- نا نا، ئێمە خۆمان جەماعەتێکمان نارد، ئێستا ئەو مەلا مەحمود ئازادیە مەوە، بزانە خۆم رەوانم کردن بۆ ئێران یان نا؟ دەیانگرتن، لە هەڵەبجە لەبەر من نەدەوێران بیانگرن، بەڵام لە سلێمانی دەگیران، ئەرێوەڵڵا من ناردمن، وەکو شێخ مەحمود بەرزنجی، مەلا مەحمود، مەلا عەلی بیارەیی، مەلایەکی دی لە پێنجوێن شەهیدبوو، بەڵام شێخ محەمەد ئێران خۆیان بانگیان کردو رۆیی.

**کاریگەری مامۆستا مەلا عوسمان نەبوو کە تۆش پەیوەندیت بەو حەرەکاتانەوە کرد؟**

- کورە ئێمە لە ژیانماندا هەر حەرەکی بووین.

**واتە کاریگەری برا گەورەکەت نەبوو؟**

- من لە هەموو شتێکدا تابعی بووم، بەڵام لە راستیدا ئێمە

باوکیشمان هەر حەرەکی بوو، وەختی خۆی لەگەڵ شێخ مەحموددا دۆست بووە.

**لەساڵی ١٩٧١ کە مەلا عوسمان لەناو ئیخوان کاری دەکرد، لەو ساڵەدا ئیخوان چالاکی خۆی راگرت تاساڵی ١٩٧٩؟**

- بەڵام خۆ ئێمە لەگەڵ ئەوان نەبووین، رەفزمان کرد.

**مامۆستا سەلاحەدین بەهائەدین دەڵێ مامۆستا مەلا عوسمان لەگەڵ ئێمەدا بوو....**

- ناوەڵڵا... ئێمە داوای حیزبێکی ئیسلامی موستەقیلی عێراقیمان کرد، بۆ ئەوەش ٣٦٠٠ ئیمزامان بۆ بەغدا برد، لەبەر ئەوەش ئیجازەکەیان دا، ئەگەرنا نەیاندەدا، بێگومان رای مەلا مستەفاشمان وەرگرتبوو، ئەمجا دوایی هاتینەوە خوا لێیان خۆشبێ شێخ عوسمان بیارەیی، مەلا صاحب، مامۆستا مەلا رەحیم لە سلێمانی، مامۆستا سەید عارف، هەروا لە هەولێر مەلا عەولای کونەفلوسەیی و مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی، هەرچی مەلا هەبوو یەکدەنگ بوون لەسەر پشتگیریکردنی ئەو مەسەلەیە، پشتگیریان کرد، ئیجازەکەش عەبدولکەریم قاسم نەیدا، دادگا دای، چونکە بوو بە جەماوەری.

**کێ بوو بە ئەمینداری گشتی؟**

- هەر ئەوکات کەسێکیان هەڵبژارد بەناوی مەلا نورەدین کە کوردبوو، خەڵکی کەرکوک بوو، بەڵام ئەو نەیکرد. دوایی لە نێوان

کاکم عوسمان و د. نعمان سامرائی که ئێستا له سعودیه‌یه مایه‌وه، کاکم عوسمان ره‌فزی کردو گوتی من ناتوانم هه‌ڵه‌بجه به‌جێبێڵم و ئه‌و مه‌سئوله‌ش ده‌بێ له به‌غدا بێ. بۆیه د. نعمان کردی.

**دوای ئه‌و گۆڕانکاریانه‌ی به‌سه‌ریدا هات، له ئێران کێ ئه‌میندارى گشتى ئیخوان بوو؟**

- نه‌ما دوای ئه‌وه‌ی که گیران.

**له‌ناو ئۆردوگاکان و خه‌ڵکی ئاواره له ئێران چالاکیان ده‌نواند....**

- ئه‌وه دوایی بوو، له دژی ئێمه‌ش بوو، ده‌چوون پاره‌یان ده‌دا خه‌ڵک، ده‌یانگوت مه‌بن به بزووتنه‌وه‌و گوناحه عه‌سکه‌ری عێراق بکوژن.

**- که بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی له ١٩٨٧ دامه‌زرا به ته‌وجیهی ئێران بوو، یان بیرکردنه‌وه‌ی خۆتان بوو، کێ یه‌که‌مجار فکره‌ی دامه‌زراندنی بزووتنه‌وه‌ی دانا؟**

- ئێران ده‌وری نه‌بوو له دروستبوونی بزووتنه‌وه‌دا. وه‌کو پێمگوتی له‌وه‌و پێش له‌گه‌ڵ مه‌لا مسته‌فا هه‌ماهه‌نگیه‌کمان هه‌بوو، له دواییشدا له بزووتنه‌وه‌ی کوردیدا، رۆژێک له رۆژان بێبه‌ش نه‌بووین له‌گه‌ڵیاندا، هه‌تا له زه‌مانی مه‌لا مسته‌فا، من خۆم چه‌ند جار به‌شداری جه‌بهه‌م کردووه.

**وه‌لامی پرسیاره‌که‌ت نه‌دامه‌وه، له ساڵی ١٩٨٧ که بزووتنه‌وه‌تان دامه‌زراند، بیرۆکه‌که هی کێ بوو؟**

- وەڵڵا بیرۆکەکە هی خۆمان بوو، هیچ کەسی دیکەی تێدا نەبوو، یەکەمجاریش دەستەڵاتدارانی ئێران نەیانهێشت بچینە ناو ئێران، تاگفتوگۆمان کرد، ئەوکات شەڕی عێراق- ئێران بوو، هەڵەبجە بۆردوومان کرا، ڕێیان لێگرتین، تەقەیان لێکردین، ئیمەش هەندێ خەڵکی عەشایەرمان بۆ لایان نارد، چوون پێیانگوتن ئەوانە مامۆستاکانی هەڵەبجەن، سەرداری ئەو ناوچەیەش گوتبووی ئێمە ناتوانین ڕێگایان بدەین، ئەمرمان پێکراوە لێرە کەس هاتوچۆ نەکا، بەڵام بانامەیەک بنوسن، ئێمە بەبێ سیم دەینێرین بۆ خامەنەیی وا لە کرماشانە ئەوکات سەرۆک کۆماری ئێران بوو، ئیتر من چووم لەگەڵ ئەفسەرەکان قسەم کردو گوتم من فارسی نازانم، گوتی بە عەرەبی بینوسە، بە عەرەبی نووسیم کە ئێمە لەگەڵ عێراق شەڕمانەو ئێوەش شەڕتانە، ئێستا هاتووین ئەگەر بەو ٨ برگەیە رازین پێین، ئەوە دێین، ئەگەرنا ئێمە تا ئاخیر قەترەی خوێنمان لێرە شەڕ دەکەین.

**ئەی ناوی بزووتنەوەی ئیسلامی کێ داینا؟**

- ئێمە خۆمان دامانناو، هەتا ناوی رادیۆکە (دەنگی ئیسلام) من دامنا، کابرای ئێرانی زۆری لاسەیربوو کە گوتم تەلەفزیۆنێک دادەنێین بەناوی دەنگ و ڕەنگی ئیسلام، بە رادیۆکەش دەڵێین دەنگی ئیسلام، بە فکرەی ئێمە زۆر سەرسام بوو. هەتا کە لەگەڵ دکتۆر ویلایەتیدا چووم بۆ ئەوروپا، کوڕی خۆم لەگەڵدا بووایە، قەسەم بەخوا ئەوەندە ئیتاعەی نەدەکردم. هەر شێخ شێخ و ئوستادی پێدەگوتم، خۆ ئێمە

منالّی ئێستانین. وەڵلاهی کاتی خۆی کە لەگەڵ مەلا مستەفا دەچووینە ژوورێک، فەرمووم لێکرد کە پێش من بکەوێ، گەڕایەوەو گوتی دەتەوێ خەجاڵەتم بکەی، گوتم (استغفرالله) جەنابت برا گەورەی و هەموو شتێکمانی، گوتی نا، نا شتی وانییە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم خۆ ئێمە منالّی ئێستانین برا! ئێستا هەندێک هەتیو پەیدابوونە.

**کە بزووتنەوە دامەزرا تۆ بووی بە جێگری رابەر؟**

- بەڵێ هەر ئەوکاتە منیان دەستنیشانکرد، زۆرم هەوڵدا کە من نەبم، بۆ وەفدی خارجییش کە یەکەمجار بۆ دەرەوە ناردمیان، زۆر ئیلحاحم کرد کە من نەچم، لێرە بەسەر پێشمەرگەدا بگەڕێم، هەروەها مەسئولی مەکتەبی عەسکەریش بووم، گوتم نایکەم، کەسێک لێرەبوو، مەیلی پارتی هەبوو، کوڕێکی باش و عەقید بوو، بڕیاروابوو بێتە دەرەوەو بیکەین بە مەسئولی مەکتەبی عەسکەری، گوتم بە شەرتێک دەیکەم تا کەسێک دێ، ئینجا ئەو شێخ محەمەد بەرزنجیە کاتی خۆی لە مەکتەبی سیاسی بوو، گوتی بابە تۆ خۆت لەوە مەشارەوە، ئێران هەر لە خامەنەییەوە هەتا خوارەوە حورمەتت دەگرن، عەشایەر نین دەترسێ، پێشمەرگە رێزت لێدەگرێ، تۆ دەورت هەیە، ئێستا من بڕۆم بڵێم کێم، کوڕی کێم، چیم کردووە! نەوەڵلا هەر دەبێ تۆ بیت، ئیتر ئیسراریان کردو منیش گوتم چارنییە فەرمانەو قبوڵی دەکەم. من دەمویست لە شوێنێکدا بەجیا دابنیشم و پاڵپشتی

بزووتنەوە بکەم، ئێرانیەکان زۆریان هەوڵدا کەمن چی بڵێم بۆم بکەن و بەشەرتێ جیابم وەکو ئیمام جومعەو هەمووجار بە دۆستێ ئیمام خۆشی ئامەد پێشوازیان دەکردم.

**کارێکی قورس نەبوو، دوو برا رابەرو جێگرین؟**

- ئاخر لەسەر ئەساسی برایەتی نەبوو، ئەسڵەن لە عولەمای عێراقیدا کەسێکی دیکەی وەکو کاکەم عوسمان نەبووە، نەک لێرە لە بەغداش، ئەگەر هەبووایە ئەو دەبوو، دواتر کاکەم عوسمان دەوری هەبووە، هەزاران مامۆستای کرمانشان و بانەو ئەو ولآتانە هەموو قوتابی ئەو بوون. ئینجا ئێمە وەکو خێزان و بنەماڵە ماڵی خۆمان سەرفکردووە، کاکەم عوسمان وەکو پێشمەرگەیەک جارجار مەعاشی وەردەگرت، شەخسیەن قەسەم بەخوا ئێستا حیسابی بکەم دووسێ ملیۆن دینارم بۆ خەڵک خەرج کردووە.

**کە بزووتنەوەتان دامەزراند، بە کۆبوونەوەبوو، یان بڕیارێک بوو لەلایەن مامۆستا مەلا عوسمان و جەنابت؟**

- ئێمە ئەوکاتە ناومان لێنەنابوو، چونکە حیزبی بەعس زۆر موسەیتەربوون، زۆریش مەلعون بوون، جارێکیان لەگەڵ (شوکر الحدیثی) کە پارێزگاربوو، ئەندامی (مجلس قیادە ثورە)بوو، تێکچووین ئەو گوتی من ئەندامی (مجلس قیادە ثورە)م و موخەوەلم، منیش گوتم من نوێنەری خوام لەو مزگەوتە، ئیتر خوا گەورەترە یان (مجلس قیادە ثورە)؟ بەلآم ئەو عەرەبانە هەندێکیان ویژدانیان

هەبوو، گوتی وەڵڵا (الله‌اکبر)، ئێ گوتم قسەت ماوە، گوتی ناوەڵڵا، بەخوای ئێمە هەمیشە راشکاوبووینە، بەخوای مەوزوعەکەش زیاتر لەسەر کوردایەتی و مەلا مستەفا بوو.

**کە بزووتنەوەتان دامەزراند ئێوە لە هەڵەبجە بوون؟**

- ئێمە لێرە کۆبوونەوەمان هەبوو، یەکەمجار کە کۆبووینەوە مامۆستا مەلا سالحی گەورە، کاک عوسمان، کاک عومەر، من و هەندێک خەڵکی دیکە بووین، ئەسڵی فیکرەکە هی ئەو سێ چوار کەسەبوو، خوالێیخۆشبێ شێخ جەمیل موفتیش لە هەموو فکرەیەکدا لەگەڵمان بوو، ئیتر ئێمە نیازمان نەبوو دەربچین، بەڵام خەبەری راستیان داینێ کە دەتانگرن و دەتانبەن بۆ بەغداو لەوێ هەرچی خۆیان حەز بکەن بۆتان دەنووسن و دەبێ لەسەر تەلەفزیۆن و رادیۆ، ئەو قسانە بڵێن، ئەگەر نەیڵێن ئەو وڵاتە نابیننەوە، ئەوە دۆستێکی خۆمان لە ئیدارەی پارێزگا پێیگوتین، من پێش ئەوە زیندانیکرابووم، ٦ ساڵ لە ناوچەی رومادی و ناسریە بووم.

- **مەلا سدیق لەگەڵتان نەبوو؟**

- نەخێر.

**لە دیانەیەکدا لەگەڵ (هەرێم) مامۆستا عەلی باپیر دەڵێ من ناوی بزووتنەوەی ئیسلامیم بۆ مامۆستا مەلا عوسمان پێشنیارکردو ئەوانیش قبوڵیان کرد؟**

- ئەسڵ و ئەساسی نییە، ئەسڵەن عەلی باپیر هەر نەماندیووەو

نەمان ناسیوە.

**دەڵێ هاتووچۆمان لەگەڵیان هەبووە؟**

- وەڵڵاهی درۆ دەکا، تەنها ئەوەبوو لەلایەن یەکێتییەوە فەرمانی گرتنی هەبوو، نازانم لەسەر چی بوو، ئێمەش کاغەزمان بۆ عەباسی بایز ئاغا نووسی، خۆی ئێستا ماوە، من شەخسیەن کاغەزم بۆ عەباسی بایز ئاغا نووسی، کە ئەم کوڕە دێتە لای جەنابت، دەبێ پارێزگاری بکەی.

**- کەواتە عەلی باپیرتان دەناسی؟!**

- وەکو قوتابی، وەکو منداڵێک دەمانناسی، دوای ئەوەی کە ناردمانە لای عەباس ئاغا ئیتر نازانم چۆنی تەکبیرکرد، بەڵام جارێکیان عەباس ئاغا گوتبووی وەرەقەی فورسانیم بۆ کردو لای خۆم دامنا، ٣-٤ ساڵ لای عەباس ئاغابوو، مووچەی دەدایێ، عەلی باپیر لای ئێمە بەخەوێک خۆی چەسپاند، ٢٠ شاهێد هەیە، ئێمە کە چووینە ئێران عەلی باپیر هەر لە بیرمان نەبووە، ئایا هەیە، نییە، ئێمە کە مەلاکانمان نارد بۆ ئێران دەمانگوت بڕۆن بزانن ئەو ئێرانە چی دەکا، ئایا راستە موسڵمانە، چییە، (صیادی شیرازی) لە نێوانماندابوو، بۆمان دەنووسین ئەگەر ئێوە موسڵمانێکی راستەقینەبن، تەماشای رەفتارو رەوشتتان دەکەین، ئەوە ئەهلی سوننە لە ئێران هەن، کورد هەن، ئەگەر راستتان کرد مەسەلەی شیعەو سوننەو فارس و

غەیرە فارسی تێدا نەبێ، ئامادەین پشتگیریتان بکەین، ئینجا وەک گوتم کە چووینە ئێران نامەیەکم بۆ خامەنەئی نووسی، ئەویش زۆر پیاوانە وەڵامی دایەوە کە قسەکانتان قبوڵەو وڵاتی خۆتانەو فەرموون، کە ئەمری کرد ئێمە ٦٠٠ کەسمان لەگەڵدابوو، بەلەمیان دابەست لە بەحرەکەوە رۆیشتینە ئەوبەرو پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لێکردین، وەزیری داخیلی و هەیئەتێک و نوێنەری خامەنەئی لە کرماشان هاتنە پێشوازیمان و بۆ کرماشان داوەتیان کردین و دواتر بۆ تاران یەکسەر بۆ لای خامەنەئی و رەفسەنجانی، بەڕاستی لەوێ چیمان گوت رازی بوون لەسەری، ئینجا باقر حەکیم هات بۆ لامان، شەخسیات لەملاولەولا بۆ لامان دەهاتن، ئینجا ئەو جەماعەتەی کە پێشتر ناردبوومانن، ئەو رابیتەیەی تۆ دەیلێی دروستیانکردبوو، شێخ محەمەد مەسئولیان بوو، بەڵام هەمووجار بۆ ئێمەیان دەنووسی، ئەگەر ئێوە نەیەن و فریامان نەکەون، گرنگیمان پێنادەن و دەڵێن ئێوە کەمن، ئێمەش ئەوکات بە بەرژەوەندمان نەدەزانی عێراق بەجێبێڵین، کە لە ئێران بووین بزووتنەوەمان دروستکرد، ئەو جەماعەتە هاتن تکایان کرد گوتیان دێینە ناو بزووتنەوە، ئێمەش گوتمان لاریمان نییە، بەڵام ئەو ناوەمان قبوڵ نییە، دوایی ئێوە کە هاتوون بەراستی بوون بە پیاوی ئێران، ئێمە لای خامەنەئیش گوتومانە، وصایەتی کەس قبوڵ ناکەین، هەموو دەسەڵاتێک دەبێ هی خۆمان بێ، ئەوانیش رازی بوونە، بەڵام ئێستا ئێوە وەکو پاسدارتان لێ هاتووە، ئەو قسانەمان بە

مەلا مەحمود گوت كە ئەوان ناردبوويان، دواتر بە شێخ محەمەدو ئەوانیدیكەشمان گوت، ئینجا ئێمە چووین و بڕیارماندا ناوی بنێین بزووتنەوەی ئیسلامی لە كوردستانی عێراق، ئەگەر عێراقمان نەگوتایە، لەوانەیە ئێران دەترسا لە كوردستانی ئێرانیش خەڵك وەربگرین، زۆركەس دەیوت باهەر ناوی كوردستان نێت، گوتمان نابێ ئێمە لە كوردستاندایین و پێشمەرگەشمان هەمووی كوردە.

**لە ئەندامانی سەركردایەتی هەبوون ئەو رایەیان هەبێ؟**

- نەخێر.. ئینجا دوای ئەوە ماوەیەكی پێچوو ئۆردگایان بۆ كردینەوە، لەشكرمان دروستكردو هێزمان هێنا، من خۆم لەگەڵ هێزێك كە ٧٠-٨٠ كەس بووین هاتم بۆ ناوچەی ماوەت و بڕیاربوو بچینە قەرەداغ. دوایی بروسكەیان بۆ كردم، گوتیان بگەڕێوەو من گەڕامەوەو لەوێ مەلا برایمی كاك عوسمانمان لەگەڵ جەماعەتەكە نارد، ئینجا ٣-٤ مانگ دوای ئەوە دووسێ كەس بۆ لای ئێمە هاتن، یەكێكیان سەید مستەفایەك بوو لە هەولێر كوژرا، ناوی لەخۆ نابوو محەمەد مەهدی، كە هاتن ئێمە لە ماڵی خوارزایەی خۆماندا لە ئۆردوگای سەریاس دەعوەت بووین، عەلی باپیریشیان لەگەڵدا بوو، گوتیان ٣-٤ قوتابی هاتوون دەڵێن دەمانەوێ چاومان بە مامۆستا مەلا عوسمان بكەوێ، كاكەم عوسمانیش گوتی بابێن نان بخۆن، هاتن بۆ ئەوێ، ئیتر عەلی باپیر تەبیعەتێكی هەیە، چونكە لە ماڵی خۆیان لە خۆی گەورەتری تیانەبووە، كە دەڕۆیی یەكێكی لەگەڵ بووایە

خۆی بەکێـخـوا دادەنا، ئێـمـەش پێـمـانخـۆش بوو کـوڕی گـەنج و ڕێکوپێک بێنە ناو بزووتنەوە، خواخوامان بوو یەکێک لە حکومەت جیابێتەوە، هات گـوتی من نەختێک پرسیارم لە جەنابی مامۆستا مـەلا عـوسـمـان هەیە، حـەزدەکـەم تۆزێک چۆلی بکەن، ٧-٨کـەس لە ژوورەکە بوون، جـەماعـەتەکە ڕۆیشتن دوو سێ کـەس ماینەوە، گـوتی قـوربان من نـەمـزانیـبـوو کـە جـەنابتـان هیـجـرەتتـان کـردووەو بۆ ئێـرە هاتوون، من لەوەوپێش جـارێکی دیکە هاتم بۆ لای مـامۆسـتـا شـێخ محەمەدو ئەوانە، بەڵام کەدیم ئەوان پیاوی پاسدارن، بۆیە لای ئەوان گلم نەخواردو بە مەئیوسی گەڕامەوە، بەڵام حەزم لە جیـهاد کردووە، گوتی لەو شەوانە خەونێکم بینی لە شوێنێکدا دانیشـتبووم،شوێنەکە وەکو گردۆلکەیەک بوو، ڕێگەیەکی لە بەردەمدا دەڕۆیی، خەڵک پێیدا دەڕۆیشتن، تەماشام کرد قەرەباڵغیەکی زۆر گەورە هات، یەکێک لە پێشیـانەوە بوو، زۆر عەجایەب و بەشەوکەت بوو، پرسیم ئەرێ ئەوە کێیە، گـوتیـان پێغـەمبەرەو سەحابەکان لە خزمەتیدا دەڕۆن، منیش رامکرد بکەومـە شـوێنیـان، تامن گـەیشـتـمـە سـەر ڕێگاکـە ئەوان قـەدەرێک ڕۆیشتن، دوایی یەکیـان لەدواوە بەدەست ئیشـارەتی کـردو گوتی مەیێ، گـوتی هەر ویستم بچم، ئەو وەکو حەرەس لە پشتەوەبوو دەیگوت مەیێ، ئاخیرجار کە هەر ویستم بچم، ئاوڕی داوەو بە دەست ئیشارەتی بۆ دواوەم کرد کە بۆ دواوە بگەڕێمەوە، منیش ئاوڕم دایەوە قەرەباڵغـیەکی دیکە بەهەمـان ڕێگادا دەهات، تەماشام کرد جەنابت

مامۆستا مەلا عوسمان لە پێش هەموویانەوە بوویت. منیش وەستام تا ئێوە هاتن، مامۆستام ناسی و چەند کەسێکی دیکە کە لە خزمەتیاندابوون ناسیم، بەڵام هەموویم نەناسی، منیش هاتم دەستی جەنابتم ماچ کردو کەوتمەتەکتا ، لە پاشان لەپڕ خەبەرم بووەوە. . کاکەم عوسمان پێیگوت ئەو خەونەت چۆن لێکداوە، گوتی قوربان وام تەئویل کرد ئەوە پێغەمبەرەو رێڕەوەکەی پێغەمبەر رۆیی و من لە زەمانێکی تردام، فریای نەکەوتم، ئیتر ئەو رێڕەوەی جەنابتان وەک رێڕەوەکەی پێغەمبەرەو من کە لە خەوەکە هەڵسام، بڕیارمدا بێم بۆ ئێرەو بکەومە تەک ئێوە، ئەوە مەسیرەکەی پێغەمبەرەو تەواوە، ئیتر کاکەم عوسمان گریاو گوتی خوا دەکا قبوڵمان دەکات، بەخوا ئێمەش مەبەستمان دینەو مەبەستمان ئەوەیە ئەو میللەتەی خۆمان چیدیکە ژێردەست نەبێ، گوتی قوربان من لە خزمەتتاندام، ئینجا داوایکرد بەیعەت بکا ، کاکەم عوسمانیش بەیعەتەکەی قبوڵکرد، دوای ئەوەی رۆژێک مایەوەو بە کاکەم عوسمانی گوت قوربان دەمەوێ بگەڕێمەوە تەوجیهاتێک دەدەم بە خەڵک، ئەویش گوتی باشەو مەلا مەحمودیشی لەگەڵدا نارد، ئەوکات شێخ مستەفای زینویێ کە موستەشاربوو تازە لە ناو رژێم دەرچووبوو، جەماعەتی یەکێتی چەک و پارەوشتیان لێسەندبوو، ئەویش خەبەری ناربوو کە من هەر بۆ لای ئێوە هاتووم و بەڵام وا لێرە تووشی ئەو بەزمە بووم، ئێستا وا لە ناوچەکەی خۆمانم، کەسێک بۆ لام بنێرن، کاکەم عوسمانیش بە عەلی

باپیرو مەلا مەحمودی گوت ویستم عەلی برام بنێرم، بەڵام مادام ئێوە دەچن، هەندێک پارەو یەک دوو دەمانچەش بوو، پێیدان گوتی بیدەن بە شێخ مستەفا ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ لای شێخ مستەفاو لەوێوەش لەسەر تەوجیهاتی شێخ مستەفا بگەڕێن، بەڵام دیاربوو وەکو دواتر شێخ مستەفا باسیکرد، نەچووبوون بۆ لای شێخ مستەفا بۆ شوێنی دیکە چووبوون و زۆر گەڕابوون بەناوی نوێنەری بزووتنەوە.. ئەوجا ئەوەبوو مەسەلەی عەلی باپیر، کە پاش ئەوەی هەموو شتێک تەشکیل کرابوو، ئینجا هات، لە ڕانیەوە هات، وەکو گوتم ئێمە حەزمان دەکرد یەک زەلام بێت بۆ لامان، هەر چەندە لە ناوچەی ڕانیەو قەلادزێوە نامەیەکی زۆریان نووسیبوو، جەماعەتێک ئیمزایان کردبوو کە ئەم شەخسە وەرمەگرن و زۆر خەتەرەو مەلاو شێخ و سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکە لێی ڕازی نین، بەڵام ئێمە گوێمان پێنەدان.

**ئێوە کردتانە ئەندامی شورا؟**

- ئەو وەختە نەبووە شورا، وەکو ئامر هێزێک بوو.

**ئەو دەڵێ لە ١٩٨٨ بوومە ئەندامی شورا؟**

- نا، ڕاست نییە.

**بە کۆنگرەبووە ئەندامی شورا؟**

- ئێمە ئەوکاتە بڕیارماندا هەر کەسێک لە هەر شوێنێکەوە بێت و خەڵکێکی لەگەڵدا بێت بیکەینە ئەندامی شورا، تەنزیمی نەبوو، هەتا کابرایەک بە تەنیا لە دهۆکەوە هاتبوو کردمانە ئەندامی شورا، بۆ

ئەوەی نوێنەری ئەو ناوچەیە بێ کە لێی هاتووە.

**مەلا کرێکار لە ساڵی ١٩٨٧ لە پاکستان بوو، لە ساڵی ١٩٨٨ کە هاتەوە پەیوەندی بەئێوەکردو یەکسەرکردتانە ئەندامی شورا، بۆچی خەڵک بە ئاسانی دەبووە ئەندامی شورا؟**

- راست دەکەی زۆر ئاسان بوو، بە راستی راستە ئێمە حەرەکی بووین و دینمان خۆش دەویست، بەڵام هیچمان لێنەدەزانی، وەکو پارتی و یەکێتی نەبوو، کابرایەک بێ بڵێین ئادەی برۆ دوو زەلام بکوژە، ئینجا قسەت بۆ دەکەم، هەر کەسێک دەهات قسەی خۆشی دەکرد، دەمانکردە مەسئول، جارێ کە عەلی باپیر خەوەکەی گێڕایەوە، لەبەر چاوی کاکەم عوسمان بووە هەموو شتێ، گوایە ئەوە لەخەودا پێغەمبەری دیوە، کوڕە بابە کێ دەڵێ راست دەکا!؟ دوایی رەفیقەکانی خۆی پێیاندەگوت ئەگەر ئەو خەوەت راستبووە، مانای وایە تۆ تەمەرودت لە پێغەمبەر کرد، ئەگەر خەوەکەت درۆبووە، ئەوە هەر لە ئەوەلەوەماڵت وێران بووە.

**دوای ئەوەی مەلا کرێکار لای ئێوە بووە ئەندامی شورا، هەر زوو تەمەرودی کردو لە ساڵی ١٩٩١ چووە سۆران و بارەگایەکی کردەوە، لەسەر چی بوو؟**

- دەزانی چییە؟ ئەو بزووتنەوەیە وەکو تەجەموعێک بوو، خەڵک لە دژی بەعس و بارودۆخە خراپەکە کۆببوونەوە، ئەوەنەبوو لەسەر ئەساس و تەنزیمێک بێ، نەوەڵڵا هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو، ئەو مەلا ئەمینە کە وەختی خۆی کوشتیان یەکێ بوو لەوانە، من چووم وتم بابە مزگەوت داگیرمەکە، کەچی پێشمەرگەکانی هەموو بەرامبەر ئێمە لە حاڵەتی ئامادە باشی وەستابوون، پێم وت هەتیو ئێستا من تۆ بکوژم، خەڵک چیم پێ دەڵێن، کە گەڕامەوە فەرمانێکمان دەرکرد کە ئەو کەسە هی

ئێمە نییە، یەکسەر چوو، بووە یەکێتی، ئەو جارە لە یەکێتییەوە هات بۆ لای پارتی و بووە پارتی، پارتیش لە بەستۆرەی دانا، پاش ماوەیەک کوژرا، ئیتر رەفیق خۆی کوشتی، یان؟ نازانم چۆن کوژرا...

**شێخ زانا لە ئیعترافاتەکانیدا دەڵێ من کوشتم...**

- وەڵڵاهی هەر ئەو ئیشەی باش بوو، ئەوانی دی هەمووی خراپ بوون، بەڵام ئەوەی باش بووە.

**لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢، ئێوە مامۆستا مەلا عوسمانتان دانا بۆ رابەری هەڵیبژێرن؟**

- ئەوە خەڵک داینا، بەڵام من هەتا کاک نێچیرڤان باش دەزانێ کە من بووم، مەلا ئەحمەد بوو، نێچیرڤان بارزانی بوو، ئازاد بەرواری بوو، جەماعەتێک بووین لەسەر ئەو مەسەلەیە دانیشتبووین، وتیان ئێوە کێ هەڵدەبژێرن بۆ رابەری، گوتم من کاک مەسعود هەڵدەبژێرم، کاک نێچیرڤان گوتی لەبەرچی؟ گوتم وەڵڵا لەبەر ئەوەی کوڕی مەلا مستەفایەو کە قسەشم لەگەڵ کردووە بەبێ ئیمانی نازانم، ئیمانێکی هەیە، ئینجا رابەری کوردستانیش بە ئێمە ناکرێ، دەکرێ راوێژکارێکی دینی بین و کاک مەسعودو مام جەلال بە قسەمان بکەن، بەڵام کاک مەسعود بناغەو ئەساسێکی هەیەو خەڵک دەیناسێ و ئیمکانیاتێکی هەیە، باوکی بناغەیەکی بۆ دروستکردووە، ئێمە بناغەی دینی و مەلایەتیمان لە جیهانی ئیسلامیدا هەیە، ئێستا من بچم بۆ میسر وەکو ئەوەیە بچمە ماڵی خۆمان، زانایانی دینی و شێخی ئەزهەرو هەموویان دەناسم، بۆ سوریا، بۆ تورکیا بۆ هەر وڵاتێک بچم ئاوایە، بەڵام لەبارەی مەسەلەی کورد، ئەوەی بە کاک مەسعود دەکرێ، بە ئێمە ناکرێ.

**ئەی بۆ مەلا عوسمانتان هەڵبژارد؟**

- نا، نەمانکرد، ئێمە ئەو بڕیارەمان سەحب کردەوە، لەسەر ئەوەش مام جەلال تۆزێک لێمان عادز بوو.

**بەلام چووە هەڵبژاردن و خەڵک دەنگی بۆدا؟**

- رەنگە خەڵک دەنگی پێیدابێ، بەلام ئێمە بڕیاری خۆمان دابوو کە ئەوە بە ئێمە ناکرێ.

**ئێوە کە لە ساڵی ١٩٩٤ لەگەڵ یەکێتی بەشەڕ هاتن و شەڕێکی چەکداریتان کرد، تەسەورتان دەکرد دەرەقەتی یەکێتی دێن بۆیە ئەو شەڕەتان کرد، یان نەتان دەزانی کە ئەوە لە ئەساسدا شەڕێکی دۆڕاوە، چونکە هێزی ئێوە لە ئاستی هێزی یەکێتی دا نەبوو؟**

- ئێمە هیچ کاتێک شەڕمان نەکردووەو حەزمان لە شەڕ نەکردووە.

**بەلام شەڕەکە بوو..**

- ئاخر لە گەرمیان، یان لە رانیە لەسەر شتێکی شەخسی هەڵیاندەگیرساند، دەهات ئێمەشی دەگرتەوە، دەنا قەت ئێمە لەگەڵ شەڕ نەبووینەو بڕیاری شەریشمان نەداوە.

**بۆچی زوو کۆنترۆڵتان نەدەکرد؟**

- وەکو پێمگوتی هەریەک لەلایەک مەسئولێک بوو، مەلا ئەمینێک بەناوی جیهادو عەلی باپیرێک لە لایەک و لەو لاوە کرێکارێک، ئێمە هەر بەناو مەسئول بووین، هیچ سەیتەرەمان نەبوو، ئەگەر هەمانبا، وای لێنەدەهات.

**تۆ لە ساڵی ٢٠٠١ نامەیەکت بۆ پیاو ماقولانی سیروان نووسیوە، لەوێ دەڵێی هۆکاری داگیرساندنی شەڕی یەکێتی و بزووتنەوە دلشاد کەلاری و عەلی باپیربوون، خەڵکێکی دیکە عەبدولقادر برایەتی**

**تاوانبار دەکا بەوەی کە ئەو دەوری هەبووە لە داگیرساندنی شەڕ...**

- نا، عەبدولقادری برایەتی لە هەولێر بوو، لە دواییدا بۆ شەڕەکە هات، کاتی خۆی شەوکەتی حاجی موشیر لە دێیەکەی خۆیاندا خانوویێکی دروستکردبوو، ئێمە لەگەڵ یەکێتی بەینمان ناخۆش بوو، بەڵام نەماندەویست ئەو شتانە درێژە بکێشێ، دلشاد کەلاری جەماعەتێکی هێنابوو تابچن خانووەکەی شەوکەتی بتەقێننەوە، ئێمەش بەوە رازی نەبووین و دوایی لەسەر ئەوە جۆرە تێکچوونێک لەنێو خۆماندا بوو، یەکێتی چەند جار هەوڵیدا پارمەتیمان بدا دژی ئەوان، ئێمە نەمانکرد، ئەوانیش هەوڵیان دەدا شەڕ لە نێوان ئێمەو پارتی و یەکێتی دروست بکەن، بەڵام هەر خۆمان لادەدا، بەتایبەتی بە تەوجیهاتی خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا عوسمان، چونکە ئەو زۆر لاشەڕ بوو، وەڵڵاهی کە شەڕمان بوو گوتیان جەماعەتێکی یەکێتی کوژراون، بۆیان گریا، دەیگوت ئەوە بێ بەختیە، ئێمە کەی چەکمان بۆ ئەوە هەڵگرت لەگەڵ کورددا شەڕ بکەین.

**دەڵێن شەڕەکە بۆیە دروستبوو، پێشمەرگەیەکی بزووتنە کوژرابوو، بەڵام بەمەراسیم ناشتتان و مەراسیمەکەش بەپێش کۆمیتەی رانیەی یەکێتیدا چووبوو و لەوێ شەڕ دروستبوو، عەلی باپیر داوای کردبوو بامەراسیم نەکرێ، لەبەر ئەوەی وەزعەکە ئاڵۆزە، بەڵام مامۆستا مەلا عوسمان گوتبووی بامەراسیم بکرێ...**

- بەپێچەوانەوە، عەلی باپیر گوتبووی بامەراسیم بکرێ، مامۆستا مەلا عوسمان هەر لەهەڵەبجە بوو، وەڵڵاهی ئەو قسانە ئەسل و ئەساسی نییە، ئەوانە مێژوو هەڵدەگێرنەوە، ئەو پیاوەی کە کوژرا پیاوێکی چاک بوو، ناوی محەمەد سوڵتان بوو، ئەوە کوڕەکانی هەر

لەگەڵ ئێمە بوون، وەڵلایی ویستی بەتایبەتی ئەو شەڕە دروست بکا، چونکە وەختی خۆی لەسەر مەسەلەی ژن و شتی وا غەرەزێکی تایبەتیان لەو محەمەد سوڵتانە بوو، سوێند بە قورئان ئێستا مەلا عەلی مامک ماوە، تەکبیریان کردبوو بچن محەمەد سوڵتان بکوژن، ئەو کاتە لە بێتواتە بووم، مەلا عەلی مامک هات بەمنی گوت کە شتێکی واهەیە تۆ رازیت، گوتم نەوەڵڵا، ئەوکات مەلا شەریف مەسئولی مەکتەبی عەسکەری بوو، بانگم کرد گوتم شتێکی وەها هەیە، گوتی وەڵڵا ئەوە بڕیارێک دراوە، گوتم بڕیار بەبێ ئێمە چۆن دەدرێ، کاکەم عوسمان زانیویەتی، گوتی ناوەڵڵا جانەو بزانێ چۆن دێلێ، پێمگوتن وەڵڵاهی بەپێش دەرگاکەشیان دابڕۆن، من تۆ دەکوژم، چۆن شتی وا دەکەن، ئێوە دەتانەوێ شەڕ بۆ ئێمە دروست بکەن، ئینجا کە پرسیارم کرد بۆم دەرکەوت کە لەگەڵ عەلی باپیر دوژمنداریەکی کۆنیان لە نێواندا هەبووە. وەڵلایی برام ئەو شتانەی گوتوویانە ئەسل و ئەساسی نییە، ئەوانە دەڵێی شەیتانن دەچن خەڵک لەو نەوعەشتانە تێدەگەیەنن، وەڵڵاهی قەت لەشەڕ نەترساوم، وەختی شەڕ بووبێ، هەرچی تۆپی دنیا باریبێ، وامدەزانی مێشوولەیە، چوومەتە ناو شەڕ، خەڵکم هانداوەو لە پێش هەموویان بووم، هەتا پێشمەرگەکان دەیانگوت مامۆستا تۆ مەڕۆ، کوڕە گوتم جیهاد دەکەم، کابرا دێتە سەرم، چۆن نارۆم، ئیتر بەپێش هەموویان دەکەوتم، قەت نەشترساوم، بەڵام بە ژیانیشم حەزم لە شەڕ نەکردووە، خەڵکیشمان لە یەکێتی گرتبێ ئێستا زۆریان ماون قەت نەمهێشتووە بیانکوژن، گوتومە هەر کەسێک یەکیان بکوژێ، دەیکوژمەوە. هەزاران ئەسیرم بەردان، نەمهێشت کەس بکوژرێ، مەگەر نەمزانیبێ.

**سالی ١٩٩٣-١٩٩٤و لەکاتی هەڵبژاردنیش، لە شارەکان دوکانی مەشروب فرۆشی لەلایەن بزووتنەوە دەتەقێنرایەوە، ئافرەتی مۆدە هۆیهای لێدەکرا، تیزاب بە قاچی دادەکرا...**

- ئەوە هەمووی دژی ئێمە بووە، وەختێ خۆی سیروان جاف کە ئەوکاتە وەزیر بوو لە حکومەتی بەعس، خۆی هات تەشەبزی پێکردم کە حکومەت لێرە ئۆرزدییەک دابنێ، وتم بە شەرتێ عەرەقی تیانەبێ. من عەرەقخانەی هەڵەبجەم دەرکرد، گاوری تێدابوو، ویستیان ماڵیان بۆ دروست بکەن، من دەرمکردن گوتم نابێ عەرەقفرۆشی لێرە هەبێ، بەڵام قەت رازی نین بەو حیزە فیعلانە کە دەچن پیرەژنێک دەکوژن، کابرایەک لێرە بەڕێوەبەری هەواڵگری گشتی بوو، مەلا عەلی بیارەییان گرتبوو، منیش لێم کۆلیەوە بۆم دەرکەوت بە فەرمانی غسان العسکری گیراوە، لە پێش چاوی قایمقام، بەڕێوەبەری پۆلیس، بەڕێوەبەری هەواڵگری بانگم کردو پێمگوت ئەم مەلا عەلیە بکوژرێ، بچیە ژێر باڵی هەور دەتکوژمەوە ، دوایی نەڵێن فلان راپۆرتی ناردو فلان وتی، قەسەم بە عیزەتی خوا دەتکوژم، گوتم تۆ گرتوتە، تا ٤٨ سەعاتی دیکە نەیهێننەوە ئێرە، قەسەم بە عیزەتی خوا ئیجرائاتتان لەگەڵ دەکەم، وەڵڵا چاری نەما ، بروسکەی کردو بەریاندا.

**واتە لەگەڵ ئەوە نەبووی دوکانی مەشروبفرۆشی لەشار بتەقێنرێتەوە؟**

- نا ، لەگەڵ ئەوە بووم دەریبکەن و نەیهێلن.

**بەڵام حکومەت هەیە، نیزام و قانون ئەو مەسەلانە رێکدەخەن...**

- قانونێک ئەوەندە گەواد بێ، ئیجازەی ئەوەبدا عارەق لەسەر جادە دابنێ، من قانونی ئاوام بۆ چییە؟

**ئەی بۆچی هۆیها لە ئافرەتی مۆدە بکرێ؟**

- ئەوە نابێ. ئێمە بە مەوعیزەو نەسیحەت گوتومانە ئافرەت باوابێ، قەت لەگەڵ ئەوە نەبووینە ئافرەت ناوچاویشی لێ گرژ بکرێ، ئەو خۆی مادام وا ئیختیار دەکا، ئارەزووی خۆیەتی.

**کتێبخانەی بیر لە هەولێر تەقێنرایەوە کە تەنها کتێبی مارکسی تێدابوو، لە کاتێکدا زۆر کتێبخانە کتێبی ئایینی دەفرۆشن، کەسیش کاری بەسەریانەوە نییە بۆچی وادەکەن؟**

- ئەوە نەفەرمانێکی رەسمی بووە، نەئێمە گوتومانە برۆن وابکەن، چونکە ئەوە زیانی بۆ خەڵکی دیکە هەیە، قەیناکە گەر خۆپیشاندانێک بکرێ و بڵێین ئەوە دینی ئێمە قبوڵ ناکاو ئەوە خورافیاتی مارکسیە، بەڵام لەگەڵ تەقاندنەوە نین، وەک ئێستا دەچن ئۆتۆمبێل دەتەقێننەوە، ئێمە ئەو جۆرە کارانە بەشەرعی نازانین.

**ئەوکات ئێوە بۆچی هەڵوێستێکی توندتان لە بەرامبەر ئەو کەسانە وەرنەدەگرت کە ئەو ئیشانەیان دەکرد؟**

- لەبەر ئەوە یەک و دوو و سێ و چوار و پێنج نەبوون، بەرگریشیان لە یەکتری دەکرد، ئائەوانەبوون کە ئێستا یەکیان جوندو ئیسلامەو یەکێک نازانم چییە، ئەوکاتە نەئێمە بەوان رازیبووین، نە ئەوان بە ئێمە رازی بوون.

**ئێوە کە لەگەڵ یەکێتی شەڕتان کرد، لە هەموو ناوچەکان وەک یەک شەڕتان نەدەکرد، لە هەولێر شەڕەکە ئەهوەنتر بوو، وابزانم لە هەڵەبجە هەر نەکرا، لەکاتێکدا لە رانیە شەڕ گەرم بوو، خەڵکی بزووتنەوە هەموو تەفروتونابوون، ئیزدواجیەتێک لە سیاسەتەکە هەبوو، ئایا تەوجیهاتێکتان نەبوو بۆ هەولێرو هەڵەبجە کە دست بەشەڕ بکەن، چونکە ئێوە یەک حیزب بوون، بارەگاتان لە هەر شارێک بێ هی**

**بزووتنەوە بووە؟**

- ئێمە بروسکەی کۆمان هەیە، هەتا لە شەڕی ئێمەو یەکێتیدا، من مەسئولی مەکتەبی عەسکەری بووم، بروسکەم داوە کە هێرش مەکەن، کەس مەکوژن، هەتا لە تواناتان دادەبێ، باکوشتار نەبێ، بەڵام ئەگەر کەسێک هاتە سەرتان بەرگری لە خۆتان بکەن، ئەمەش بزانە ئێمە بێ هێز نەبووین، بەڵام شەڕمان نەدەکرد، ئەگینا هێزی ئێمە لە هیچ نەدەترسان.

**دوایی شەڕەکە کرا. مەبەستم ئەوە بوو ئێوە چۆن رازیبوون، مەلاغەنی بۆ خۆی لە هەولێر دانیشێ شەڕ نەکا، یان هەندێک لە هەڵەبجە بەهەمان شێوە، کەچی لە شوێنەکانی دیکە بە گەرمی شەڕ دەکرا؟!**

- مەلا غەنی بە گوێی دەکردین، دەمانگوت مەلا غەنی شەڕ مەکە، ئەویش بەخوارەوەی دەگوت شەڕ مەکەن، لە سلێمانیش هەبوو بە گوێی دەکردین، ئەوەشی کە بەگوێی نەدەکردین هەر دەیویست شەڕەکە گەرمتربێ.

**باشە ئەگەر مەراسیمەکە نەکراباو هێرش بۆ سەر کۆمیتەی رانیە نەکرابایە ئەو شەڕە هەر دەکرا؟**

- نەوەڵڵا.

**کەواتە بزووتنەوە موسەبیبی شەڕەکەیە..**

- ئیتر.....

**ساڵی ١٩٩٦ بزووتنەوەی ئیسلامی (٧) پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی تەسلیم بە ئێران کرد...**

- ئەسل و ئەساسی نییە، تۆ وەکو رۆژنامەنووسێک چۆن ئاوها بەیەقینیەوە ئەوە دەڵێی؟

**لە دیانەی مامۆستا عەلی باپیر لەگەڵ هەرێمدا دەڵێ من دژی ئەوە بووم کە ئەو ٧ کەسەیان تەسلیم کرد؟ هەروەها ئەوکاتەش حیزبی دیموکرات قسەی کرد..**

- قسەی کرد ئێمە جوابمان دانەوە، وتمان بێن بەشەرعی ئیسپاتی بکەن، ئێمە هەر کەسێک ئەو کارەی کردبێ چاوی دەردەهێنین، وەڵڵایی کوڕی خۆمان بێ، تەسلیمتان دەکەین، هەرچی دەڵێن دەیکەین مفاوەزەمان لەگەڵ کردن، نامەمان نووسی، بەیانمان دەرکرد.

**دیارە حەوت پێشمەرگەکە وجودیان نەما بۆیە حیزبی دیموکرات دەڵێ تەسلیم کراونەتەوە؟**

- ئاخر قەیناکە، ئەو حەوت پێشمەرگەیە مریشکی مەکینەبوون، چی بوون، بۆ تەقەیەک نەبوو، کێ زانی، چۆن گیران، چۆن تەسلیم کران، جارێ قەسەم بەخوا ئێران بە حەیاتی هەرقی لە ئێمە بووە، لەبەر ئەوەی ئێمە دیفاعمان لە جەماعەتی دیموکرات و ئەوانە دەکرد، وەڵڵایی کاکەم عوسمان لەلای خامەنەئی گوتی ئەگەر ئاوا بڕوا، حکومەتی ئیسلامیەکەتان لێ دەبێتەوە، کورد میللەتێکەو داوای حەقێکی خۆی ددکا، خۆ ئێستا فەرمانبەرێکی کورد لە ناوچەی کوردستانی ئێراندا نییە، گوتی وەڵڵا راستە نیشاءالله تەکبیری دەکەین بەس ئێمە نامانەوێ کەسانێکی مارکسی خۆیان بکەن بە خاوەنی کوردستان، بەوە جوابی داینەوە.

**- محەمەد بازیانی ماوەیەک ئەندامی شورابوو لە بزووتنەوەی ئیسلامی کتێبێکی نووسی لەسەر ئێوە، بەناوی واقیعی بزووتنەوەی ئیسلامی ـ گیروگرفت و چارەسەر. لەوێ تۆزێک هێرش بۆ سەر جەنابت و مامۆستا مەلا عوسمان دەبا، دەڵێ سالانی ١٩٩٢-١٩٩٣**

**وەفدێکی بزووتنەوە بەسەرپەرشتی مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز، بەرەو دەرەوە بەرێکەوت، سەفەرێکی دیکەش لە ساڵی ١٩٩٣ بوو بەسەرپەرشتی مامۆستا مەلا عوسمان، دەڵێ لە دەرەوە پارەوپولێکی زۆریان کۆکردەوە، بەڵام مامۆستا مەلا عەلی کە هاتەوە هیچ باسی ئەو پارەوپوولەی نەکرد کە بۆ بزووتنەوەی کۆکردبووەوە، هیچ دەنگی نەکرد، دەڵێ تائێستا ئەو پارەیە باسی لێوە نەکرا، دەڵێ جاری دووەمیش کە مامۆستا مەلا عوسمان لە مەسیف بوو، دوای ئەوەی کە گیراو چووە لای پارتی و لەوێندەر بوو، دەڵێ بەناوی ئەوەی کە وەزعی بزووتنەوە خەراپ بووە، یارمەتیەکی زۆر کۆکرایەوە بۆ بزووتنەوە، بۆ ئەوەی تۆزێ خۆی کۆبکاتەوە، دەڵێ ئەو پارەوپوولە درا مامۆستا مەلا عوسمان لە مەسیف، تائێستاش ئەو یارمەتییە هیچ دەنگی لێوە نەما...**

- وەڵڵاهی ئەو شتانە ئەسل و ئەساسی نییە، جارێ من چووم بەڕاستی کەسایەتیەکان یارمەتیان دام، منیش بەوەسل تەسلیمی دارایی خۆمانم کردو ئێستاش کامیلی حاجی عەلی ماوە، بەڵام مەلا مەغدید نەماوە خوا لێیخۆش بێ، من وەسلەکانیشم ماوە، چی هەبووبێ هەمووویم تەسلیمی ئەوان کردووە، من هەتا یەکێک لەوانە جارێکیان ئەو شێخ لەتیفەم لەگەڵدا بوو گوتی وەڵڵاهی مەگەر عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەمەی کردبێ، تۆ نەیکەی، قەسەم بە عیزەتی خوا، من خۆم شکور پارەم هەبووە هیچ وەختێ موحتاج نەبووم، وەڵڵاهی وەختی کە چووم، بۆ لای مەلا مستەفا وتی زانیومە فەسلکرای و نازانم چی و وبستی هەندێ پارەم بداتێ، گوتم: باسی پارە بکەی، ئەوە ئاخیر جارە دەتبینم، من بەمەلایەتی ئیدارە دەکەم، تۆ خەڵکێکی زۆر دەورەی لێداوی و شەهیدت هەیەو خەڵک خۆی بۆت بە کوشتداوەو پێشمەرگە

هەیە، قەسەم بە خوا لێم وەرنەگرت، مستەفا ئاغایەکی لەلابوو، ئەو مستەفا ئاغایە پارەکەی هێنا بیخاتە ناو تورەکە، نەمهێشت گوتم نەء، ئەگەر عەبایەک، یاشتێک بێ قەیناکە، بەڵام پارەم قبوڵ نییە.

**ئەی کێشەی محەمەد بازیانی لەناو بزووتنەوە لەگەڵ جەنابتان لەسەر چی بوو، کە دوایی بزووتنەوەی بەجێهێشت و وازی هێنا؟**

- وەڵڵا محەمەد بازیانی ئێستاش لەگەڵ ئێمە کێشەیەکی نییەو خۆی بەدڵسۆز دەزانێ، بەڵام ماوەیەک کردمان بە وەزیر، لەگەڵ مەلا عەبدولغەنی، لەگەڵ مەلا غەنی رێک نەبوون، ئەو دەیویست مەلا غەنی دەربکرێ، مەلا غەنیش دەیویست بازیانی دەربکرێ، زۆریشمان هەوڵدا رێک نەکەوتن.

ئینجا لە دوایدا کە ئێمە لەگەڵ یەکێتی سولحێکمان کرد، پارتی وەزیرەکانی ئێمەیان ئیقالە کرد، ئینجا محەمەد بازیانی لە راستیدا مەیلی هەبوو لێرەش بکرێ بە وەزیر، نەکرا، چونکێ نۆبەی ئەوان نەبوو، نۆبەی جەماعەتێکی دیکە بوو، ئیتر ئەگەر لەبەر ئەوە زویر بووبێ.

**کێ پێشنیاری کرد محەمەد بازیانی ببێتە وەزیری کشتوکاڵ لە هەولێر؟**

- وەڵڵا ئێمە خۆمان، وەختی کاک مەسعود پێی گوتین دوو وەزیرتان بۆ دانراوە، ئیتر لەبەر ئەوەی مەلا غەنی خۆی لەوێ بوو، محەمەد بازیانیش دەیگوت من موهەندیسی زراعیم، بەگوێرەی پسپۆڕی دامانا.

**بازیانی کە بزووتنەوەی بەجێهێشت بە ئێوەی گوت لەبەر ئەو خیلافاتانە بزووتنەوە بەجێدێڵم؟**

- وەڵڵا ڕەخنەی دەگرت، بەڵام ئێستاش نەیگوتووە، من بزووتنەوە نیم و بەرەسمی دەستی لەکارنەکێشاوەتەوە.

**بەڵام خۆی بە کەسایەتی سیاسی سەربەخۆ، یان کەسایەتی ئیسلامی دەناسێنێ! دەڵێ لە بزووتنەوە نەماوم؟**

- ئێمە مانعمان نییە، نەبەکەسمان وتووە، وەرە، نەبەکەسیشمان گوتووە برۆ، هەر کەس بە کەیفی خۆی هاتووەو هەر کەس بە کەیفی خۆی ڕۆیشتوە.

**ئێستاش پەیوەندیتان لەگەڵی باشە؟**

- خراپ نییە.

**سەردانی ئێرە دەکا؟**

- وەڵڵا زوو دەهات، بەڵام بەینێکە دیار نییە، بەڵام سەلام و دوعای هەر هەیەو دەینێرێ.

**کە مامۆستا مەلا عوسمان لەو شەڕەی لای ڕانیە گیرا مامۆستا سدیق کە برا بچووکتان بوو، ئەو مەوقیفی چۆن بوو کە برایەکی گیراوە، چونکە ئەوکاتە ئەو حیزبێکی دیکەی هەبوو؟**

- ئاخر حیزبەکەی ئەو خۆ چەکدارنەبوون، جەماعەتێ موعەلیم بوون، ئەویش وەکو ئەو عالەمە پێیناخۆش بوو، موتەئەسیربوو، بەڵام چی بکا.

**یانی وەکو ڕاپەڕینی ئیسلامی پشتگیری ئێوەیان نەکرد، بەپارە بە چەک؟**

- نا، نەیاندەتوانی. دەستەڵاتێکیان نەبوو...

**بۆچی لەو حیزبە ئیسلامیانە بزووتنەوە گرووپی توندڕەوی لەناو دروست بوو؟**

- خۆی هەمیشە چەک وایە، لە راستیدا وەختی خۆی کە بادینانیان سوتاندو قەرەداغیان سوتاندو هەڵەبجەیان کیمیاباران کرد، ئێمە کۆبووینەوەو گوتمان تائێستا بە مەوعیزەو نەسیحەت و خوتبەی مینبەرو ئەمانە دەماندەکرد، بەڵام مادام سەدام چەک بەکاردێنێ، دەبێ ئێمەش ئیعلانی جیهاد بکەین و چەک بەکاربێنین، کە ئیعلانی جیهادمان کرد، ئەوکاتە یەکگرتوو ئەوشتانە نەبوون، دوایی پەیدابوون، هەڵبەت بە ئیعاز پەیدابوون، ئەوکاتەی ئێمە ئیعلانی جیهادمان کرد، لەو سۆنگەیەوەبوو کەوا مەعقول نییە، حیزبەکان و کورد لە شەڕدا بن و ئێمەش لێرە بۆ خۆمان دانیشین، بۆچی کابرا بەناوی حیزبێکی قەومییەوە بچێ خۆی بە کوشت بدا ئێمە بۆ بەناوی ئیسلامییەوە نەیکەین، ئیسلام ئەمرمان پێ دەکا کە ئێمە دەبێ نەتەوەکەمان رزگار بکەین و پارێزگاری لە دینەکەمان بکەین، چەکمان هەڵگرت و خۆمانمان رێکخست، ئیتر لە دواییدا لە هەموو لایەکەوە روومان تێکرا بەبێ تەنزیم، لە دهۆکەوە، لە رانیەوە، لە گەرمیانەوە لەملاولەولا، ئیتر هەر کەس بە خەیاڵێ هاتە ناوی و قەرەباڵغیەکە زۆر زۆر بوو.

**ئەو خەڵکە کەوا رووی تێدەکردن، ئاوەها زۆردەبوون، ئێوە کە مەسئولی یەکەمی ناو بزووتنەوەبوون، بۆ بەرنامەیەکتان دانەنا تاپلانێکتان هەبێ بۆ ئەو خەڵکەی کە دێن تەنزیمی بکەن، نەک ئاوەها بێ سەروبەر بێ؟**

- وەڵلا ئیتر لای خۆی دامانابوو، مەنهەجمان داناو بەپێی مەنهەج و تەنزیم خەڵکمان دانا، بەڵام ئەی پارتی چەند حیزبی لێ جیابۆتەوە، ئەی بۆ پارتی هێشتی ئەو خەڵکەی لێ جیابێتەوەو بەرامبەری بوەستێ!؟

**جیابوونەوە تەبیعییە، بەڵام توندڕەونەبوون، کەچی ئەوانەی لە ئێوە جیابوونەوە زۆریان توندڕەو دەرچوون...**

- چۆن ئەوان توندڕەونەبوون، کوڕە بابە من خۆم لەناو پێشمەرگەدابووم، لەناو پارتی پێشمەرگە هەزار جوێنی بە هەندێک سەرکردەی خۆی دەگوت، لەناو یەکێتیش هەزار جنێویان بە مام جەلال و باوکی مام جەلال داوە کە ئەو وەختە دەیانگوت باوکی وا لە کەرکوکە، بۆچی باوکی ئێمە لەسەر ئێمە دەگیرێ، بۆچی باوکی ئەو ناگیرێ، هەزار قسەی وا دەکرا..

**ئەوانە قسەن، بەڵام ئەوانەی ئێوە بە کردەوە دەچوون ئیشی خراپیان دەکرد...**

- بۆ ئێستا لەوێ شتی خراپ ناکرێ، بۆ نموونە ئەو شتانەی لەناو ئەوان دەکرێ، عەقیدەم وایە نەمام جەلال پێی رازییە، نە کاک مەسعود پێی رازیە، دەشکرێ.

**هێزی دووی سۆران کێ دروستیکرد؟**

- هێزی دووی سۆران لە وەختی خۆی لە هەولێر دروستکراو لە هەولێر بوون، بەڵام دوایی لەگەڵ پارتی ڕێک نەبوون، هێناومانەوە بۆ ئێرە، بۆ ئەوەی بۆ خۆیان دابنیشن، بەڵام دیارە لەژێرەوە ئیتجهات و کرم لەناویاندا هەبوو، تەوجیهاتی خۆیان هەبوو، هی ئێمەیان قبوڵ نەدەکرد.

**کە ئێوە لەگەڵ ڕاپەڕینی ئیسلامی فکرەی یەکگرتنەوەتان هەبوو، فکرەکە لەلایەن دەرەوەبوو تەوجیه کرا کە ئێوە دوو حیزبی ئیسلامین یەکگرن، یان خۆتان فیکرەکەتان لەناودا دروست بوو؟**

- نەوەڵڵا خۆمان هەمان بوو، ئێمە چووین بۆ لیبیا کۆنگرەیەکی

گشتی جیهانی ئیسلامی لەوێ بەسترا، من دەعوەت کرابووم، بەڵام گوتیان وەفدێک لەگەڵ خۆت بێنە، منیش ئەوکاتە نزیکەی ١٠-١٢ کەسم لەگەڵ خۆم برد، مەلا ئەحمەدی کاکە مەحمود بوو، عەلی باپیر بوو، ٣-٤کەسی دیکەش بوون، ئیتر کە چووین هەڵبەت ئێمەیان دەناسی، لەولاو لەملاوە خەڵکێک هاتبوون، لە سودان و لە میسرەوەو لە ئەوروپاو ناوەندەکانی ئیسلامی و لە سوریاو لوبنان و ئەمانە دوایش هەر لە سوریا میوانی موفتی سوریا بووین، بەڕاستی هەمووبان سەرزەنشتی ئێمەیان دەکرد کە ئێوە ئەساسن و برا گەورەن بۆ بزووتنەوەکانی ئیسلامی و دەبێ ئێوە ئەمانە هەموو کۆبکەنەوەو بیانخەنە ژێر باڵی خۆتان و باجیاوازی نەبێت، ئێمەش گوتمان ئینشاءالله. هاتینەوە بەیانێکمان نووسی و داوامان لە هەموویان کرد بابێن یەکبگرین.

**داواتان لە کێ و کێ کرد؟**

- لە یەکگرتوو لە هەموو ئەوانەی بەناوی ئیسلامیەوە کاردەکەن، گوتمان، هیچ پێویست نییە، بایەکبگرین جەماعەتی مەلا سەدیقی برام گوتیان ئێمە ئامادەین، لیژنەی هاوبەشمان دانا بۆ نێوانی خۆمان و راپەڕین و لیژنەکان کەوتنە وتوێژو ئەوکاتە زۆر کەس نارازی بوون هەتا مەلا عەلی باپیرو دلشاد کەلاری و ئەمانە نارازی بوون بۆ یەکگرتنەکە، هەندێکی دیکە دەیانگوت ئەوان لاوازبوونە. دەیانەوێ بەئێوە راست بنەوە، مەیکەن، بەڵام ئێمە بەتایبەتی من خۆم بەتاوانبار دەزانم، چونکە هەوڵم بۆ یەکگرتنەکەدا، بەخوا تەنها لەبەر ئەوەیش بوو کە یەکگرتن بێ، چونکە ئێمە خۆمان دەمانزانی نیەتی خراپمان نییە، هەڵبەت ئەندامی ئێمە هەبوون نارازی بوون، ئەندامی ئەوانیش هەبوون

نارازی بوون، دوایی زۆربەی دەنگ لەسەر ئەو رایە بوون بیکەین و هەندێ موسڵمانانی دیکەش حەزیان لێ بوو، کردیان، کە کردمان، زۆری پێنەچوو، ئەوانەی موعاریزبوون لای ئێمەو ئەوانەی موعاریزبوون لای ئەوان یەکیان گرت.

**ئێوە لە ئایاری ۲۰۰۰ یەکتان گرت، لە ئابی ۲۰۰۰ کۆنگرەتان بەست، ئەو کۆنگرە بووە هۆی لێکهەڵوەشانەوەی بزووتنەوەی یەکبوون، واتە تەکەتولێک دروست بوو لە بەینی عەلی باپیرو مامۆستا سەدیق، تۆ دەڵێی عەلی باپیر دژی یەکگرتنەکە بوو، کەچی ئەو لەژێرەوە لەگەڵ راپەڕین یەکیگرت لە بەرامبەر ئێوە، جەنابت یەک لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی کەچی ئێوە لە کۆنگرە دۆڕاندتان، تۆ دانرایەوە وەکو رابەرو ۳ کەسیش سەر بە جەنابت دەرچوون ئەوانی دی هەمووی سەر بە عەلی باپیر بوون، بۆچی؟**

- نا، سێ کەس نەبوون، ئاخر هی ئێمە یەکێ لەوانە خۆی سەرۆکی لیژنەکە بوو، پیلانیان بۆ داناو، دەرنەچوو، ئەوان دیارە هەر لە پێشترەوە تەختیتێکیان هەبوو، کە باسی مەسەلەیەک دەکرا، بۆ نموونە ئەوان مێزەرلارکردنەوەیان بووبووە ئیشارەتدانی خۆیان، واتا کەمێزەریان لارکردەوە واتە رەئی بدەن، ئێمە ئەوانەمان نەدەزانی، وامان دەزانی ئەوە ئیسلامەتیەو پاکی و راستیەو ئەوانەمان نەکردبوو، دەمانویست بەراستی و بەراشکاوی بیکەین، منیش بۆیە قبوڵم نەکردن، ئێران هەوڵیدا، خۆیان هەوڵیاندا، هاتن بۆ لای من، چەند جار عەلی باپیرو جەماعەت هاتن گوتیان تکات لێدەکەین، چی دەڵێن ئێمە بۆت دەکەین، گوتم ئاخر بێ شەرعیە، ئێوە بە تەکەتولات کردووتانە، بە شەرعی نەتانکردووە، من قبوڵی ناکەم.

**مـامۆسـتـا كۆنگرەتان كـرد، خۆی كـە كـۆنگرە زۆربەی ئەندامـانی دەنگيـاندا دەبێ مـولزەم بی بە كـۆنگرە، لە هەمـوو حـيـزبێـك وايە، جەنابت بەبێ هەڵبژاردن بەرابەر دانرايەوە ركابەرت نەبوو، بەڵام پابەند نەبووی بە بڕيارەكانی كۆنگرە،(دەڵێن ئەگەر جەنابت) بەو بڕيارانەوە پابەند بای ئەو يەكـبـوونە هەڵنەدەوەشـاوە، بەڵام تۆ ئەو بڕيارانەت رەتكردەوە كە لە كۆنگرە دەرچوون، بۆيەش عەلی باپيرو ئەوانی دی لە بزووتنەوە دەرچوون...**

- نا، ئەوانە پێـشـتـر جـيـابوون، بۆشم دەركـەوت ئەوە بە دەسـتـێكی بێگانەكـرا، بۆيە بەبێ شـەرعـيم زانی، چونكە ئێـمـە كـە لەسـەرەتاوە بەيعەتمان بە مامۆستا مەلا عـوسمان‌دا لەسەر ئەو نەساسەی چەندە ئەو مـيللەتە سـەر بەرزبێ، ئێـمـەش سـەر بەرزين، چەندەش سـەرشـۆڕ بێ، ئەوەندەش سەرشۆڕ دەبين، هەرچی پێغەمبەرانيش هاتوون هەمووی بە (ياقومی ياقـومی) هاتوون، ئێمەش پێمان وابوو ئەم نەتەوەی خۆمان ڕێكبخەين و هۆشاربيەكی ئيسلامی، كوردايەتی راست بچێتە مێشكی خەڵكەوە، بەڵام لای ئێـمـە ئەو دوو شتـە نەمـا، نە نەتەوەيی تێدامـا، چونكە شەڕی ناوخۆ كە دروستـبوو ئێمە پێی رازی نەبووين، لەلايەنی دينيش لای ئێـمـە هەبوو زۆر زوڵمی لە خـەڵـك دەكـرد، هەتا كـەسی نزيكی منيان گرتووەو ئەزيەت داوە، هەتا ببێتە دوژمنی من.

**زۆر رەخنەت لێنەدەگـيـرا لەلايەن ئەندامـانی شـورا، كـە تۆ بڕيار دەردەكەی هيچ پرس بە ئەندامانی شورا نەكەی؟**

- قەت شتی وا نەبووە.

**مەبەستم سەردەمی يەكبوونە؟**

- هەر هيچ وەخـتێـك وانەبووە، هەتا من كـاغـەزم نووسـيوە بۆ كـاك

مەسعود یان بۆ مام جەلال پێم نیشانداون ئەوە ئەو کاغەزە ئاوا دەنێرم، قەت کەسی وەکو من نەبووە تەنازول بکات، بەڵام دەمزانی ئەوان بە تەکەتول ئەوە دەکەن بۆ نموونە وەختێک دەیانگوت فلان لابەن، کەمن لام دەبرد، هەموویان دەچوونە لای، ئێ منیش ئەوەم قبوڵ نەدەکرد.

**ئەوان وا باس دەکەن کە تۆ لە هیچ بڕیارێک نەدەگەڕایەوە بۆ شوراو مەکتەبی سیاسی، زۆر شتت کرد لەگەڵ ئەحزابەکان و پرسێکت پێیان نەکردووە.**

– قەت شتی وانەبووە، یەکەم ڕێککەوتنمان لەگەڵ پارتی ئیمزاکردووە لە ڕاژان، دووەم ڕێککەوتنمان لە یاخسەمەرە، لە مەقەرەکەی مام جەلال بوو، ئینجا چەند ڕێککەوتنێکمان کردووە لەگەڵ ئێران لەگەڵ ئەحزابەکان، زۆربەی من ئیمزام کردووە، بەڵام بە ئیجماعی هەموویان داوایانکردووە کە من چووم. بەڵام کە مام جەلال زۆر زیاد لە ڕادە ریزی ئێمەی دەگرت، کاک مەسعود هەروا، بێگومان هەندێ کەس ئەو ڕەسیدەیان نەبوو، بۆیە پێیان ناخۆشبوو، کە بۆچی ئەو پیاوانە وا ڕێزیان لێدەگیرێ.

**واتە تۆ دەتزانی جەماعەتی عەلی باپیر جیادەبنەوە دوای ئەوەی لە دوای کۆنگرە تۆ هەڵوێستت وەرگرت، کە دەتزانی ئەوان دەڕۆن، نەدەکرا مرونەتێک بنوێنی، بۆ ئەوەی لە ناو بزووتنەوەی یەکبوون بیاناو پارچە پارچە نەبان؟**

– مرونەتمان نواندو جەماعەت ڕۆیشتن و جەماعەتی مەلا عەلی باپیریان دەعوەتکردو زۆر بەڕێزەوەو با ئەمە نەبێ و با ئەوە نەبێ، بەڵام لە هەمانکات ئەوان بەناوی میوانییەوە چوونە مەڵبەندی سلێمانی و مەڵبەندەکەیان داگیرکرد، خەڵکی ئێمەش هاتن کۆبوونەوەو بچن بەشەڕ

بیسەننەوە، گوتم بابە «دیاربوو پەنجەی خەڵکی تیابوو» ئێستا ئێمە بڕۆین لە بەرچاوی ئەو عالەمە خەڵک بکوژین، بۆ خاتری خوا نابێ، نەمانهێشت.

**جیابوونەوەی مەلا کرێکار لەسەر چی بوو، چونکە ئەو لەگەڵ عەلی باپیردا یەکینەدەگرتەوە؟**

- لەگەڵ ئەو یەکینەدەگرتەوە، بەڵام لەگەڵ ئێمەش ڕێک نەدەکەوت.

**ئەو دەیویست چی بکا؟**

- وەڵڵا هەر کەسەو ئیتر خەیاڵێکی هەبوو.

**راستە کۆمەڵ ئێستا بنکەکانی فراوانترە لە بزووتنەوە؟**

- کۆمەڵ پارەی زۆرو زەبەنایان هەیە، ئێمەش ئابلۆقەی ئابوورییان خستوینەتەسەر، ئێمە ئەفرادمان زۆر زۆرە، لە هەموو شوێنەکان، ئێستا ٣٠٠-٤٠٠ قوتابیمان لە زانکۆدا هەیە.

**ئەوانیش دەڵێن خانووی تەلەفزیۆنمان بەکرێ گرتووە؟**

- بەڵام پارەیان هەیەو مام جەلال پارەی باشیان دەداتێ، لەبەر ئەوە پارەیان لێنەبڕاوە، ئێمە تەقریبەن ٣ ساڵە تائێستا یەک فلسی هیچ لایەکمان بۆ نەهاتووە، ئەوە دیارە خەلیج ئەمریکا بەسەر زاڵە کەس ناتوانێ دینارێک بۆ کەسێک بنێرێ، ئینجا حکومەتەکانی ئێرەش ئابلۆقەی ئابووریان لەسەر داناوین چەند جار پێیان دەڵێین، دەڵێن قوربان وەڵڵا راست دەکەی حەقی خۆتانەو کەچی هیچیش نییە.

**ئەی بەچی دەژین؟**

- وەڵڵا هەروا، ژیان نییە، ئێمە ناتوانین ئێستا مەسەلەن خانوویەک بگرین بۆ بارەگایەک، ئەوە دیارە ئێوەش، ئێوە بە ئیعتیباری هەولێر، بارەگایەکەتان داگیرکردین، کە ئێمە بەخوێن گرتوومانە، چەند

پێشمەرگەی تیا شەهید بووە، یەکەمجار عەبدولموهەیمەن ویستی داگیری بکا، کاک مەسعود تووڕە بوو، قسەشی پێ وت گوتی هی خۆیانە تۆ چۆن شتی وا دەکەی.

**ئێوە بۆچی لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٥/١/٣٠ بەشداریتان نەکرد؟**

- وەڵڵا فریانەکەوتین.

**لەبەر کێشەی ناوەخۆتان فریانەکەوتن؟**

- ناوەڵڵا ئەویش هەر مەسەلەی حیللەتی بێبەرگییە هەتیو مەیلی هەتاو دەکا، مەسەلە بێپارەیی بوو، لەسەرەتاوە داوای ٦-٧ هەزار دەکرا ١٥-٢٠ هەزار دۆلاریشی بۆ پروپاگەندە دەویست، تاقەتی ئەوەشمان نەبوو، بەڕاستی ئەوەی کە ئێمە کردوومانە چەکمان هەڵگرتووەو شەهیدمان داوە، بۆ ئەوە نەبوو کە ببینە وەزیرو گزیرو ئەوانە، کە لەگەڵ پارتی و یەکێتی بەشداری حکومەتمان کرد، لەسەر تەکلیفی ئەوان بووە، هەتا وەختێ کاک مەسعود گوتی وەزیرتان دیاری بکەن، گوتم دەی با فازیل میرانی وەزیری ئێمە بێ، پیاوەکی باشەو ڕێکوپێکەو قبولمانە، گوتی بۆچی؟ گوتم وەڵڵا ئەگەر فازیل بێ ئیشمان بۆ دەکاو لای تۆش قسەی دەڕوا، بەڵام ئەگەر هی خۆمان بێ نە قسەی دەڕواو نە هیچیشی پێ دەکرێ، لێرە لەگەڵ مام جەلال کە دانیشتین بۆ ئەو مەسەلەیە، من زۆرم هەوڵدا گوتم کاکە ئەوە شێخ محەمەد شاکەلی وەزیری ئەوقافە، من ئەوم دەوێ کەسم ناوێ، لەگەڵ عیماد ئەحمەد، من ئەو دوو وەزیرە دادەنێم، گوتی وەڵڵا فێڵمان لێ دەکەی، نابێ دەبێ وەزیری خۆتان دابنێن. هی ئەوانمان دانابا باشتربوو، ئەوانی خۆمانمان دانا هەر خۆیان دەوڵەمەندکردو هیچیان بۆ ئێمە نەکرد، دوایش لایان بردن.

**ئێستا جەنابت لە هەڵەبجە دانیشتوویت، واتە مەڵبەندی سەرەکی بزووتنەوە لە هەڵەبجەیە، هەستناکەی هەڵەبجە دوورە لە پاریزگاکان، پێویستە لە پایتەخت بای، یان شوێنێکی نزیک بای، لێرە گۆشەگیرییەک نییە؟**

– ئێمە ئەوەی کە کردوومانە دوو ئامانجمان هەبووە، ئامانجێکی ئیسلامی و ئامانجێکی کوردایەتیمان هەبووە، ئامانجە کوردایەتیەکە هاتۆتە پێش، ئەوە ئێستا سەرۆکی هەرێم هەیە، مام جەلالمان لێ بوو بە سەرۆک کۆمارو پێشتر خواخوامان بوو پۆلیسێک مەرحەبامان بکا، ئێستا لەگەڵ بۆش دادەنیشن، ئیتر کە ئەوان حکومەتن بە هەموو شتێ راسپێردراون، ئێمە ئیشمان نییە بەو نەوعە شتانە، نەوەڵڵا نە بە ئینتیخابات و نە بەهیچ شتێ دیکە.

**کە عەلی باپیر لە بزووتنەوە جیابۆوە گوتت دەستێکی تێدابوو، دەستەکە هەندێک بۆ ئێرانی رادەکێشن؟**

– وەڵڵا دەستی زۆرکەسی تێدابووە، عێراقی تێدابوو بە ئاشکرا، ئەوە خۆیان زەلامیان گیراوەو شایەتیان داوە، دەستی عێراقی بەجدی تێدابووە، بەهێزو پارەش و بە هەموو شتێک، ئێرانیش حەزیان بە ئێمە نەدەکرد، چونکە ئێمە قسەی راشکاوانەمان دەکرد، هەتا لە ناحیەی مەزهەب، لەلای وەزیری ئیتلاعات دانیشتبووم، تەلەفزیۆنەکە باسی (فاطمە زهرا)و ئەوانەی دەکرد، گوتم بابە ئەو درۆو دەلەسەیە چییە بیکوژێننەوە، لایبەن، پێمکوژاندنەوە، فاطمە زهرای چی و شەهیدی چی!!

**ئێستا لەگەڵ یەکگرتوو پەیوەندیتان چۆنە؟**

- وەڵڵا دۆستین و مەرحەباییمان هەیە.

**باش وەکو هەر حیزبێکی دیکە، یان زیاتر؟**

- هەروەکو حیزبێکی دیکە.

**ئەی لەگەڵ مەلا کرێکار کە ئێستا لە دەرەوەیە، پەیوەندیتان هەیە؟**

- ناوەڵڵا هیچمان نییە.

**ئەی عەلی باپیر لە سجن بەربوو سەردانیتان کرد؟**

- نەوەڵڵا، بەڵام برادەرانمان ناردو چوونە سەردانی، بەڵام ئەوهات و چووە زیارەتی قەبری کاکەم عوسمان و ئیتر هەندێ قسەی باشی کردو منیش زۆر بەخێرهاتنم کردو پێشم گوت کەوا نیوەڕۆ لێرەبە، وتی وەڵڵا مەوعیدمان هەیە لە سلێمانی لەبەر ئەوەش ئێستا هاتم گوتم نەوەکو جارێکی دیکە بۆم رێک نەکەوێتەوە، لەو ماوەش کۆبوونەوەیەکی حیزبەکان بوو لە سلێمانی، لەوێ دیم، راستی ئەوهات بۆ لای من و مەرحەبای یەکترمان کرد. ناخۆشیەکمان لەگەڵ یەک نییە.

**مامۆستا سدیق کە لەگەڵ عەلی باپیر لە تەکەتولاتەکە دابوون، بۆ دوایی دانیشت؟**

- بۆ خۆی دانیشتووەو نەخۆشە.

**ئێوە بڕواتان بە موخابەراتی ئیسلامی هەیە؟**

- هەڵبەت باوەڕمان بە هەرچی شتێکە کە ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامی کردوویەتی، ئەی دەوڵەتی ئیسلامی نابێ بزانێ ئەو خەڵکە چی دەکاو چی ناکا، بەڵام نەک موخابەراتی وەکو ئەوانەی ئێستا کە ئۆتۆمبێل دەتەقێننەودو خەڵک دەکوژن، من بە نووسینیش نووسیومەو بەیانم دەرکردووە، کە ئەو کردەوانە هەمووی لە ئیسلام بە دوورە.

**ئێوە قەناعەتتان بەوە هەیە ئیمپراتۆریەتێکی وەکو سەردەمی**

**عەبباسیەکان و عوسمانیەکان دروست بێتەوە؟**

- ئەی بۆ ئەمریکای سەگباب هەزار ویلایەتی هەبێ، ئەی بۆ ئیسلام دەوڵەتی نەبێ، ئێستا ئەمریکا دەیەوێ هەتا لەگەڵ ئەورووپاش ببن بەیەک، بەڵام دەیەوێ دوومالْ، بەیەکەوە لە وڵاتی خۆمان قسە بەیەکەوە نەکەن، ئێستا ئەمریکا نایەڵێ ئەم ئیدارەیە ببن بەیەک ئەوە کاک مەسعود مام جەلال هەر کەس حەقی خۆی وەرگرتووە، وەڵڵاهی ئەو کافرە نایەڵێ ببن بەیەک، ئەی باشە بۆ ویلایەتی یەکگرتووی ئەمریکی ببێ، بۆچی ویلایەتی ئیسلامی نەبێ، ئێمەش وەختی خۆی نووسیمان کە ئیپراتۆریەتی دەوڵەتی ئیسلامی ببێ و کوردستانیش بەشێک بێ لە جیهانی ئیسلامی، نەک لە جیهانی عەرەبی.

**رات لەسەر ئوسامە بن لادن چییە؟**

- کورە ئەوە شێتە، من بەشێتی دەزانم، ئەسلەن من رقم لەوانەیە، بەڵام رەبانیم خۆش دەویست، وەختی خۆی من چوومەتە مالْیان، ئەحمەد شا مەسعود هات بۆ لام لە پاکستان لە پێشهاوەر مالْی بورهانەدین رەبانی لەوێ بوو، دەعوەتی کردین چووین بۆ ئەوێ، کۆنگرەیەک لەوێ هەبوو هی جەماعەی ئیسلامی، دەعوەتیان کردین، بەتایبەتی چووین، لەوێش چووینە لای ئەفغانییەکان، ئەوانەی لە پێشهاوەردا بوون وەکو بورهانەدین رەبانی و ئەوانی تر، بورهانەدین دوو سێ جاری دی لە ئێران دیبوومان، پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو، دوایی کە تالیبان پەیدابوو بەڕاستی من رقم لە کردوەیان دەبووەوە، ئەو وەختەی حکومەت بوون، لە خەلیج جارێکیان لەگەڵ سەفیرەکەیان تێکچووم، گوتم سەنەدت دەدەمێ کە ئێوە نامێنن، گوتی بەچی دەزانی، وەڵڵاهی ئێمە ئەورووپاش داگیر دەکەین، گوتم وەڵڵاهی هەر لە

نێستەوە ئەگەر تا دوو ساڵی دیکە ئێوە لە نەخشەدامان، من باڵێکی خۆم دەبڕم، وەڵڵا هی نەگەییە ساڵێک نەمان.

**دەڵێی بن لادن شێتە؟ ئەی رات لەسەر مەلا کرێکار چییە؟**

- وەڵڵا ئەویش شێتێکە، هاتووە لێرە حیکمەتیار چ کلاوێکی دەکردە سەری، ئەویش وا خۆی نیشاندەدا، پیاوێکی زیرەکە، خەتیبێکی چاکە، بەڵام زۆر زوو بەمدیو بەودیودا هەڵدەگەڕێتەوە، جارێک مام جەلال دەعوەتی کردبوو، هاتبۆوە دەیگوت لە دنیادا قائیدی وەکو مام جەلال نییە، کەچی پاش بەینێک دەیگوت کافرە، کوڕە بابە نە ئەوهاش و نە ئەوهاش.

**پێتوایە ئێستا مەلا کرێکار هیچ رەبتێکی بە ئەنسارو ئیسلام هەیە؟یان نییە؟**

- وەڵڵایی وابزانم هەر ئەو وەختیش زۆرینەیان مەلا کرێکاریان خۆش نەدەویست و لێی رازی نەبوون، ئەویش لە هەندێکیان رازی نەبوو، دەیگوت زۆر توندڕەون...

**ئێستا ئێوە لە ئێران هیچ پاڵپشتی مادی وەرناگرن؟**

- نەوەڵڵا، ناماندەنێ ئەگینا وەریدەگرین، بەڵام کەس ناماندانێ.

**پێشتر دەیاندا ئێستا بۆ نایدەن؟**

- قەت نەیانداوە، تا لە ئێران بووین، ئەو وەختە ٥ ملیۆن تمەنیان دەدا بە ئێمە، ٣٠ ملیۆن تمەنیان دەدا بە پارتی، ٣٠ ملیۆنیاشیان دەدا بە یەکێتی، ئەوەی باسدەکرا، ئینجا نازانم بەدزی چیدیکەیان دەدانێ، یان نا؟ بەڵام بەخوا هەر ئەو پێنج ملیۆنەیان دەدا ئێمە، پێشمەرگەی ٥ هەزار تمەنمان بۆ بڕیبۆوە، بەخوا کاکە عوسمانیش وەکو پێشمەرگەیەک ٥هەزار تمەنی وەردەگرت.

**مامۆستا ئێوه له هەڵەبجه تا ئەو فەترەیەی شەڕ هات، حاكمی موتلەق بوون، بەڵام هیچیشتان بۆ هەڵەبجه نەكرد..**

- ئاخر بەچی بیكەین؟

**ئێ خۆ كه دەبنه حكومەت دەبێ شتێكیش بكەن..**

- واریداتەكه بەدەستی برایم خەلیلەكەی لای ئێوەبوو كه پیرەژنێک وتبووی ئاخ ئەو برایم خەلیله دەستم بیگاتێ، شەرت بێ بمخنكاندبایه، ئێ كاكه برایم خەلیلەكەی ئێوه نەیدەدا به ئێمه. ئێ ئەولایەش گومرگەكه هەمووهی مام جەلال بوو!

**ئەی حكومەتایەتیان بۆچی بوو لێره؟**

- وەڵڵاهی كاک مەسعود جارێک باسیكرد، كه لەسەر داوای ئەو چووین دیدەنیمان كرد، گوتی مامۆستا پێشمەرگه بنێرن بابەیەكەوه بچن گومرک وەرگرن، گوتم وەڵڵا كاک مەسعود ئێمه گومرک وەرناگرین، گوتی بۆ؟ گوتم حەرامه، گوتی وەڵڵاهی نابن بەهیچ، حەرامی چییه خەڵک هەروا بەخۆرایی دێ و دەڕوات، گوتی ئێمه وەریدەگرین، گوتی دەی پێشمەرگه بنێرن، گوتم وەڵڵا كه ئێمه وەرینەگرین پێشمەرگەش نانێرین، نەماننارد....



ئەم کتێبەی لەبەر دەستتدایە، هەر بەراستی گەردەلوولە و. پێشمەرگە لەناویدا بەچنگەڕنێ خەباتی کردووە بەهۆی ئەم کتێبەوە، دەتوانی تا رادەیەك سەردەمە تاڵ و شیرینەکانی قۆناغی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستانی دەستنیشان بکەیت، دەزانم ئەگەرچی هەندێك لەو رووداوانە ئازارێکی شیرینن و مقاوەمەت و گیانفیدایی ئەم کوردە دەردەبڕن، بەڵام بەداخێکی برژاوەوە زۆر رووداوی تاڵیش هەن، کە ئەمرۆ پێویستە هەموویان وەکو خۆیان بخوێنینەوە.

راستە زۆر کۆنە برین دەخاتەوە بەرچاوی خوێنەران، بەڵام کاتی ئەوەش هاتووە بەدڵێکی گەرم و بە مێشکێکی ساردەوە، هەموو ئەو رووداو و بەسەرهاتانە بخوێنینەوەو پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرین.

ناکرێ ئەزموونی خەباتی میللەتەکەمان نەزانین و بەبێ شارەزایی بوونیشمان لەو قۆناغە گرنگەی بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیمان، ناتوانین لە مقاوەمەت و هاوکات دووبەرەکی ئەم قۆناغە بەتایبەتی و دووبەرەکی کورد بە گشتی شارەزابین، بێگومان بەبێ ئەو شارەزایی بوونەشمان و دەرس وەرگرتنمان ناتوانین بەزانایی بەرنامەی میللیانەو کوردانە بۆ ئەمرۆ و سبەی بخەینەکار، دە کەواتە خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەدەست خۆت مەدە، هەر هیچ نەبێ، تا شارەزای زۆر کێشمە کێشمی ئەم گەلە ستەمدیدەی خۆت بیت و جارێکی دیکە ئەزموونی تاڵ نەچێژین.

